# جذبه‌عشق

**دیوانی**
**حضرت مولانا شیخ عبدالرحمن القادری الطالبانی**
**«خالص»**

**با شرح و ترجمه کوردی**

**با مقدمه**
**دکتر نوری طالبانی**

کتێب: دیوانی (جەزبەی عیشق)، دیوانی شیعری حەزرەتی مەولانا شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی قادری (خالص)
پێشەکی: د. نووری تاڵەبانی
وەرگێڕان لە فارسی و تورکییەوە بۆ کوردی: ئەنوەر سوڵتانی
داڕشتن و بەراورد و ساغکردنەوە و شەرحی عیرفانی: د. محەمەد عەلی سوڵتانی
پیتچن: لەیلا جەعفەری
هەڵەبڕ: محەمەد مەجد
بەرگ: محەمەد زادە
لەبڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی (٢٧٤)
نەخشەسازیی ناوەوە: ئارەش ئەمجەدی و رزگار موحسین و دکتۆر ئەحمەدی محەممەد پوور
سەرپەرشتی هونەری چاپ: عوسمان پیرداود
ژمارەی چاپکراو: ٢٠٠٠ دانە
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(    )ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە

وەرگێڕانی ئەم دیوانە لە سەر بنەمای دوا چاپ و بەشی (کتابولمەعاریف) ئەنجامدراوە، کە لەگەڵ دەقی دەستنووسی کەشکۆڵی (سیامەنسووری) بەراوردکراوە.

# پێشەکی

شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی، زانا و عارف و شاعیری گەورەی کورد، تا ئێستا لە کۆڕی ئەدەب و شیعری کوردی مافی خۆی نەدراوەتێ. زانای گەورەی کورد "سیبغەتوڵـڵای سەنەندەجی"، کە چووەتە کەرکووک و لە نزیکەوە شارەزای ڕەوشتی بەرزی ئەم زاتە گەورەیە بووە، نووسیویەتی: «قوتبی زەمان و زیندووکەرەوەی سوننەتی پێغەمبەر و شەریعەتەکەی و نوێکەرەوەی ڕێبازی قادری و خزمەتکاری هەژاران و دۆستی غەریبانە». سەبارەت بە ڕەفتاری موریدەکانی نووسیویەتی: « بەچاوی کراوەوە تەماشای ڕەفتاری موریدەکانیم دەکرد، بۆم دەرکەوت لەناو دەریای شەریعەتدا خەریکی خوداپەرستین».[1] زانای نەمری کورد "تەوفیق وەهبی"، شێخ عبدوڕەحمانی وەکو فەیلەسووفێکی گەورە تەماشا دەکرد.[2] مامۆستا و زانای گەورە "مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس" لەبارەی شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی نووسیویەتی: «ئەدیب و نووسەرێکی تاقانە بووە لە باخی ئەسفیادا، مامۆستایەکی زانا و بە توانا بووە لەناو مامۆستایاندا، مورشیدێکی هەڵکەوتوو بووە لەناو کۆڕی مورشیدەکاندا».[3] شاعیری شۆڕشگێڕی کورد "حاجی قادری کۆیی"، کە هەموو ئاگاداری هەڵوێستی دژایەتیی ئەوین بەرانبەر بە شێخ و شێخایەتی و تەکیە و خانەقاکانیان، کە باسی شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی دەکات، بە **"غەوثی ثانی"** ناوی دەبات و لە سەخاوەتدا بە "حاتەمی مەزهەب" وەسفی دەکات. لە پارچە شیعرێکی کە تێیدا باس لە چەند شێخ و زانایەکی گەورەی کورد دەکات، شێخ

---

١ . دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی، «الشیخ عبدالرحمن الطالبانی، العالم المتصوف و شاعر العشق الالهی ومرشد الطریقه القادریه الطالبانیه»، الجزء الاول، الطبعه الاولی، مطبعه «خاک»، السلیمانیه، **٢٠٠٣**، ڵ**٧**.

٢ . لە ساڵی **١٩٧٤/ ١٩٧٥** دا بە ئەرکێکی زانستی لە (لەندەن) بووم و دیدەنیی زانای گەورەی کورد مامۆستا «تۆفیق وەهبی بەگ»م دەکرد. جارێکیان باسی شیعرەکانی شێخ عەبدوڕەحمانی دەکرد و گوتی: «لە ساڵی **١٩٥١** باوکت دیوانی تازە چاپکراوی شێخ عەبدوڕەحمانی بۆ ناردم. بەشێک لە شیعرەکانی ئەوەندە قووڵن لێیان تێنەدەگەیشتم» و چەند نموونەیەکی بۆ هێنامەوە. ئەو زانا گەورەیە شێخ عەبدوڕەحمانی وەکو فەیلەسووفێکی گەورە تەماشا دەکرد. (دکتۆر نووری تاڵەبانی، «شێخانی ئیرشادی تاڵەبانی و چەند ناودارێکی تری ئەم بنەماڵەیە»، چاپی دووەم، چاپخانەی«خاک»، هەولێر، ساڵی **٢٠٠٣**، ڵ **٣٥**). هەروەها وەرگێڕاوی هەمان نامیلکەیە: «شیوخ الارشاد الدینی فی الاسره الطالبانیه»، کەمال غەمبار لە کوردییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، چاپی یەکەم، لە بـڵاوکراوەی«خانەی ئەربیل»، چاپخانەی حاجی هاشم، ساڵی **٢٠١٢**، ڵ **١٧**.

٣ . مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بنەماڵەی زانیاران، چاپخانەی شەفیق، بەغدا **١٩٨٤**، ڵ **٥٧٦**.

عەبدوڕەحمانی ناو بردووە بە:

**غەوثی ثانی** و حاتەمی مەزهەب         عەبدوڕەحمانی **خالصی** مەشرەب

ئەم ڕێزگرتنەی حاجی قادری کۆیی لە شێخ عەبدوڕەحمان بێهۆ نەبووە، چونکە لە نزیکەوە ناسیویەتی و زانیویەتی لە کردەوەی ئەو شێخانە بەدوور بووە، کە ئەو لە شیعرەکانیدا دایشۆردوون. ئەم شاعیرە بلیمەتە چاونەترسە ماوەیەک فەقێی (موستەعید) بووە لە خوێندگاکەی تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک و لە لای شێخ عەبدوڕەحمان، لەگەڵ شێخ رەزای کوڕی ماوەیەک پێکەوە خوێندوویانە.[1]

چەند ئەدیب و نووسەرێکی ناوداری تورک، شێخ عەبدوڕەحمانیان بە ناودارترین شێخی تەسەووفی سەدەی نۆزدەیەم ناو بردووە. نووسەر و ئەدیب **"عەبدولباقی گولپینارلی"** لە کتێبێکی، کە لێکۆڵینەوەیە لەبارەی شیعرەکانی شاعیری ئازەری **"فضولی"**، شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانیی بە ناودارترین شێخی تەسەووفی سەدەی نۆزدەم پێناسە کردووە. زانا و ئەکادیمیستی ناوداری تورک: "دکتۆر فوئاد کۆپرلۆ"، لە "ئینسیکلۆپیدیای ئیسلامی" باسێکی لەبارەی شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی نووسیوە، تێیدا بە یەکێک لە گەورە شێخانی تەسووفی سەردەمی خۆی ناوی بردووە.[2]

شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی، دواتر بە مەولانا شێخ عەبدوڕەحمانی (**خالص**) ناوبانگی دەرکردووە، ئەو نازناوە شیعرییەی لە **"خالصاً لله"** وەرگرتووە.

شێخی **خالص** کوڕی گەورە و جێنشینی شێخ ئەحمەدی تاڵەبانە، ئەویش کوڕی مەلا مەحموودی زەنگەنەی کوڕی ڕۆستەم ئاغای کوڕی یووسف ئاغای "کاکە سووریی" ناوچەی بۆکانە. دایکی کچی عەبدوڵـلا بەگی کوڕی میر سمایل خانی زەنگەنەیە، ساڵی ١٢١٢ک (٨ ـ ١٧٩٧ز) لە گوندی "قرخ"ی سەر بە قەزای چەمچەماڵی نزیک بە کەرکووک هاتووەتە دنیاوە. سەرەتا لە خوێندنگای تەکیەکەی خۆیان لەلای باوکی دەستی بە خوێندن کردووە، دواتر بەگوێرەی نەریتی ئەو سەردەمە چووەتە کەرکووک و سلێمانی و چەند ناوچەیەکی دیکەی کوردستان بۆ

---

١ . محەمەدی مەلا کەریم، چەند بابەتێکی ئەدەبی لەبارەی حاجی قادری کۆیی و شێخ رەزای تاڵەبانیەوە، گوڤاری «کاروان»، ژمارە «٩٢»، ساڵی ١٩٩١، ل ٢٥.

٢ . دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨.

تەواوکردنی خوێندنی شەریعەت و فیقە. ماوەیەک لەگەڵ کاک ئەحمەدی شێخ لە سلێمانی پێکەوە لەلای شێخ مارفی نۆدەیی خوێندوویانە، لەو کاتەوە دۆستایەتیەکی رووحی لە نێوانیاندا پەیدابووە و تا هاتووە بەهێزتر بووە. کاتێ کاک ئەحمەدی شێخ لە سەفەری ئەدای حەج دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، لە کەرکووک دەبێتە میوانی شێخ عەبدوڕەحمان.[1] دوا پلەی خوێندنی، لەگەڵ وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی لە بەغدا لەلای زانای گەورەی کورد، مەلا عەبدوڕەحمانی رۆژبەیانی بووە. لەو ماوەیەی لە بەغدا بووە، تەمەنی نۆزدە ساڵ بووە، کتێبی "**بهجـة الاسرار**"ی "شێخ عەلی نوور بەخش"ی، تایبەت بە مەناقیبی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تورکی، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ، کە لەو تەمەنەوە لە هەردوو زمانی عەرەبی و تورکیدا زۆر شارەزا بووە.

لەپاش کۆچکردنی شێخ ئەحمەدی باوکی، شێخ عەبدوڕەحمان لە گوندی "تاڵەبان" دەمێنێتەوە، کە بەرانبەر گوندی "قرخ"ە، خەریکی دەرس وتنەوە دەبێ لە خوێندگاکەی تەکیەکەیان، لەگەڵ ئیرشادکردنی موسڵمانان لەسەر ڕێبازی "قادری". ئەم ڕێبازەی تەسەووفی لە باوک و باپیری بۆ ماوەتەوە، ئەوانیش لە شێخ ئەحمەدی هیندی لاهووری، لە نەوەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و نیشتەجێی "سوورداش" وەریانگرتبوو. لەو ماوەیەدا خەڵکێکی زۆر لەو ناوچەیە و لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان ڕوو دەکەنە تەکیەکەی و ناو و شۆرەتێکی زۆر پەیدا دەکات. لەوە دەچێ، کە کاربەدەستانی ئەمارەتی بابان لەو ناوچەیە ناڕەحەت بووبن لەوەی ئەو هەموو خەڵکە هامشۆیان کردووە، بە تایبەتی کە بەشێکیان گەورە پیاوانی ئایینی و پیاوماقووڵانی ئەو سەردەمە بوون، بۆیە ئەزیەتی موریدەکانیان داوە، ئەویش بەناچاری ڕوو لە شاری کەرکووک دەکات و لەوێ نیشتەجێ دەبێت، بەتایبەتی، کە هەردوو مەرقەدی باوک و باپیری لەو شارە بوون، چونکە کاتی خۆی لەسەر وەسیەتی خۆیان، لە کەنارێکی تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک بەخاک سپێراون.[2]

---

١ . دکتۆر نووری تاڵەبانی، گەشتێک بە جیهانی شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا، گۆڤاری»کاروان»، ژمارە (٧٠)، ساڵی **١٩٨٨**، ل **٢١**. هەروەها «شێخانی ئیرشادی تاڵەبانی و چەند ناودارێکی تری ئەم بنەماڵەیە:، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦، لەگەڵ «**شيوخ الارشاد الديني في الاسرة الطالبانية**»، سەرچاوەی پێشتر، ل**٢٩**.

٢ . تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک لە لایەن مەلا مەحموودی زەنگەنەوە کراوەتەوە. جارێکیان مەلا مەحموود دەچێتە سەردانی موریدەکانی لە کەرکووک و لەوێ نەخۆش دەکەوێت، وەسیەت دەکات، ئەگەر چووە بەر ڕەحمەتی خوا، ئەوا لەوێ بە خاکی بسپێرن، پاش چەند رۆژێک کۆچی دوایی دەکات و موریدەکانی لە کەنارێکی تەکیەکە بە

شێخ عەبدوڕەحمان دەچێتە کەرکووک و لەوێ جێگیر دەبێ و خەڵکێکی زۆر ڕوو لە تەکیەکەی دەکەن، لەو دەمەوە بە"تەکیەی گەورە" ناوبانگی دەرکردووە، لەناو تورکمانەکانی ئەو شارە بە "بیوک تکیە" ناودەبرێت. تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک لەسەر گردێکی بەرز دروستکراوە، لە قەڵای شارەکە بەرزترە و دەکەوێتە بەرانبەر ئەو قەڵایە و نزیکە لە ڕێگای گشتیی تازەی نێوان کەرکووک و سلێمانی. گەڕەکی بەردەمی تەکیە، کە بە (بەرتەکیە) ناسراوە، لەسەردەمی شێخ عەبدوڕەحماندا دروست کراوە، دواتر گەورە کراوەتەوە.

تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک سەرەتا بچووک بووە، بەڵام پاش ئەوەی شێخ عەبدوڕەحمان دەبێتە مورشیدی، گەورە دەکرێت و دواتر بە فەرمانی سوڵتان عەبدولمەجیدی عوسمانی بە شێوەیەکی تازەتر دروست دەکرێتەوە. شاری کەرکووک تا ساڵی ١٨٧٩ مەڵبەندی ویلایەتی شارەزوور بووە، "والی" دەوڵەتی عوسمانی لەو شارە دانیشتووە، کە یەکێکیان بووەتە موریدی شێخ عەبدوڕەحمان، هەروەها خێزانی سوڵتان عەبدولمەجید، کە ناوی "پرتیڤنال" خانم بووە، بە هۆی ئەوانەوە سوڵتان عەبدولمەجید فەرمانی دروستکردنەوەی تەکیەکەی داوە. جگە لەوەش، ئەو خانمە نوسخەیەک لە "شەرحی بوخاری"ی، کە لە مووزەخانەی ئەستەمووڵ بووە، لەگەڵ چەند تاڵێک لە مووی پیرۆزی پێغەمبەر، دروودی خوای لەسەر بێت، بە دیاری بۆ شێخ عەبدوڕەحمانی ناردووە، کە ئێستاش لەو تەکیەدا بەپیرۆزییەوە لە شوێنێکی تایبەتدا هەڵگیراون.[1] تەکیەی تاڵەبانی لەو کاتەوە بووەتە مەڵبەندێکی ئایینی و کۆمەڵایەتیی گەورە لە کەرکووک و هەموو ناوچەکە. مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس سەبارەت بە کەسایەتیی شێخ عەبدوڕەحمان نووسیویەتی: « سەردەمی ئەو سەردەمی زێڕینی هەموو بنەماڵەی تاڵەبانی بووە، چونکە ئەوەندە جیلوەی خودایی بووە، تەکیەکەی بووە بە بنکە بۆ دائیرەی تەکیەی دەروێشان، خوێندگاکەی دەرمانخانەی دڵڕیشان بووە، هۆدەکانی تەکیە مەڵبەندی پیاوان و ناوداران بوون و هەموو جۆرە خوێندەوار و زمانزانێ تێیاندا دانیشتوون و

---

خاکی دەسپێرن. شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی کوڕی ئەویش هەر لەسەر وەسیەتی خۆی هەر لەلای مەرقەدی باوکی بە خاک سپێراوە، دکتۆر نووری تاڵەبانی، سەرچاوەی پێشوو.

١ . لە ڕەسمییاتدا ئێستاش ناوی تەکیەی تاڵەبانی بە «مزگەوتی مەجیدیە» ناودەبرێت، کە ناوی سوڵتان عەبدولمجیدی عوسمانییە، چونکە بە فەرمانی ئەو نۆژەن کراوەتەوە.

وچانیان داوە».[١] لەبارەی ڕەوشتی بەرزی شێخ عەبدوڕەحمان، مامۆستا مودەڕیس نووسیویەتی: « بە مەعنای کەلیمە مەردی مەیدان و شێری ناو مەردان بووە، تاجی سەری ئەولیاکان بووە، لە ناو پیاوە هەڵکەوتووەکانی جیهاندا لە ریزی سەرەوە ناوی نووسراوە».[٢]

لەسەردەمی شێخ عەبدوڕەحماندا بە دەیان تەکیەی ئەو خانەوادەیە لە هەردوو بەشی کوردستانی ئەو دەمە کراونەتەوە، بەتایبەتی لە ناوچەکانی زەهاو و جوانڕۆ و هەورامان و سنە و موکریان و شاری سیواس و ئورفە و چەند شارێکی دیکەی باکوور. لە چەند وڵاتێکی ئیسلامی وەکو عێراق و شام و میسر لقی تەکیەی تاڵەبانی کراونەتەوە.[٣] شێخ محەمەد حیسامودین عومەر، لە کتێبێکدا بەناوی: "الانفاس الرحمانية في السلسلة القادرية الطالبانية" نووسیویەتی: «لەسەردەمی شێخ عەبدوڕەحماندا لە وڵاتانی عێراق و تورکیا و تورکستان و ئەفغانستان ـ شاری (هرات) ـ و هیندستان و حیجاز و میسر و فەلەستین، لەگەڵ بەشی زۆری ناوچەکانی کوردستان تەکیەی تاڵەبانی کراونەتەوە و هەمیشە موریدێکی زۆری تێدا بووە و بە (تەکیەی رەحمانییە) ناوبراون».[٤]

مەولانا شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی زانا و شێخی عیرفان لە مەیدانی تەسەووفدا، شاعیرێکی زۆر گەورە بووە، شیعرەکانی هەر لە بواری عیرفان و عیشقی ئیلاهی و فەلسەفەدان. بەشی زۆری شیعرەکانی بە زمانی فارسی و تورکین، بە زمانی کوردیش "شێوەی هەورامی" شیعری هەیە، بەڵام بەشێکیان فەوتاون و ئەوانەی ماون کۆ نەکراونەتە.

ئەکادیمیای کوردی بە ئەرکی خۆی دەزانێ، کە سەرجەم شیعرەکانی ئەم

---

١ . مەلا عەبدوالکریمی مودەڕیس، سەرچاوەی پێشوو.

٢ . مەلا عەبدوالکریمی مودەڕیس، هەمان سەرچاوە.

٣ . یەکێ لە خەلیفەکانی شێخ عەبدوڕەحمان لە شاری «طنطا»ی میسر ناوی «**العلامة الشيخ عبدالقادر بن محيالدين الأربلي**» بووە، کتێبێکی نووسیوەتەوە لە ژێر ناوی: «**حجة الذاكرين ورد الناكرين**". نووسەری ئەو کتێبە لە سەرەتای کتێبەکەیدا نووسیویەتی: نامەمان بۆ «سيدى ابو على ضياءالدين عبدالرحمن الكركوكى الطالبانى» ناردوە، کە تەکیەیەکمان لەو شارە لەسەر ئەرکی «الحاج محمدامين الثاقب» کردووەتەوە، ئەویش موریدی هەمان خانەوادە بووە. ئەم کتێبە لە ساڵی **١٩٢٤** لە شاری «طنطا» چاپ کراوە، دانەیەکی لە کتێبخانەی تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک هەیە.

٤ . محمد حسامالدين عمر، **الأنفاس الرحمانية في السلسلة القادرية الطالبانية**، چاپخانەی «الشمال»، کەرکووک، ساڵی **١٩٧٧**.

شاعیره گەورەیەی کورد کۆ بکاتەوە و شیعره فارسی و تورکییەکانی وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی، بۆیە داوای لە نووسەر و شارەزا لە زمانەکانی کوردی و فارسی و تورکی مامۆستا " ئەنوەری سوڵتانی" کرد شیعره فارسی و تورکییەکانی وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی. لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێین، کە نزیکەی نیو سەدەیەک لەمەوبەر شیخ عەلی شێخ جەمیلی تاڵەبانی داوای لە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس کردبوو شیعره فارسییەکانی وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی، بەڵام عوزری خواستبوو کە « دەترسێ کەسانی نەزان هەن بەباشی لە شیعرەکانی تێنەگەن و هەردووکیان بە بێ دین لە قەڵەم بدەن»![1]

وەرگێڕانی شیعره عیرفانییەکانی شێخی "خالص" لەو دوو زمانەوە بۆ سەر زمانی کوردی کارێکی ئاسان نییە، ئەو کەسەی ئەو ئەرکە قورسە دەخاتە ئەستۆی خۆی دەبێ زۆر شارەزا بێت لەو دوو زمانە و بتوانێ لێکدانەوەیان بۆ بکات. مامۆستا ئەنوەری سوڵتانی ئەو ئەرکەی قبووڵ کرد، بەڵام داوای لە ئەکادیمیای کوردی کرد چەند کەسێکی شارەزا لە ئەدەب و شیعری عیرفانی بە کارەکەیدا بچنەوە. ئەکادیمیای کوردی داوای لە مامۆستا دکتۆر محەمەد عەلی سوڵتانی کرد بە کارەکانی مامۆستا ئەنوەری سوڵتانیدا بچێتەوە، د. محەمەد عەلی سوڵتانی جگە لە داڕشتن و پێداچوونەوە و ساغکردنەوەی کەمی و کورتییەکانی دیوانەکە، بەراوردی ئەو شیعرانەی کردووە کە شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی دایناون، لەگەڵ سەرچاوەی شیعرەکان لە دیوانی ئەو شاعیرانەی کە لێرەدا ناویان هاتووە، د. محەمەد عەلی سوڵتانی لەو بوارانەدا پسپۆڕە و کارەکەی بە سەرکەوتوویی جێبەجێکردووە. ئەوەی کە جێی خۆشحاڵییە ئەم شێوە شەرح و شیکردنەویە بە یارمەتی و لێکدانەوەی سەرچاوەکان، یەکەم جارە لە کوردستاندا دەکرێ، هیواداریین ببێ بە نموونە بۆ داهاتوو. داوایەکی دیکەی کاک ئەنوەر ئەوە بوو، کە "پێشەکی" و ژیاننامەی شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی بۆ دیوانەکە من بینووسم. ئومێدەوارم ئەم چەند دێڕەی لێرەدا نووسراون لەو ئاستەدابن و شایانی پایەی ئەو زاتە گەورەیە بن. هەروەها ئاکادیمیای کوردی داوای لە چەند شارەزیەکی تریش کردووە بۆ پێداچونەوە بە

---

١ . دکتۆر نووری تاڵەبانی، شێخ عەبدوڕەحمانی «خالص»، زانا و شاعیر و شێخی عیرفان، گوڤاری «باسکار»، ژمارە (٣)، مانگی ئابی/ ١٩٩٨، لەندەن.

وەرگێڕانی شیعرە تورکیەکاندا، کە لێرەدا سوپاسی ئەوانیش دەکەین.

بەشێکی دیکە لە ژیانی مەولانا شێخ عەبدوڕەحمانی "خالص" بریتییە لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ شێخانی ناوداری هەردوو ڕێبازی قادری و نەقشبەندی لە کوردستان لەو سەردەمەی تێیدا ژیاوە. شێخی (خالص) دۆستێکی زۆر نزیکی کاک ئەحمەدی شێخ لە سلێمانی بووە، هەروەها دۆستێکی نزیکی یەکەم خەلیفەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، شێخ عوسمانی سیراجەدینی تەوێڵە بووە. دۆستایەتیی لەگەڵ شێخی سیراجەدین ئەوەندە بەهێز بووە، کە شێخ عومەری کوڕی ناردووە بۆ کەرکووک تاکو لەگەڵ شێخ عەلی کوڕی شێخ عەبدوڕەحمان پێکەوە بخوێنن.[1]

شێخ عەبدوڕەحمان پیاوێکی زۆر سەخی تەبیعەت بووە، هەرچی دەست کەوتووە سەرفی کردووە بۆ هەژاران و میوانەکانی تەکیەکەی. دەگێڕنەوە ئامۆژگاریی موریدەکانی کردووە، کە سامان و پارە کۆنەکەنەوە، ئەوەی پەیدای دەکەن سەرفی بکەن پێش ئەوەی زەکاتی بکەوێتە سەر. هەروەها فەرموویەتی: «نوێژکردن کاری پیرەژنانە، ڕۆژوو گرتن کاری بەخیلانە، حەجکردن گەشتی جیهانە، بەڵام دڵی شکستە بەجێ‌گەیاندن کاری مەردانە»! ئەم فەرموودە فەلسەفییەی بەلای هەندێ کەسەوە ڕەنگ بێ بە لادان لە ئیسلام بدرێتە قەڵەم، بەڵام مەبەستی ئەو پیاوە مەزنە ئەوە بووە، نوێژکردن و ڕۆژوو گرتن، لەگەڵ چوونە حەج کاتێ دەبێتە فەرز، هەموو موسڵمانێک دەبێ بیکەن، بەڵام دڵی شکستە بەجێ‌گەیاندن بە هەموو کەسێک ناکرێت.

شێخ عەبدوڕەحمانی "خالص" بە هەرسێ زمانی کوردی (شێوەی هەورامی) و فارسی و تورکی شیعری هەیە، بە زمانی عەرەبیش شیعری هەبووە، بەڵام کۆنەکراونەتەوە و بەشی زۆریان فەوتاون. بە زمانی کوردی و فارسی لەگەڵ شاعیرانی بە ناوبانگی سەردەمی خۆی، بە تایبەتی لەگەڵ"مەولەوی"، شیعریان بە سەریەکدا وتووە. مەولەوی چەند جارێک سەردانی کەرکووکی کردووە بۆ دیدەنی شێخ عەبدوڕەحمان. جارێکیان شەو درەنگ دەگاتە تەکیە و دەبینێ خەڵک هەموو نووستوون، بەڵام شێخ عەبدوڕەحمان خەریکی شەونوێژ و عیبادەتە. مەولەوی ئەم

---

[1] . دکتۆر نووری تاڵەبانی، گەشتێکی تر بە جیهانی شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا، گۆڤاری «کاروان»، ژمارە ٧٠، ساڵی ١٩٨٨.

بەیتە شیعرەی "بێسارانی" بەسەردا دەخوێنێ:

شەوەن خەڵوەتەن ماڵ بێ ئەغیارەن		عـالەم گرد وتەن دۆست خەوەردارەن

شێخی (خالص) بەم بەیتە شیعرەی وەڵامی دەداتەوە:

ئیـــرادەم ئیـــیـەن وی کلـپۆسەوە		شەو ناڵین وەشەن وەڵای دۆسەوە

لە قەسیدەیەکدا، کە "مەولەوی" بە هۆی چاککردنەوەی تەکیەی تاڵەبانی و فراوانکردنەوەی، ئەم پارچە شیعرەی بە زمانی فارسی وتووە:

**عقـل گفتــا چـــون تفکـــر کرد و ایست**

**دانی این بانی و مبنی چیست و کیست؟**

**در تنـــزل کـــرد جـــلـوه ایـن چنیـن**

**حـــق در آن و عـــرش اعظـــم اندرین**

**هــــر کـــه دانـد سـرّ ایـن راز نهفـت**

**خوش "علی العرش استوی الرحمن" بگفت**

**مبتـــــدا و منتهـــــای هـــر شیئ است**

**"مظهـــر حـــق بـــاد" تـــاریخ وی است**

"مظهـــر حـــق بـــاد" بەپێی پیتی ئەبجەدی دەکـــاتە ساڵی ١٢٦١ی ك، (١٨٤٥ ی ز).

دیوانی شیعری شێخ عەبدوڕەحمان لە سەردەمی شێخ عەلی کوڕی گەورەی لە ساڵی ١٨٩٠ لە ئەستەموول چاپ کراوە، جاری دووەم لە سەردەمی باوکم شێخ جەمیل تاڵەبانی لە ئێران، لە ساڵی ١٩٥٠دا چاپ کراوە، بە سەرپەرشتیی موریدێکی بە ناوی میرزا مەحموود محەمەدی قادری، دانیشتووی شاری "سنە". ساڵی ١٩٩٣ جارێکی تر دیوانەکەی لە لایەن محەمەد سدیقی کوڕی لە ئێران چاپ کراوەتەوە. بەشێک لە شیعرە فارسییەکانی لێکدانەوەن، بەشێکی دیکەیان تەخمیسی شیعری "مثنوی" و "مەغربی" و "حافظ" و "نور علی" و چەند شاعیرێکی تری بەناوبانگی فارسی زمانن لە مەیدانی تەسەووفدا. تەخمیسی پارچە شیعرێکی مەولانا خالیدی کردووە، کە بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

**بشمع طلعتت کردم منور خانه خود را گشادم درگه عیش و فرح پروانه خود را**
**بغـواص خیالت یافتم دردانه خود را به معمـار غمت نو ساختم ویرانه خود را**
**به یادت کعبه کردم عاقبت بتخانه خود را**

بەشی زۆری شیعرە تورکییەکانی "خالص" هەر لەبارەی خۆشەویستی و عیشقی خوداییین، یان تەخمیسی بەشێک لە شیعرەکانی شاعیری بە ناوبانگی تورک: (فضولی) ین.

لەناو ژووری مەرقەدەکەی، بە دەستخەتێکی جوان، ئەم چەند بەیتە شیعرەی خۆی نووسراوە:

**گـــر بیایی به تمـاشاگه ویـــــرانه ما بینی از نیست معمـر شده کاشانه ما**
**همه عـــالم کلمـات اند بـود معنی هو درس اینست در این مکتب شاهانه ما**
**گر به سر منزل عشـاق در آیـی بینی رفعـت و منــزلت این دل دیوانــه ما**
**مــرده ها زنـــده کند زمزمــه حلقهٔ ما نفخ صوراست در این منزل ویرانه ما**
**ساقی و مـــــطرب و خمار همه یک بینی گر شوی محــــرم خلوتگه میخانه ما**
**"خالص" از نور تجلای جمالش می سوخت هو بهو میزَنَدَش ایــن دلِ دیوانــه مــا**

شێخ عەبدوڕەحمان لە ساڵی ١٢٧٥ک (٩ـ ١٨٥٨ز) لە کەرکووک ماڵئاوایی لە تەکیە و خانەوادە و موریدەکانی کردووە، لە ژوورێکی نزیک بە مەرقەدی باوک و باپیری بە خاک سپێراوە. گەلێ لە شاعیر و ئەدیبانی ئەو سەردەمە لاواندوویانەتەوە، یەکێ لەوانە دۆست و هاوچەرخی خۆی (مەولەوی) بووە. لە قەسیدەیەکدا بەزمانی فارسی، مەولەوی بە هۆی کۆچکردنی شێخی عیرفان و ئەدەب و شیعرەوە وتوویەتی:

**ضــیائی کــان برحمانی درین کون میــان سایه‌ها ممتـــاز گردید**
**به فیضش هر یک از اجزای عــالم عــلی استعداده همـــراز گردید**
**مثــالش چون ز رحمت مشتق آمد پــی مصــدر روان پــرواز گردید**
**به تاریخش قلم زان سان رقم زد "برحمت جان پاکش باز گردید"**

"برحمت جان پاکش باز گردید" بەپێی پیتی ئەبجەدی دەکاتە: ١٢٧٥ک.

شێخ ڕەزای شاعیری کوڕی لەو قەسیدەیەی، کە تێیدا باسی باوک و باپیرانی دەکات، بەم شێوەیە باسی باوکی کردووە:

بەرەحمەت چوون ئەوان با بێنەوە سەر بابی ئەوڕەحمان
فیدات بم ئەی نەتیجەی دوودمـانی ئەحمەد و مەحموود
نەتیجەم مەقسەدە تالی و موقەددەم شەرتی تەحسیلە
ئەوانەی بۆیە ئیجاد کرد خـودا، تا ئەم ببێ مـەوجوود

شێخ عەبدوڕەحمانی خالص چوار کوڕی هەبوو: شێخ عەلی، کە بە شێخ عەلی گەورە ناسراوە، ئەویش زانا و شاعیر و شێخی ئیرشاد بووە، لەگەڵ شێخ عەبدولقادر کە شاعیرێکی گەورە بووە، نازناوی "فایز" بووە، و شێخ ڕەزای شاعیری ناسراو و شێخ عبدولواحیدی کوڕی چوارەمی.

د. نووری تاڵەبانی
سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی

**بسم الله الرحمن الرحيم**

## و له من کلام شیخ الشیوخ شیخ عبدالرحمن الخالصی القادری قدس سرُّہ

**(۱)**

**ای که در هر ذره‌ای تابان بود سیمای تو!**
**در دل هر قطره‌ای پنهان بود دریـای تو**
**لمعه‌ای از برق حسنت بر رخ لیلی بتافت**
**برق بر مجنون زد و مجنون شد از سودای تو**
**این چه شور است و چه غوغا در میان اهل دل؟**
**هر که بینم، می‌رود بی‌خود سوی صحرای تو**
**جلوه‌ای از بس که در آفاق گردد جلوه‌گر**
**چشم عقل و سر نیارد تاب بر سیمای تو**
**نیست اندر خانقاه و مدرسه جز شور تو**
**نبود اندر مسجد و میخانه جز غوغای تو**
**در سماء روح و ارضِ جسم نبود مسکنت**
**من عجب دارم که چون درسینه باشد جای تو!**
**«خالص» شیدا نه امروز است از عشق تو مست**
........................................................ [1]

۱ . بەشی دووەمی ئەم فەردە لە دەقەکاندا نەهاتووە.

**(١)**

ئەی ئەوەی وا ڕوخسارت لە هەموو زەڕەیەکدا دەدرەوشێتەوە
دەریـــای تـۆ لەنــاو هــەمــوو دڵـۆپـێـکـدا شــاراوەیــە
تیشکی بـەرقـی جـوانـیـت لـە ڕوخــســاری لـەیـلا درا
بریسکەی لە مەجنوون دا و لە سەودای تۆدا شێت بوو.[١]
ئـەوە چ شـۆر و چ هاتووهاوارێکە لە نێو ئەهلی دڵـدا،
هەرکەس دەبینم، بە بێخودی بەرەو بیابانی تۆ دەڕوات
جـیـلـوەی تـۆ وەهــا لـە هـەمـوو ئـافـاق دەرکــەوتــووە
چاوی عەقڵ و سەر، تاقەتی [دیتنی] ڕوخساری تۆی نییە
لە خانەقا و مەدرەسە جگە لە شۆر و شەوقی تۆ نییە
لە مـزگـەوت و مەیخانەشدا جیا لە ئاشۆبی تۆ نییە
لە ئاسمانی ڕۆح و ئــەردی لـەشـدا، شوێنت نابێتەوە
پێم ســـەیرە چۆن لـــــە سینگـــــدا جێــت دەبێـتــەوە
خالصی شەیدا هەرئەمرۆ بە عیشقی تۆ سەرخۆش نەبووە
؟.........................................................[٢]

---

١ . بوو بە مەجنوون

٢ . ئەم بەشە شیعرە لە دەقەکاندا نەهاتووە

## شرح فارسی و کردی غزل ۱
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۱

ذره: به اصطلاح علم فیزیک (اتم) هاتف اصفهانی گوید: "دل هر ذره‌ای که بشکافی آفتابیش در میان بینی"
زەڕە: بە زاراوەی زانستی فیزیا (ئەتوم). هاتفی ئیسفەهانی دەڵێ: "نێو هەر زەڕەیێک بقەڵشێنیەوە، خۆرێکی تێدا دەبینی."

لمعۀای از برق حسنت بر رخ لیلی فتاد: مرحلۀ عشق مجازی اولین پایۀ عشق حقیقی است. عشق را سه مرحله است عشق جسمانی، عشق روحانی، عشق ربانی.

شاعیر فەرموویەتی، کە تیشکێکی ڕووناکیی جوانیت کەوتە سەر ڕوومەتی لەیلا، واتە جوانی و شۆخ و شەنگی لە نووری خوداوەندەوەیە کە عیشق پێکدێنێ، هەربۆیە دەڵێن تا عیشقی ڕواڵەتی و مەجازی نەبێ، عیشقی حەقیقی نابێ، قۆناغی عیشقی مەجازی یەکەمین پلەی عیشقی حەقیقیە، عیشق سێ قۆناغی‌هەیە، عیشقی جیسمانی، عیشقی ڕووحانی، عیشقی ڕەببانی.

اهل دل: شایستۀ عشق و به معنی کسانی که از سَر گذشته طالب سرّند و آنان مجاز و مرخص‌اند که به هر عبارت که خواهند از آن حالات وجدانی خود تعبیر کنند. حافظ گوید: چو بشنوی سخن اهل دل مگو که خطاست.
ئەهلی دڵ: شیاوی عیشقی مەعنەوی ئەوانەن کە سەریان داناوە و بەدوای سر "نهێنی"دا دەگەڕێن و ئەوانە ئیزن دراون و ئازادن بە بیست، مەڵێ هەڵەیە. هەر عیبارەتێ، کە دەیانەوێ حالاتی ویژدانی خۆیان شرۆڤە بکەن،

جلوه: انوار الهی را گویند که بر دل سالک عارف، ساطع گردد و او را واله و شیدا کند و عالم و آدم همه جلوات انوار حق تعالی می‌باشد و همه اشعه و پرتوی از نور وجودند که در مرتبت تفصیل به طور مختلف نمودار گردیده‌اند.

جیلوه: به ئه‌نواری ئیلاهی ده‌ڵێن، که له‌سه‌ر دڵی، ڕێبواری عارف شه‌وق ده‌داته‌وه و شێت و شه‌یدای ده‌کا و عاله‌م و ئاده‌م هه‌مووی نوێنگه‌ی ئه‌نواری حه‌ق ته‌عالایه و هه‌موو په‌رته‌و و تیشک و ڕووناکی له نووری وجوودن که له پله‌ی گشتگیردا به شێوازی جۆراوجۆر ئاشکرا ده‌بن.

(۲)

ای بـرادر! تو چشـم خـود یکبار
پـاک کـن از غشـاوۀ پنـدار
بیـن کـه نـور وجـود در هـر جا
زده بـر تـو بـه هـر در و دیـوار
چشـم بگشـا، ببیـن کـه در دنیا
لیـس فـی الـدار غیـره و[1] دیـار[2]
نیسـت جـز روی شـاهد ازلـی
متجلـی در انفـس و اقطـار
جلـوه او پیاپی‌اسـت، امـا
لـیس فیهـا تـوهـم التـکرار
در مظاهـر چـو جلوه‌گـر گردیـد
شـد یکـی، صـد ز کثـرت آثـار
این، سبب شـد که وحدت موجود
می‌نمـاید بـه چشم مـا بسیار
ورنه در چشم «خالص»، آن معدود
جـز یکی نیست در شمـار هـزار

۱ . غیره
۲ . باشد (یاء)

**(٢)**

کــاکـــی بــــرا! تـــۆ چـــــاوی خــــۆت جـــارێــک
لـــه تـــهمـــی گـــومـــان پــــــاک بـکــــــهوه،
سهیرکه چۆن نووری وجوودی [حهق] له ههموو شوێنێک
له ههموو دهرک و دیوارێک شهوقی له تۆ داوه
چـــــاو بـــکــــهوه و بـــزانـــه جـــیـــهـــان
جـگـه لـــهو، هـــیـچ کـهسـێـکـی تـێـدا نییه[1]
جـگـه لـه ڕوخـــســـاری شـاهـــیـدی ئــــهزهلی،
هیچ شتێک له مروڤهکان و ولاتهکاندا ڕهنگ ناداتهوه
دهرکـــهوتــــنی ئــــهو بـــێ پـــســانـــهوهیـــه، بـــهلام
گـــومـــانی دووپـــات بـــوونــــهوهی لـــێ نـــاکــرێـت،[2]
کـــاتـــێ، کـــه لــه نـوێـنـگـهکـانـدا دهرکـــــهوت،
لهبهر زۆریـــی شوێنهوارهکانی، یهک بوو به سهد
هـــهر ئهوهش بوو، به هۆکار کـه یهکێتیی مـــهوجوودات
لـهبـهرچــــــاوی ئێمــه زۆر دهنـــوێنێت
دهنـــا لهبهرچـــاوی «خـــالـص» ئـــهو ژمـــێـرراوه
لــــه هــــــــهزاران تـــهنـــیـــا یـــهکـــێـــک هـــهیـــه

---

١ . ليس في الدار غيره ديار
٢ . ليس فيها توهم التكرار

## شرح فارسی و کردی غزل ۲
### شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۲

وحدت وجود: حضرت شیخ عبدالرحمن خالص تحت تأثیر مستقیم شاعرانی که آثارشان را تخمیس کرده است، چون؛ کمال خجندی، شمس مغربی، قاسم انوار، نور علیشاه پیرو مکتب وحدت وجود است و طریقهٔ قادریه نیز در بُعد علمی آن از پیروان وحدت وجود بشمارند، بویژه که سلسلهٔ طالبانی شاخهٔ هندی طریقت قادریه است. در اشعار این‌گونه شاعران اصولاً واژگان که ابزار توضیح و تفسیر اندیشه هستند، یکسانند چون، دریا، موج، قطره، حباب، خورشید، ذره، کثرت، وحدت و... این اندیشه از تأثیر آثار محیی‌الدین عربی و صدرالدین قونیوی است.

در اشعار خالص وجود؛ دریاست، مواج و کف‌آلود. از امواج آن طبیعت و اسماء پدید آمده، جهان چون حبابی بر آب است. اگر هوای این حباب به دَر رَوَد، دریا می‌گردد، عین دریا، کثرت امواج حجاب وحدت دریاست اگر از سویی موج را بنگری کثرت می‌بینی و اگر به دریا نظر افکنی وحدت می‌بینی، این نظر همانند حکمت «ودانتا» است، در اصل حکمتِ براهما، که مبدأ کل عالم است حقیقت همه چیز و اصلش تمام کائنات است، همچنان که کف و موج دریا را با دریا هیچ تفاوت نیست و هیچ تفاوتی هم بین جهان و برهما نیست.

خالص از شکل دیگر وجود را کلی می‌داند مرکب از اجزاء که هر جزو آن عین کل است. اجزاء مظاهر کل‌اند و اشیاء سایه‌های اسماء و اسماء ظهور خورشید ذات والای او، صحرای زمین امکان و کتاب حق تعالی است همان طور که محیی‌الدین ابن عربی گوید: سبحان من جعل الاشیاء و هو عینها.

قیصری در شرح فصوص در این باره گوید؛ وجود چون نور محض است و خورشید تابان که از تابش او ذرات در کَوْن هویدا شده و از سایه او اشیاء پدیدار گشته و خود در زیر سایه پنهان مانده اگر

بی‌نقاب دیده شود، چشم را خیره می‌کند و جمیع اشیاء محو بالذات می‌گردند. حجاب او اسماء و صفات اویند، او واحد کثیرنما است که ذات و اسم و نعت و عقل و نفس، جملگی نقش تعینات اویند، ذات او از جسم و جان و نفی و اثبات بیرون است به عبارتی او عنقای مغرب است و خلقت؛ سایهٔ او و سایه، حجاب عنقاست همان طور که محیی‌الدین در فصوص دارد؛ وحدت و کثرت از لوازم حقیقت وجودند به اعتبار تجلی و ظهور متعدد در مراتب و اکوان و اعیان.

وەحدەتی وجوود: حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمانی خالص لە ژێر کاریگەریی ڕاستەوخۆی ئەو شاعیرانەدایە، کە شیعرەکانیانی لەم کتێبەدا تەخمیس کردووە، وەک کەمالی خوجەندی، شەمسی مەغربی، قاسمی ئەنوار، نوورعەلی‌شا؛ پەیڕەوی مەکتەبی وەحدەتی وجوودە؛ هەروەها پیرانی تەریقەتی قادری لە لایەنە زانستی و علمیەکەیەوە پەیڕەوانی وەحدەتی وجوودن، بە تایبەت کە سیلسیلەی تاڵەبانی بە لقی هیندیی تەریقەتی قادری دەژمێردرێ. لە ئەشعاری شاعیرانی پەیڕەوی مەکتەبی وەحدەتی وجوود ئەو وشە و کەلیمانە کە ئامێری ڕوونکردنەوە و شرۆڤەی بیروباوەڕی ئەوانن، یەکن و بریتین لە؛ دەریا، مەوج، قەترە، بڵق، خۆرشید، زەڕە، کەسرەت، وەحدەت و... ئەم بیرو باوەڕە لە کاریگەریی بەرهەمەکانی محێدینی ئیبنی عەرەبی و سەدرەددینی قوونیەوییە.

لە ئەشعاری خالص دا؛ وجوود دەریایە، بە شەپۆل و کەفاوی. لە ئەمواجی ئەو سروشت و ئەسما پێک هاتوون، جیهان وەک بڵقێکە کە ها بەسەر ئاوەوە کە ئەگەر هەوای ئەو بڵقە نەمێنێ، دەبێ بە دەریا هەر وەک دەریا؛ فرەیی و کەسرەتی شەپۆل پەردەی یەکیەتیی دەریایە، ئەگەر لە لایێکەوە بنواڕیە شەپۆل فرەیی و کەسرەت دەبینی و ئەگەر بنواڕیە دەریا یەکیەتی و وەحدەت دەبینی، ئەم بیروباوەڕە هەمان حیکمەتی «ودانتا»یە، لە بنەمادا حیکمەتی "براهما"یەکە بن‌چەقی هەمووی عالەمە، حەقیقەت

هەموو شتێکە و ئەسڵی هەمووی کائیناتە، هەروەها کەف و شەپۆل و دەریا عەینی دەریایە و جیاوازی لە نێوانیاندا نییە. هەروەها جیاوازی لە نێوان جیهان و بەراهمادا نییە.

خالص لە بابەت و شێوازێکی‌تر؛ "وجوود" بە گشت "کل"ێک دەزانێ کە لە ئەجزا پێک هاتووە و هەر جوزئێ لەو عەینی کول و هەموو شتێکە، ئەجزا جێگەی زوهووری گشتین و ئەشیا سێبەری ئەسمائن و ئەسما زوهووری خۆر و رۆژی زاتی ئەون و سارای زەمین ئیمکان و کتێبی حەق تەعالایە. هەروەها کە موحیەددین دەڵێ: "سبحان من جعل الاشیاء وهو عینها."

قەیسەری لە شەرحی (فصوص الحکم) لەم بارەیەوە دەڵێ؛ "وجوود" وەک نووری مەحزە و خۆری تابان کە لە تیشکدانەوەی ئەو زەڕاتی هەردوو دنیا ئاشکرا بووە و لە سێبەری ئەو ئەشیا پێک هاتووە و خۆی لە ژێر سێبەردا شاراوەتەوە. ئەگەر بێ‌پەردە ببینرێت، چاو دەوەستێ و هەموو ئەشیا لە ناو دەچێ و نامێنێ، پەردەی ئەو، ئەسما و سیفاتی[1] ئەون، ئەو یەکانەی فرە نوێنەکە زات و ئیسم و نەعت و عەقڵ و نەفس، هەمووی وێنەی بینین و شکۆ و جەلالی ئەون، زاتی ئەو لە، لەش و گیان و نەفی و ئیسبات بە دەرە. بە عیبارەتێ ئەو عەنقای رۆژئاوایە و ئافراندن سێبەری ئەوە و سێبەر پەردەی عەنقایە، هەروەها کە محێدین لە "فصوص" دا وتوویەتی کە، یەکیەتی و فرەیی، یان وەحدەت و کەسرەت لە پێویستییەکانی حەقیقەتی وجوودن بە ئیعتیباری تەجەلی و زوهووری بەربـڵاو و فراوان لە مەراتیب و ئەکوان و ئەعیاندا.

---

١ . بۆ مانای ئەشیا، ئەسما، ئیمکان، سیفات بڕوانە شرۆڤەی کیتابولمەعارف (شەرحی مەسنەویی، خالص)

(۳)

مرغ جان در بند هجرت خسته و افگار[1] شد
عقل، از عشق تو، سودای سر بازار شد
هر که با یاد وصالت خون دل خورد از غمت
مژده باد آن را که جانش محرم اسرار شد
ای که در ظلمات هجری! چشم بگشا و ببین:
سر به سر ذرات عالم مطلع انوار شد
کرّ شود آن گوش کو راز جمالت نشود
کور باد آن دیده کو محروم از دیدار شد
نَبْودَش غیر رضای دوست در دل هر که او
از سر صدق و صفا آشفتهٔ دلدار شد
ای خوشا آن دل که از می پر شد و از خود نشد
وی خــوشا آن سر که بــا پیمانه بی‌دستار شد
در خرابات مغان، «خالص» به جست‌وجوی تو
خـــرقه را آتش زد و در حــلقهٔ زنـــــار شــد

---

۱ . افکار

**(٣)**

باڵندەی گیان لە بەندی دووریی تۆدا بریندار و کۆڵەوار بوو
عــەقڵ لە عیشقی تـۆدا، بــوو بـە سەودای سەر بــازاڕ
هەرکەس بە یادی گەیشتن بە تۆ و لە خەمی تۆدا، خوێنی دڵی خواردەوە
مزگێنی لەو بێ، کە گیانی بوو بە مەحرەمی نهێنییەکان
ئەی ئەو کەسەی لە تاریکایی دووریدای! چاو بکەوە و بڕوانە
هــەمــوو زەڕاتی عــالــەم بــوونــە ئــاســۆی ڕوونــاکــی
یاخوا ئەو گوێچکەیە کەڕ بێ کە نهێنیی جەمالی تۆ ناژنەوێت
ئەو چـاوە کوێر بێ کە لە دیــدار[ت] بێبەش ماوەتەوە
ئەو کەسەی بە سیدق و سەفاوە شەیدای دڵدارەکەیەتی،
جـگـە لــە ڕەزای دۆســـت هیچی لــە دڵـــدا نییە
خۆشی بۆ ئەو دڵەی پڕ بوو لە مەی بەڵام لە خۆی بێخود نەبوو
خـۆشی بۆ ئەو سەرەش کە بە جـامێک مەی، مێزەری فـڕێ دا
«خالص» لە خـەراباتی موغان و لە کـاتی گـەڕان بەشوێن تـۆدا،
عـــەبای خۆی ئــــاگر تێبەردا و چـــووە ناو ئەڵقەی زوننارەوە

مرغ جان: مراد روح است که مرغان روحانی در جهان روحانی در طیرانند.
پەلەوەری گیان: مراز ڕووحە و پەلەوەرانی ڕووحانی لە جیهانی ڕووحانیدا لە فڕیندان.

عقل: یعنی خرد و در اصطلاح حکما قوهٔ مدرک کلیات را عقل گویند و گاه نفس ناطقه را گویند، عقل را از آن جهت عقل گویند؛ که تعقل خود و موجد خود می‌نماید و دانندهٔ همهٔ اشیاء اوست و در خبر است که، اول ماخلق الله العقل.
عقل دو قسم است؛ یکی عقل معاش که محل آن سَر است و دیگر عقل معاد که محل آن دل است. (اسرار القلوب، شرح گلشن راز، ص ٤؛ اسرار التوحید، ص۲۱۵؛ شرح قیصری، ص٤١)

عەقڵ: واتە عەقڵ و ئاوەز لە ئیستیلاحی حوکەمادا بە هێزی دەرکی گشتی دەڵێن عەقڵ و گاهێ بە نەفسی ناتیقە دەڵێن عەقڵ. بۆیە عەقڵی پێدەوترێ، کە تەعەقول بۆ خۆی و پێکهاتەی خۆی لە ئەستۆیەتی و ئاگادار و زانیاری هەمووی ئەشیا، عەقڵە و لە حەدیسدا هەیە کە: اوّلُ ما خلق الله العقل.
عەقڵ دوو بەشە؛ یەکێ عەقڵی مەعاش کە جێگەی ئەو لەسەری مرۆڤدایەو ئەوی تر عەقڵی مەعاد کە جێگەی ئەو لە دڵدایە. (اسرارالقلوب، شرح گلشن راز، ص ٤؛ اسرارالتوحید، ص ۲۱۵؛ شرح قیصری، ص٤١)

عشق: میل مفرط است و اشتقاق عاشق و معشوق از عشق است و به معنی فرط حب و دوستی است و نیز مشتق از عَشَقه است و آن گیاهی است که به دور درخت پیچد و آب آن را بخورد و رنگ آن را زرد کند و برگ آن بریزد و بعد از مدتی خود درخت نیز خشک شود. عشق نیز چون به کمال خود رسد قوا را ساقط گرداند و حواس را از کار بیندازد و طبع را از غذا بازدارد و میانِ محب و خلق ملال افکند و از صحبت غیردوست ملول شود یا بیمار گردد یا دیوانه شود یا هلاک گردد.
عشق، مهم‌ترین رکن طریقت است و این مقام را تنها انسان کامل که

مراتب ترقی و تکامل را پیموده است، درک کند.

از بُعدی، عشق را به حقیقی و مجازی تقسیم کنند. عشق حقیقی، عشق به لقاء محبوب حقیقی است که ذات احدیت باشد و مابقی عشق‌ها مجازی است. عشق‌های مجازی هم یا محبوب و ممدوح است و یا مذموم و ناپسند. برحسب منشأ و مبدأ و اساس آن که عشق حیوانی است یا غیرحیوانی، حیوانی که عشق پست است و غیرحیوانی یا محبت پاک است به زیبارویان و مظاهر جمال حق از جهت آن که مظهر حق‌اند.

و بالاخره در این که محبت و عشق و علاقه پایه و اساس زندگی و بقاء و موجودیت عالم است شکی نیست زیرا تمام حرکات و سکنات و جوش و خروش جهانیان بر اساس محبت و علاقه و عشق است و بس.

و عارفان گویند؛ حتی وجود افلاک و حرکات آنها به واسطهٔ عشق و محبت است. (لمعات، ص ٣٤٧؛ کشاف، ص ١٠٢؛ طرائق، ص ١٠٦؛ شرح تعرف، ج ٤، ص ٣٠؛ مقدمه نفحات، ص ١٢٦؛ محبت نامه، ص ٤٠)

عیشق: عیشق مەیلی فراوانە و ئیشتقاقی عاشق و مەعشووق، لە وشەی عیشقەوە بە مانای ئەو پەڕی حەزلێکردن و دۆستیە، ئەم وشەیە، هەروەها وەرگیراوە لە عەشەقە کە ناوی گیایەکە کە لە دەوری دار و درەخت دەهاڵێ و ئاوی دارەکە دەمژێ و ڕەنگیشی زەرد دەکا و گەڵای دەوەرێ و لە دوای چەند ڕۆژێ دارەکە وشک دەکا، عیشق کاتێ بە کەمالی خۆی دەگات هێز و توانا لەناو دەبات و هەست و حەواس لەکار دەخات، مەیل بە خواردن نامێنێ و لە نێو عاشیق و خەڵکدا بێمەیلی و دڵساردی پێک دێت و لە سوحبەتی غەیری دۆست مەلوول دەبێ، یان نەخۆش دەکەوێ، یان شێت دەبێ، یان هیلاک دەبێ و دەمرێ، عیشق، پربایەخترین، بنەمای تەریقەتە و ئەم پایەیە تەنیا بۆ ئینسانی کامیلە کە مەراتبی تەرەقی و تەکامولی بە کۆتایی گەیاندوە و دەرکی کردووە.

لە بڕێک لە ڕوانگەکانەوە عیشق بە حەقیقی و مەجازی بەش دەکەن، عیشقی حەقیقی، عیشق بە دیدار و دیتنی مەحبووبی حەقیقیە کە زاتی یەکدانەی خوداوەندە و پاشان عیشقی مەجازیە، عیشقی مەجازی، یان

پەسندکراو و چاکە، یان ناپەسند و قیزەونە. بنەما و سەرچاوەی عیشق یان، حەیوانیە یان، غەیری حەیوانی، حەیوانی کە عیشقی ناپەسندە و غەیری حەیوانی، یان مەحەببەت کە پاک و خاوێنە، بەرامبەر بە جوانان و مەزاهیری جەمالی حەق لەبەر ئەوەی کە مەزهەری حەقن.

لە کۆتاییدا ئەمە کە مەحەببەت و عیشق و هۆگری پایە و سەرچاوەی ژیان و نەمری و مەوجوودیەتی عالەمن شکی تیا نییە، چونکە هەموو حەرەکە و وەستان و چالاکی و تێکوشانی ئەهلی جیهان بە پێی مەحەبەت و عەلاقە و عیشقە و بەس.

عارفان دەڵێن؛ تەنانەت وجوودی ئەفلاک و حەرەکاتی فەلەکی بە هۆی عیشق و مەحەببەتەوەیە. (لمعات، ص ٣٤٧؛ کشاف، ص ١٠٢؛ طرائق، ص ١٠٦؛ شرح تعرف، ج ٤، ص ٣٠؛ مقدمە نفحات، ص ١٢٦؛ محبت نامە، ص ٤٠)

ظلمات: ظلم عبارت از نهادن چیزی است در غیر محل خود و ظلمات به معنی تاریکی است و در اصطلاح صوفیە کفر است کە پوشش از حق است و هواهای نفسانی است کە موجب ستر عبد است از حق و ظلمات هجر مقصود همین است.

زوڵمات: واتە تاریکی، وەرگێڕاوە لە وشەی «زوڵم» کە عیبارەتە لە دانانی شتێک لە غەیری جێگەی خۆیدا و لە ئیستیلاحی سۆفیەدا کوفرە کە حەق دادەپۆشێ و هەروا هەوای نەفسانیە کە داپۆشێنەری حەق لە عەبدە و مەبەست لە زوڵماتی هیجر ئەم لایەنەیە.

مطلع انوار: مطلع عبارت از مقام شهود متکلم است در وقت تلاوت آیات کلام او کە متجلی است بە آن صفت کە مصور آن آیت است. (اصطلاحات شاه نعمت‌الله، ص ٤٨) مطلع انوار، مقام شهود و بارقۀ انوار بر دل عارف در درک وحدت و یگانگی عالم.

مەتلەعی ئەنوار: واتە جێگەی سەرهەڵدانی ڕووناکی و نوور کە عیبارەتە لە مەقامی شوهوودی موتەکەللیم لە کاتی خوێندنەوەی ئایاتی کەلامی قورئانی پیرۆزد، کە ئەو نوورە موتەجەلیە بە سیفەتێ، کە وێنەیٚ

ئەو ئایەتەیە. (اصطلاحات شاه نعمت‌الله، ص ٤٨) مەتلە عی ئەنوار، مەقامی شوهوودە و باریقەی ئەنوارە لەسەر دڵی عارف بۆ دەرکی وەحدەت و یەکدانەیی عالەم.

خرابات مغان: میخانه را گویند و عارفان مقام وصل و اتصال را منظور دارند که واصلان به الله را از بادهٔ وحدت سرمست کند.
خەراباتی موغان: بە مەیخانە دەڵێن و مەبەستی عارفان لە خەراباتی موغان مەقامی وەسڵە و پێوەندیی بە بازنەی بێ‌سنووری زاتی خوداوەندیە، کە بەخوا گەیشتووان لە بادەی یەکدانەیی سەرمەست دەکا.

حلقهٔ زنار: مرتبهٔ تفصیل و تعینات الهی است.
ئەڵقەی زونار: مەرتەبەی تەفسیل و تەعەیوناتی ئیلاهییە.

خرقه: جامه‌ای که صوفیان می‌پوشند، خرقه گویند. (کشاف، ص٤٤٤) در زبدةالحقایق گوید: معنی خرقه، ظل ولایت است و لباس او علامت قبول شیخ، و قبول شیخ علامت قبول حق و اقسام خرقه پنج است: خرقهٔ توبه، خرقهٔ ارادت، خرقهٔ تبرک، خرقهٔ نصرت و... و در اینجا مقصود خرقهٔ نصرت است که خرقه را آتش زد، یعنی بر ظواهر پیروز شد.
خەرقە: جلوبەرگێک کە سۆفیەکان لە بەری دەکەن. (کشاف، ص٤٤٤) کتێبی زوبدەتولحەقایق دەڵێ: مانای خەرقە، سێبەری وەلایەتە و لە بەرکردنی نیشانەی قەبووڵی شێخە و قەبووڵی شێخ نیشانەی قەبووڵی حەقە، خەرقە پێنج جۆرە؛ خەرقەی تەوبە، خەرقەی ئیرادەت، خەرقەی تەبەڕوک، خەرقەی نەسرەت و... و لێرەدا مەبەست خەرقەی نەسرەت واتە سەر کەوتنە و خەرقەی سووتاند و ئاگریدا، مانای سەرکەوتن بە سەر نەفس و عیرفانی رواڵەتی‌دایە.

(٤)

کی بود یارب! که رو آرم به صحرای نجف؟
مطلب[1] خــود یابم از درگـــاه مــولای نجف
سر برون آوردن از ظلمات هستی مشکل است
بــی‌طـــلــوع آفــتـــاب عـــالــــم‌آرای نجف
در حیات جاودان ماند چو خضر، آن کو اگر
جــرعــه‌ای یابد ز فیض آب دریـــای نجف
جان فدای آن سری بادا که از سودای عشق
نیست یک دم خالی از ذوق تمنای نجف
کی شود محروم از مطلب، کسی کو سر نهد
بر تــــــراب خـــــاک درگاه معـــــلای نجـــف
خرم[2] آن ساعت که «خالص» با تولای علی،
والــه و شیدا شود در پـــای صحرای نجــف

١ . مطلوب

٢ . با تشدید راء

**(٤)**

کــەی دەبــێ یــارەب ڕوو بکەمــە بیابانــی نەجــەف و
داخوازی خۆم لە دەرگانەی مەولای نەجەف دەست کەوێ
ســەردەرهێنان لــە تاریکســتانی بــوون، ئەســتەمە
بــە بێ هەلاتنــی هەتاوی جیهــان ڕازێنــەرەوەی نەجەف
وەک خدر لە ژیانی هەمیشەییدا دەمێنێتەوە، ئەو کەسەی
قومێکی لە فەیزی ئاوی دەریای نەجەف دەســت کەوت
گیان بە قوربانی ئەو سەرە بێت، کە لە سەودای عیشقدا
دەمەســاتێک لە زەوقــی داخوازی نەجــەف بەتاڵ نییە
کەی لــە داخوازی خــۆی بێبەش دەبێ ئەو کەســەی
سەر لــەسەر خــاکی دەرگانەی بەرزی نەجەف دابنێ؟

ئەو کاتە چەندە خۆشە کە «خالص» بە خۆشەویستیی عەلییەوە
لە ســــەحــــرای نــەجــەفــدا شێت و شەیــدا دەبێت

## شرح فارسی و کردی غزل ٤
### شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ٤

طالبانی‌ها و ائمۀ اثنی عشریه: اکثریت قریب به اتفاق سلاسل صوفیه که پیرو مذاهب اربعۀ اهل سنت و جماعت هستند و در جغرافیای کشورهای اسلامی زندگی می‌کنند، پیوندی تمام با خاندان رسول خدا و اهل بیت دارند. از جمله طریقت قادریه، مریدان شیخ عبدالقادر گیلانی و بویژه طالبانی‌ها که در طی سلسلۀ مشایخ خود که منتهی به حضرت علی بن ابیطالب کرم‌الله وجهه می‌شود ائمۀ اثنی عشریه را از واسطه‌های اصلی در پیوند با حضرت رسول اکرم (ص) می‌دانند، و حضرت شیخ عبدالرحمن خالص این غزل را در توسل به حضرت علی بن ابیطالب(ع) مولای نجف که در آن شهر مدفون است و مرقد مبارکش در آنجاست، سروده است.

تاڵەبانییەکان و دەوانزە ئیمامەکە: زۆرینەی نزیک بە تەواوی زنجیرەی سۆفیەتی، کە پەیڕەوی ئایینــزاکانی چوار مەزهەبی سوننەت و جەماعەتن و لە جوغرافیای وڵاتانی ئیسلامیدا دەژین، پێوەندیی تەواویان لەگەڵ خانەدانی ڕەسووڵی خودا و ئەهلی بەیت (د.خ) هەیە، بۆ نموونە تەریقەتی قادری و موریدانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، بەتایبەت تاڵەبانییەکان کە لە خوێندنەوەی زنجیرەی مەشایخی خۆیاندا، کە بە حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبیتاڵیب (کرم الله وجهه) دەگات، هەردوانزە ئیمامی مەشهوور لە پێوەندی لەگەڵ حەزرەتی ڕەسووڵی ئەکرەم

(ص) دا به یەکێک لە واسیتە ئەسڵییەکان دەزانن و حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمانی "خالص" ئەم غەزەلەی بۆ پاڕانەوە لە حەزرەتی علی (د.خ) مولای نەجف کە مەرقەدی پیرۆزی لەو شارەدایە، هۆنیوەتەوە.

ظلمات: رک، شرح غزل پیشین
زوڵمات: بڕوانە شرۆڤەی غەزەلی پێشوو

آفتاب عالم آرای نجف: مقصود حضرت علی بن ابیطالب است. اکثر عارفان شاعر علی(ع) را به آفتاب تشبیه کرده‌اند که بحثِ مفصلی دارد.
هەتاوی جیهان ڕازێنەرەوەی نەجەف: مەبەست حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی‌تالیبە، زۆر لە عارفانی شاعیر، عەلی (د.خ)یان بە خۆر تەشبیهـ کردووە کە بابەت و باسێکی بەربـڵاوە.

حیات جاودان: فناء فی الله
حەیاتی جاودان: ژیانی هەتاهەتایی؛ مەبەست مەقامی"فناء فی الله" ە

خضر: خضر زنده پیامبر نامیراودستگیر موسی
خدر: خدری زیندوو، پەیام هێنەری هەرگیز نەمر و ڕێنوێنی حەزرەتی مووسا (د.خ)

ذوق: ذوق قوّتی است منبعث و منتشر در عصب مفروش بر جرم زبان که به واسطه آن طعوم ادراک می‌شود و نزد صوفیه، اوّل درجهٔ شهود را ذوق گویند. شهودی که در اثناءِ بوارق متوالیه باشد و ذوق را در مرتبت کامل‌تر شرب گویند. (شرح تعرف، ص ١٦٠)
هجویری گوید: ذوق مانند شرب باشد اما شرب جز اندر راحات مستعمل

نیست و ذوق مر رنج را نیکو آید. (کشاف، ص ٥١٢؛ تاریخ تصوف، ص٦٤٥؛ کشف‌المحجوب، ص ٥٨)

تمنا: تمنی؛ آرزو

نیست یکدم خالی از ذوق تمنای نجف:

زەوق: زەوق هێزێکە بە سەر دەمارەکانی زماندا کە تامی هەموو خواردنەوە و خواردەمەنییەک بەو دەچێژرێ؛ ئەهلی تەسەوف بە یەکەمین پلە و پێگەی شوهوود دەڵێن زەوق، بە شوهوودێک کە لە بەر تیشکی بێوچان و بەردەوام و زەوقی تێروتەسەلدا بێ دەڵێن شورب.(شرح تعرف، ص ١٦٠)

هوجوێری دەڵێ: زەق وەک شوربە بەڵام شورب جگە لە خۆشی لە کاتی دیدا بەکار نەهاتووە و زەوق لە چەڵەمە و چەرمەسەریشدا بەکار دەبرێ. (کشاف، ص٥١٢؛ تاریخ تصوف، ص ٦٤٥؛ کشف المحجوب، ص ٥٨)

تەمەننا: تەمەننا؛ ئاوات

یەک دەم لە زەوقی تەمەننا = ئاواتی چەشتنی (باتنی و عیرفانی)ی نەجەف بەتاڵ نییە.

(۵)

حـق، که نـور وصـف او بنمـوده در عالـم، جمال
آفتابسـت و همـه عالـم ورا باشـد ظـلال
آفتـاب و سـایه، هـر دو، در حقیقـت واحدنـد
مختلـف هـر چنـد باشـد پیـش رؤیـت در مثال
لیـک در هر سـایه‌ای گشـته بـه رنگـی جلوه‌گر
در یکـی نـور جمالـش ظاهـر و در یـک، جـلال
ای کـه داری در شـریعت مسـند عالیمقـام!
یـک دو نکتـه هسـت دارم از تو مأمول سـئوال
گـر وجـود توسـت می‌گردد بـه صحـرای وجود،
پس وجود حـــــق کجا دارد در آن صحرا محال؟
در وجـود مطلـق حقسـت، غیـر اوسـت هیـچ
بس کن این شرک خفی کوتاه کن این قیل و قال
«خالص» از اخلاص گوید هردم این نکته به دل
لیس غیـرالحق فی الکون سوی رسم الخیـال

**(٥)**

حـــەق، کە نـــووری وەسفی ئـــەو لە عالەمدا ڕوخـــساری نـــوانـدوە،
هـــەتـــاوێـــکـــە و هـــەمـــوو عـــالـــەم ســـێـــبـــەری ئـــەون
هـــەتـــاو و ســـێـــبـــەر لـــە ڕاســـتـــیـــدا یـــەک شـتن
گـــەرچـــی لـــە دەرکـــەوتـــنـــدا لـــەبـــەرچـــاو، لـــێـک جـــیـــاوازن
بـــەڵام ئـــەو، لـــە هـــەر سێبەرێکدا بـــە ڕەنگێک خـــۆی نـــوانـدوە،
لە یەکیاندا نـــووری جەمالی دەرکـــەوتـوە و لەیەکیتردا [شەوقی] جەلالی
ئەی ئەو کەسەی وا لە شەریعەتدا پێگە و جێگەی بـــەرزت هەیە!
ئـــــاواتی پـــرســـیـــارکـــردنی یـــەک دوو بـــابـــەتم لـــێـت هـــەیـــە:
ئـــەگـــەر بـــوونی تـــۆیـــە کـــە بـــە بـــیـــابـــانـــی وجـــوددا دەگـــەڕێ،
کـــەوابـــوو، وجـــوودی حـــەق لە و بیابانەدا چـــۆنی جێ دەبێتەوە؟
ئەگـــەر وجـوودی ڕەهـــای حـــەقە جگە لـــەو، هیچە
تۆش ئەو شەریک‌دانانە نهێنییە بەس بکە و کۆتایی بەم دەنگ و هەرایە بێنە!

«خالـص لـە ڕووی ئیخلاس و لـە دڵیەوە هەردەم ئەم قسەیە دەکـا و دەڵێ:[1]
ئـەوەی غەیـری حەقە لـە کایناتـدا، لە وێنـەی خەیاڵ بـەولاوە شـتێک نییە[1]

١ . لیس غیرالحق فی الکون سوی رسم الخیال

(٦)

از غم عشـــق تو جانا! همه شـــب تا به سحر
می‌کنـــم نالـــه و فریـــاد، خـــورم خـــون جگر
بس کـــه در بادیه‌ی هجر تو شـــیدا گشـــتم،
کـــرد دیوانگیـــم در دل هـــر ســـــنگ، اثر
آنچـــه بیداد تو جانـــا! به من مســـکین کرد،
نرود شـــرح و بیانش به دو صد ســـال، به سر
تا بـــه ویرانـــه‌ی دل گنج غمت کـــرده مقام،
حـُقــهٔ دل شـــده آکنـــده ز یاقـــوت و گهـــر
ســـفری در وطـــن، ای عـــارف هشـــیار! بکن
گنـــج حـــاصل نشـــود تا نکشـــی رنج ســـفر
«خالص» از عشـــق تو رسوای جهان گشت و هنوز،
غیـــــر سودای لبـــــت هیـــــچ نـــــدارد در ســـر

**(٦)**

گیانەکەم، لە خەفەتی عیشقی تۆدا هەموو شەوان تا بەیانی
نالـــە و هـــاوار دەکـــەم و خوێـــنی جـــەرگ دەخۆمەوە
ئەوەنـــدە لـــە بیابانـــی دووریـــی تـــۆدا شـــەیدا بـــووم،
شێتییەکەی من شوێنی لەسەر دڵی هەموو بەردێک دانا
ئەوەی بێدادیی تۆ گیانەکەم لەگەڵ منی مسکێنی کرد،
شـــرۆڤە و دەربڕینی بە دووســـەد ســـاڵ تـــەواو نابێت[1]
لەوەتی گەنجی غەمی تۆ لە وێرانەی دڵمدا جێگیر بووە،
ســـندووقچەی دڵ لـــە یاقـــووت و گەوهـــەر ئاخنـــراوە
ئـــەی عارفی وشـــیار! ســـەفەرێک بـــە نیشـــتماندا بکە
هەتا ڕەنجی سەفەر نەکێشی، گەنج دەست نـــاکەوێت
«خالص» بەهۆی عیشقی تۆوە لە جیهاندا ناوی زڕا و هێشتا
جـــگە لە سەودای لێوت هیـچی دیـــکەی لەسەردا نییـە

١. «کارێ کە غەم و دەردی فیراقت بە منی کرد، سەرما بە هەتیو، با بە دەواری شڕی ناکا»، شێخ ڕەزای تاڵەبانی

## شرح فارسی و کردی غزل‌های ٥ و ٦
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلەکانی ٥ و ٦

حق: به معنی سزاوار و درست و راست و واجب، هجویری گوید: مراد از حقّ خداوند می‌باشد و آنچه خدا بر خود واجب کرده است، حق گویند. (مصباح الانس، ص ٦١؛ کشف المحجوب، ص ٥٠؛ لمع، ص ٣٣٦)

حەق: بە مانای سزاوار و دروست و راست و واجبە. هوجویری دەڵێ: مراز لە حەق خوداوەندە و ئەوی کە خوداوەند لەسەر خۆی واجبی کردووە، پێی دەڵێن حەق. (مصباح الانس،ص٦١؛کشف المحجوب،ص ٥٠؛لمع،ص ٣٣٦).

نور: نور اسمی است از اسماء الله به حکم «الله نور السموات و الارض» و عبارت از تجلی حق است به اسم ظاهر که مراد وجود عالم ظاهر است در لباس جمیع صور اکوانیه از جسمانیات و روحانیات. (شرح گلشن راز، ص ٥)

مشایخ صوفیه گویند: مراد از نور در آیۀ نور، قلوب عارفین است به توحید حقّ و اناره اسرار محبین است. در کشاف است که نور نزد صوفیان عبارت از وجود حق است به اعتبار ظهور او فی نفسه و اظهار غیر را در علم و عین که «شمس» نامیده می‌شود.

در حدیث است که «اول ما خلق الله نوری» که مرادف با عقل است در کلمات حکما. نور تجلی ذات عبارت از جمیع انوار و اسماء و صفات است که «فاینما تولوا فثم وجه الله». تمام موجودات مرتبتی از انوار حق است. (کشاف، ص١٢٩٤)

و نور حقیقت آن باشد که غیری را روشن کند، هر چه غیری را روشن نکند، آن را نور نگویند، آفتاب نور است، ماهتاب نور است، چراغ نور است، نه به آن معنی که به نفس خود روشنند، لکن به آن معنی که منور غیرند. آینه و آب و امثال آن را نور نگویند، اگر چه به ذات خود روشنند، زیرا که منور غیر نه‌اند. پس بدان معنی که «الله نور السموات والارض» این است که (الله) روشن‌کنندۀ آسمان‌ها و زمین‌ها است و منور ارواح است و تمام انوار از اوست و قوام همه

بدو است، بعضی ظاهر و بعضی باطن.

نوور: نوور ناوێکه له ناوەکانی خوا به حوکمی «الله نور السموات و الارض» و بریتییه له تەجەلیی حەق به ئیسمی زاهیر که مراز و مەبەست وجوودی عالەمی زاهیره له لیباس و جلوبەرگی سووەری ئەکوانییه دا که ئەویش بریتییه له جیسمانیات و ڕووحانیات.(شرح گلشن راز، ص ٥)

مەشایخی سۆفی دەڵێن: مەبەست له وشەی نوور له ئایەتی نوور له قورئانی پیرۆزدا؛ دڵی عارفانه به یەکدانەیی حەق، واته تەوحید و ئاشکرایی و گەشانەوەی ئەو له نهێنییەکانی ئەهلی مەحەببەته. له کتێبی کەشافدا هەیه که نوور له بیروڕای سۆفیاندا بریتییه له وجوودی حەق به ئیعتیباری زوهووری ئەو فیینەفسه و به ئاشکرایی غەیر له عیلم و عەین، واته زانست و دیتن، که "شەمس"ی پێ دەڵێن.

له حەدیسدا هاتووه که «اول ماخلق الله نوری» که لێرەدا نوور واته عەقڵ، له کەلیماتی حوکەمادا نووری تەجەللیی زات عیبارەته له هەمووی ئەنوار و ئەسماء و سیفات که «فأینما تولوا فثـَم وجه الله» هەموو مەوجوودات مەراتبێ له ئەنواری حەقن. (کشاف، ص ١٢٩٤)

نووری حەقیقەت ئەوەیه، که غەیرێک ڕووناک بکاتەوه و هەرچی غەیر ڕوون نەکاتەوه، پێی ناڵێن نوور و ئەوه نوور نییه؛ خۆر نووره، هەتاو نووره، مانگ نووره، چرا نووره، نه بەو مانایەکه بۆخۆیان ڕووناکن، بەڵکو بەو مانایه که ڕوونکەرەوەی غەیرن، به ئاوێنه و ئاو و ئەمسالی ئەوانه ناوترێ نوور. ئەگەرچی بۆخۆیان ڕووناکن، چونکه ڕوونکەرەوه و ڕۆشنایی‌دەری غەیر نین، دەبێ بزانین که مانای ئایەتی «الله نور السموات والارض» ئەمەیه که «الله» ڕوونکەرەوه و ڕۆشنایی‌دەری ئاسمان و زەمینه و ڕووناکی‌دەری ئەڕواحه و هەموو ئەنوار لەوەوەیه و مانەوەی هەمووان بەوه، هەندێکیان زاهیر و هەندێ باتن.

ظِل: ظِل یعنی سایه و موجود اضافی است که ظاهر به تعینات اعیان ممکنه و احکام آنهاست. ظِلال؛ سایەها.

ظل: به مانای سێبەر و مەوجوودی ئیزافییه، که زاهیره به تەعەییوناتی ئەعیانی

مومکینه، واته به ئاشکرا بوونی ئەوەی که له جیهاندا هەستی پێ دەکرێ و به ئەحکامی ئەو شتانه. ظلال: سێبەرەکان.

جمال و جلال: ظاهر کردن کمال معشوق است از جهت استغنای از عاشق و نیز به معنای اولاف لطف و رحمت خداوند است.
شاه نعمت الله گوید: جمال، تجلی حق است به وجه حق برای حق و جمال مطلق را جلال است و این قهاریت جمال است، در هر جمالی، جلالی دارد و در هر جلال او را جمالی است.
جەمال و جەلال: زاهیرکردنی کەمالی مەعشووقه له بارەی بێنیازی له عاشقەوه و هەم به مانای ئەوسافی لوتف و ڕەحمەتی خوداوەنده.
شانیعمەتولای وەلی دەڵێ: جەمال؛ تەجەلیی حەقه به سیمای حەق و بۆ حەق و جەمالی موتڵەق جەلالی هەیه و ئەم جەلاله؛ زاڵبوون و قەهاریەتی جەماله، له هەر جەمالێکدا، جەلالێکی هەیه و له هەر جەلالێ بۆ ئەو جەمالێ هەیه.

... پس وجود حق کجا دارد در آن صحرا محال؛ / مقصود شاعر خطاب به حاکم شرع و قشریان ظاهری است که وجود حقّ جاری است و تو را وجودی نیست که خود را صاحب مسند شریعت می‌دانی.
... که وابوو، وجوودی حەق لەو بیابانەدا چۆنی جێ دەبێتەوە؛ مەبەستی شاعیر ئەهلی زاهیره و دەفەرمووێ کاتێ، که حەق هەیه ناحەق وجوودی نییه که وجوودی حەق بەردەوامه، وجوودێک بۆ تۆ نییه که خۆت به ساحیبی کورسیی شەریعەت دادەنێی.
سفر در وطن: از اصطلاحات نقشبندیان است. آن می‌باشد که سالک در طبیعت بشری سفر کند، یعنی از صفات بشری به صفات ملکی و از صفات ذمیمه به صفات حمیده انتقال فرماید. (رشحات عین الحیات، ص ۲۲)
شیخ احمد سرهندی گوید: این کلمه مبارکه (سفر در وطن) عبارتست از سیر انفسی... (الحدائق الوردیه، ص ۱۱۵)

سەفەر لە وەتەندا: لە ئیستیلاحاتی نەقشەبندیانە و ئەوەیە کە سالیک لە سروشتی
مرۆڤدا سەفەر دەکا، یانی لە سیفاتی بەشەری بەرە و سیفاتی
مەلەکی و لە سیفاتی ناپەسن بەرەو سیفاتی پەسن‌کراو
ئەگوێزێتەوە. (رشحات عین الحیات، ص ٢٢)
شێخ ئەحمەدی سەرهیندی دەڵێ: کەلیمەی موبارەک و پیرۆزی سەفەر لە وەتەندا؛
عیبارەتە لە سەیری ئەنفوسی... (الحدائق
الوردیە، ص ١١٥).

(۷)

معشـــوقه مــا از نظــر غيــر، نهــان اســت

در[1] ديــده عشــاق جگرســـوز عيان  اســت

هــر جــا كه شــدم، پرتو ســيماى تــو ديدم

تاب رخ خورشــيد چه محتاج بيان اســت؟

مســـت مى عشــقت، نكنــد ميل بــه غلمان

تــا صبــح قيامــت به جمالــت نگران اســت

گــر لذتــى از عاشــقى و عشــق بدانــى،

دانســـتنت از همــت صاحب‌نظـران اســت

انديشــه عشــقت، دل هــر كــس نتوانـد،

اوضـــاع خيالــت، دل خونين‌جگران اســت

مصبــــاح دل تيــره بيچــــاره عـــاشــق،

«خالـص» ز شــعــاع نظــر پير مغان اســت

۱ . از

**(٧)**

گـــراویـــی ئـێـمـه لــەبـــەرچـــاوی بـێـگـانـه شــــاراوەیـــە
[بـــەڵام] لـەبـەرچـاوی عاشقانی جـگـەرسـووتـاو، ئاشکرایە
هـەرکـوێـیـەک چـــووم، شـەوقـی ڕوخـــســاری تـــۆم بینی
درەوشانەوەی ڕووی هەتاو چ پێویستییێکی بـە گــــوتن هەیە؟
ئەوکەسەی سەرخۆشی مەیی عیشقی تۆیە، مەیلی غیلمان [ی
بەهەشت] ی نییە و هەتا بەیانیی قیامەت تەماشای جەمالی تۆ دەکا
ئـــەگـــەر چـێـژێـک لـــە عــاشـقــی و عـیـشـق بـکـەیـت،
ئـەو تێگەیشتنەت لـە هیمەتی خـــاوەن نـەزەرانـەوەیـە
بـیری عیشقی تـۆ لـە تـوانـای دڵـی هـەمـووکـەسدا نییە
دۆخی خەیاڵت لە دڵی ئەوانەدایە کـــــە جەرگیان خوێناوییە
ئەی «خالص»! چرای دڵی تاریکی عاشقی بەستەزمان
لـــە تیـــشکی نــــــەزەری پیـــری مـــوغـــانەوەیە

## شرح فارسی و کردی غزل ۷
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۷

معشوقه: حق تعالی را گویند از آن جهت که مستحق دوستی از جمیع وجوه اوست که از جلوات انوار وجودی‌اش تمام موجودات حیران و سرگردانند.
مەعشووقە: بە حەق تەعالا دەڵێن، چونکە ئەوەی لە هەموو بارێکەوە شایانی دۆستییە هەر ئەوە و هەر حەقە کە تەواوی مەوجوودات لە جیلوەی ئەنواری وجوودی ئەو حەیران و سەرگەردانن.

پرتو سیما: روشنی چهره، مقصود شعاع نور جمال خداوندی در همۀ جهان آشکار است.
پەرتەوی سیما: واتە ڕووناکیی ڕوخسار، مەبەست ئەوەیە تیشکی جوانییخوداوەند لە سەرانسەری جیهاندا ئاشکرایە.

غلمان: جمع غلام، مقابل حور، جوانان زیباروی بهشتی، شاعر فرماید؛ (مست می عشقت نکند میل به غلمان) یعنی؛ سالکی که از می عشق تو مست است، سودای بهشت ندارد.
غیلمان: جەمعی غولامە لە بەرانبەری حۆردا دێ و گەنجانی جوانی بەهەشتی مەبەستە، شاعیر دەفەرمووێ؛ (ئەو کەسەی سەرخۆشی مەیی عیشقی تۆیە، مەیلی غیلمان[ی بەهەشتی] نییە) یانی؛ سالیکێ وا لە عیشقی تۆ مەستە، بەهەشتی لە بیر نییە.
نگرانست: نظرکننده مستمر است لحظه‌ای چشم برنمی‌دارد. غافل نمی‌شود. غفلت آفت سلوک است.
نگەرانە: یەک کات و سات و خولەک و ئانیە چاو لە جەماڵت وەرناگێڕێ و غافل نابێ. غەفلەت ئافەتی سولووکە.

همت: توجه قلب است با تمام قوای روحانی به حق و ملتفت نشود الا به حق و راضی نَبُوَد به احوال و مقامات و توقف ننماید به اسماء و صفات و نظر نکند الا به عین ذات و خود را مندک در مقصود و منظور حقیقی داند.
هیمەت: سەرنجی دڵە بە هەموو هێز و توانای ڕووحانی و بە حەق و ئاوڕنەدانەوەیە لە هیچ لایەک مەگەر لە حەق و رازی نەبوونە بە ئەحواڵ و مەقامات و نەوەستانە لە مەراتیبی ئەسماء و سیفاتدا و نوارێنە تەنیا بۆ عەینی زات و خۆ وێران‌کردنە لە مەبەست و مەنزووری حەقیقیدا.

صاحب نظران: آنان که با نظر به کُنه اشیاء آگاه شوند و بر احوال موجودات مطلع گردند، عارف بالله.
ساحیبنەزەر: ئەوەی وا بە نەزەر و سەرنجی قەلبی لە نهێنییەکانی ئەشیا و ئەحواڵی مەوجوودات ئاگادار دەبێ، عارفی بە الله.

خیال: قوۀ درک جزئیات در ورای عالم حس، سه عالم داریم وهم، خیال، حس؛ پس خیال عالمی در بین وهم و حس است. به همین سبب خیال را برزخ و عالم مثال هم گفته‌اند.
خەیاڵ: قووەی دەرکی جوزئیات لە وەرای عالەمی هەست و حیسەوەیە. سێ عالەمی وەهم، خەیاڵ، هەست و حیس هەیە، کە وابێ خەیاڵ عالەمی نێوان وەهم و هەستە و هەر بۆیە بە عالەمی خەیاڵ، عالەمی بەرزەخ و عالەمی میسالیش دەڵێن.

اوضاع: جمع وضع (اصطلاح فلسفی و اصولی) در فلسفه وضع یکی از مقولات نه‌گانۀ عرضی است و آن عبارت از نسبت اجزاء جسمی است به یکدیگر و نسبت همۀ اجزاء به خارج یا حالِ گوهری بود که وی را اجزایی بسیار باشد به ترتیب هر جزوی از وی در سویی از سوی‌ها. (مصنفات، ج ۲، رساله منهاج مبین، ص ٢٦)

ئەوزاع: جەمعی وەزعە (ئیستیلاحی فەلسەفی و ئوسوولی) یە لە فەلسەفەدا. وەزع یەکێ لە نۆ مەقوولەی عەرەزیە و عیبارەتە لە نیسبەتی ئەجزای جیسم بە یەکتری، هەروەها نیسبەتی هەمووی ئەجزاء بە دەرەوەی جیسم و یان حاڵەتی گەوهەرێکی هەیە کە ئەجزای زۆری هەیە و بە تەرتیب هەر جزوێ نیسبەتی هەیە بەلایەکەوە. (مصنفات، ج ۲، رساله منهاج مبین، ص ۲٦)

اوضاع خیال: ارتباط و نسبت اجزاء آنچه از خیال تو در باطن عاشق می‌گذرد.
ئەوزاعی خەیاڵ: پێوەندی و نیسبەتی ئەجزائی خەیاڵی تۆ لەگەڵ ئەوەی لە دەروونی عاشقدا هەیە.

پیر مغان: رهبر کامل روحانی. (کشاف، ص ۹؛ ریاض العارفین، ص ۳۸)
پیر موغان: رێبەری کامیلی ڕووحانی. (کشاف، ص ۹؛ ریاض العارفین، ص ۳۸)

(۸)

**عقــل می‌گوید بــه من هــر دم، که ترک یــار کن!**
**عشــق می‌گوید که هی هی، تــرک این گفتار کن!**
**عقــل می‌گویــد بــرو بــا ســجده و ســجاده باش**
**عشــق می‌گویــد بــرو تســبیح را زنــار کــن**
**عقــل می‌گویــد بپــوش آخــر لبــاس عاقــلان**
**عشــق می‌گویــد کــه تــرک جبّــه و دســتار کن**
**مــن نمی‌دانــم کدامیــن نکتــه را بــاور کنــم**
**ای خـــدایــا! از دلــم تــو کشــف این اســرار کن**
**عقــل می‌گوید چنین و عشــق می‌گوید چنـــان**
**همچو «خالص» در جهان یک نکته را اقرار کن**

**(٨)**

عەقڵ هـەردەم پێم دەڵێت دەست لە یار هەڵگرە
عیشق دەڵـێ ئـۆ ئـۆ! ئـەم قسـانـە نـەکـەی!
عەقڵ دەڵـێ بـڕۆ لـەگـەڵ سـوجـدە و بـەرمـاڵ بە
عیشق پێم دەڵێ بڕۆ تەسبێحەکەت بکە بە زوننار
عەقڵ دەڵـێ ئیتر بـەرگـی عـاقـڵان لـەبـەر بکە
عیشق دەڵـێ دەسـت لە جبە و مێزەر هەڵگرە
نـازانم بـاوەڕ بـە کـام خـاڵـیـان بـکـەم
خـوایە! تۆ ئـەو نهێنییە لە دڵـم ئاشکرا بکە
عـەقـڵ بەمجۆرە دەڵـێ و عیشق بەوجۆرە
وەک «خالص»، لە جیهاندا تەنیا دان بە یەک خاڵ دا بنێ[1]

---

١ . ئەم غەزەلە، لە دەقی دەستنووسدا نەبوو و حەزرەتی شێخ جەمیل پێی‌دام، خستمە ناو دیوانەکەوە. مەحموودی محەمەدی

## شرح فارسی و کردی غزل ۸
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۸

عقل و عشق: دو نیروی مقابل یکدیگرند که در طی تاریخ، عقل که نیروی اندیشه و تفکر شناخته می‌شود از ابزارهای استدلال و در دایرهٔ فلسفه در مباحث مختلف عقلی از سوی علمای عقلی به عنوان اصل قرار داشته است و دیگر عشق که عقل را جزئی و محدود می‌داند و از درک نامحدود ناتوان می‌شمارد و جز از راه شهود که از مراحل تحصیل عشق است، رسیدن به خدا را غیرممکن می‌داند و عقل را سرزنش می‌کند. در شریعت عقل را وسیلهٔ تدوین علم کلام قرار می‌دهند و... این غزل به مقابلهٔ دو نیروی عقل و عشق اشاره دارد.

عەقڵ و عیشق؛ دوو هێزی بەرانبەر بە یەکترن کە بە درێژایی مێژوو عەقڵ کە هێزی بیروڕادەربڕین و بیرکردنەویە و لە پێویستیەکانی دەلیل هاوردنەوەیە و لە باسە جۆراجۆرەکانی عەقڵی لە لایەن عولەمای عەقڵییەوە بە بنەمای سەرەکی ناسراوە، ئەویتر عیشقەکە عەقڵ بەجوزئی بەرتەسک‌کراو دادەنێ، کە بۆ دەرکی کراوەی بێسنوور بە لێنەهاتووی دەزانێ و بێجگە لە ڕێگەی شوهوود، کە لە قۆناغەکانی زانینی عیشقە ، گەیشتن بە خودا بە غەیری مومکین دادەنێ و سەرکۆنەی عەقڵ دەکا، لە شەریعەتدا عەقڵ بە ئامرازی دانانی عیلمی کەلام دادەنێن و... شاعیر لەم غەزەلەدا بەربەرەکانیی ئەم دوو هێزە دردەخا.

(۹)

مسلمانان! چه حال است این؟ ز کار خویش حیرانم
نــه راه شــرع می‌پویــم، نــه کافــر، نه مســلمانم
گهــی در عشــق شــیدایم، گهی مجنون رســوایم
گهــی درویــش بی‌جایــم، گهــی ســلطان دورانم
شــراب عشــق تا خوردم، شــدم کافر بــه بتخانه
ندانــم مذهــب و ملــت، نباشــد هیــچ ســامانم
بــرو زاهــد! مگــو ما را بــه راه شــرع و دیــن باز آ
کــه من مســت می عشــقم، دگر چیــزی نمی‌دانم
ز زهد خشــک سرّپوشــی به کلی گشــته‌ام فارغ
بحمــدالله و المنــه ز خیــل باده‌نوشــانم
مــن اندر کــوه وحــدت می‌زنــم لاف وحیــدی را
چه بیمم از شــه دوران؟ چه باک از خرقه پوشانم!
چو عشــق از پرده ســر بر زد به جان ما علم بر زد
هم او ســلطان بشد در تن هم او شد دین و ایمانم
اگــر کافر شــدم در عشــق و گر عابد بــه راه دین،
ز روز اولــم[1] کــردنــد، نــه من اینم، نــه من آنــم
چو فیض از غوث یارت شدسزد «خالص» تو را هر دم
به عالم فــاش گـــردانی: سگ درگـــاه سلطـــانم

---

۱ . باشد (واو)

## (٩)

مسوڵمانان! ئەمە چ حاڵێکە؟ سەرم لە کاری خۆم سوڕ ماوە
نە بە ڕێبازی شەریعەتدا دەڕۆم، نە کافرم، نە مسوڵمانم
هەندێک جار لە عیشقدا شەیدام، هەندێک جار مەجنوون و ڕیسوام
هەندێک جار دەروێشێکی بێ شوێنم و برێ جار سوڵتانی سەردەمی خۆمم
لەوەتی شەرابی عیشقم خواردۆتەوە، باوەڕم بە بتخانە نەماوە
هیچ مەزهەب و ئایینێک نازانم و هیچ سەر و سامانێکم نییە
زاهید! برۆ و پێم مەڵێ بگەڕێوە سەر ڕێبازی شەرع و ئایین
چونکە من سەرخۆشی مەیی عیشقم و هیچیتر نازانم
من لە عیبادەتی ویشکی ڕواڵەتی بەتەواوەتی دوورکەوتوومەتەوە
سوپاس و منەتباریم بۆ خودا کە لە دەستەی مەینۆشانم
من لەسەر کێوی یەکتایی لافی یەکدانەیی لێ دەدەم
چ ترسێکم لە پادشای سەردەم و چ باکێکم لە خرقە پۆشانە!
کاتێ عیشق لە پەردە هاتەدەر، ئالای لەسەر گیانی ئێمە هەڵدا
ئەو هەم بوو بە پادشای لەش و هەم بوو بە دین و ئیمانم
ئەگەر لە عاشقێتیدا کافر بووم، یان بوومە عابیدی ڕێبازی دین،
لە ڕۆژی یەکەمەوە منیان وا خوڵقاند، دەنا نە ئەمیانم نە ئەویانم
«خالص»! ئەگەر فەیزی غەوس بوو بە یارت، جێی خۆیەتی هەردەم
لە عـالەمدا ئاشکرای بکەی و [بلێی:] من سەگی بەر دەرگای سوڵتانم

## شرح فارسی و کردی غزل ۹
### شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۹

حیران: صفت و به معنی سرگشته و سرگردان، و حیرت مصدر است به معنی سرگشته شدن و سرگردان شدن، در اصطلاح اهل عرفان یکی از مراحل سلوک است که عارف خود را سرگشته می‌یابد و امری است که وارد می‌شود بر قلوب عارفین در مواقع تأمل و حضور و تفکر آنها که تأمل و تفکر حاجب آنها می‌شود، انسان، در گرو و مرهون است در عوض آنچه آفریده شده است که عبودیت باشد و غافلند از آن و در حیرت عبودیت زیست می‌کنند و کسی که بخواهد که بشناسد آنچه را، در گرو اوست می‌سوزد و کسی که طلب علم رها نکند می‌سوزد و در حیرت باقی می‌ماند، زیرا این علم بی‌نهایت می‌شود. حیرت اول زندقه است که موجب غفلت از خداست و زندقه هم غفلت از خداست و حیرت دوم که در علم است غیبت از خلق است و چون این حیرت در علم است و علم از جهتی وسوسه شیطان است، قذر و نجس و کفر است و حیرت سوم وسوسه است که متحیر را به ضلالت و غفلت می‌کشد و علم، تحیر و سرگردانی در عبودیت است پس سالک نباید درصدد طلب علم به آفریننده باشد که وسوسه است و درصدد معرفت حقیقت آن برآید که بسوزد و بی‌خبر از راه و حیران و واله گردد و گفته شده است که غفلت از دانایی‌های حیرت است و اگر از غفلت خود و از خودیت خود غافل شود، بهتت است. بالجمله دهشت عبارت از غرق شدن در بحر هستی حقایق است و حیرت حالتی است برای دهشت و مقدم بر دهشت است و بهتت که خود هم غافل شدن است، قطع شدن حیرت است و سقوط دهشت.

حەیران: سیفەتە واتە سەرسام، سەرگەردان، حەیرەت مەسدەرە بە مانای سەرگەردانی و سەرسام بوون لە ئیستیلاحی ئەهلی عیرفاندا یەکێ لە قۆناغەکانی سلووکە، کە عارف خۆی سەرسام دەبینێ و ئەمرێکە کە دێتە سەر دڵی عارفان لە کاتی تەئەموڵ و حوزوور و تەفەکوردا (ئەم سێ حاڵەتە ئیستیلاحی عیرفانین) کە تەئەموڵ و تەفەککور دەبێ بە پەردەی بەینی سالیک و خالیق.

ئینسان؛ له گرەو و بارمتەدایه له بەرانبەری ئەوەدا کە بۆی خولقێندراوە کە عەبدبوون و بەندەگییە و لە و غافڵە و لەسەرسامی و بەندەییدا دەژی و کەسێ بیەوێ کە بناسێ ئەوی وا بۆی بووە بە بارمتە و لە گرەوی‌دایە دەسووتێ و کەسێ بە شوێنی زانینی عیلم و زانستی خوداوەندا بێ دەسووتێ و سەرسام دەبێ لەبەرئەوەی عیلمی خوداوەند بێ‌نیهایەتە؛ حەیرەت و سەرسامی لە پلەی یەکەمدا کوفرە کە دەبێتە هۆی غافڵ بوون لە خودا، حەیرەت و سەرسامیی دووەم؛ کە نیسبەت بە عیلم و زانستی خوداوەندە، نیهان‌بوون لە خەڵکە و لەبەرئەوەی ئەم حەیرەتە سەرچاوەی لە عیلم و زانستدایە، وەسوەسەی شەیتانە و پیسە و کوفرە، حەیرەت و سەرسامیی سێیەم؛ وەسوەسەیە کە مرۆڤی سەرسام بەڕێگەی زەلالەت و غەفلەتدا دەبا و زانست، هۆی سەرسامی و سەرگەردانییە لە بەندەیی خوداوەندا هەر بۆیە سالیک نابێ بە شۆینی زانست و زانین سەبارەت بەزاتی خوداوەندەوە بێت، کە وەسوەسەیە و دەبێ بە شوینی زانینی حەقیقەتی ئەوەوە بێت کە دەسووتێ و بێ‌خەبەر لە ڕێگەو حەیران و شێت دەبێ. گوتراوە کە غافڵ بوون لە زانین و ناسینی زاتیی خوداوەند یەکێ لە ئاگاداریەکانی حەیرەت و سەرسام بوونە، ئەگەر لە بیربردنەوی خۆی و لە خۆبوونی خۆی غافڵ بێ، پلەی سەرسامی و بێ‌کەلامیە. پوختەکەی ئەوەیە کە حەیرانی و سەرسامی بریتییە لە غەرق بوون لە دەریای حەقایقدا، سەرسامی و حەیرانی حاڵەتێکە بۆ دەهشەت و لە بەرئەوە دەهشەتە و سەرسامی و بێ‌کەلامی کەخۆی غافڵ بوونە، بڕین و جیاکردنەوەی سەرسامییە و داکەوتن و درووژانی پلەی دەهشەتە و گەیشتن بە ئامانجی عارفان کە مەبەستی شاعیر لەم غەزەلەدا ئەمەیە کە ئەم پلە و پایەی عیرفانیە و قۆناغی سلوکییەی تێپەڕاندوە.

(۱۰)

الا، ای بلبـل مشـتاق دیـدار!
مبـادا دوریـت از وصـل دلـدار!
دلـت پرعیـش و ذوقـت با فـرح باد!
که، سـوزت، عاشـقان را کـرد بیدار
به کوی عشـق، های و هوی مسـتان
کنـد صاحـب‌دلان آگـه ز اسـرار
مغنـی را چـه بـود انـدر ترانـه؟
که عاشق مست گشت و مست، هشیار
شـرابی را که سـاقی ریخـت در جام
دو عالـم شـد از آن سرمسـت خمار[۱]
جمالـی بـا هـزاران نقـش پرشـور،
تجلـی کـرده در صحـرا و بـازار
یکـی از عشـق در صحـرا فتـاده
یکـی گشـته بـه بـازارش، خـریدار
چـو «خـالـص» مهـر او در ذره یابد،
ز مهـرش، مهـر زد بر لب، چـو دیوار

۱ . باشد (میم)

**(١٠)**

ئـــــەرێ ئـــــەی بـــولبولی هـــۆگـــری دیـــدار
هەرگیز لـــە وەســـڵی دڵـــدار دوور نەکەویتەوە!
دڵت پڕ بێ لە خۆشـــی و زەوقت پڕ لە شادی بێ
لەبەر ئەوەی سۆزی تۆ بوو عاشقانی لە خەو هەستاند
لە گەڕەکی عیشـــقدا، هەیتوهووتی سەرخۆشان
خـــاوەن‌دڵان لـــە نهێنییەکان ئـــاگادار دەکاتەوە
داخۆ گـــۆرانیبێژ چـــی لە گۆرانییەکەیدا هەبوو
کە عاشق پێی‌مەست بوو و سەرخۆش پێی وشیار؟
ئـــەو شـــەرابەی وا ســـاقی لـــە جـــامـــی کرد،
هەردوو عالەم پێی سەرخۆشی مەیفرۆشەکە بوون
ڕوخســـارێک بە هەزاران نەخشـــی پڕ شـــۆرەوە
لـــە بیابـــان و بـــــازاڕدا دەرکـــــەوتـــوە
یـــەک لە عیشـــقی [ئـــەو] دا کەوتۆتـــە بیابان و
یـــــەک لـــە بـــــــازاڕدا بـــۆتـــە کڕیـــــاری
«خالص» کـــــاتێ هەتـــــاوی ئـــەوی لەنـــاو زەڕەدا بینی،
لە خۆشەویستیی ئەودا، وەک دیوار مۆری بێدەنگیی لەسەر لێوی خۆیدا»

## شرح فارسی و کردی غزل ۱۰
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۱۰

بلبل: مقصود عاشق است و عشق خمیرمایهٔ اصلی عرفان.
بولبول: مەبەست عاشقە، عیشق هەوێنی سەرەکیی عیرفانە.

مغنی: نوازندهٔ چیره‌دست که یاریگر سالک در ذکر جهری و سلوک عملی است.
موغەننی: ژەنیاری بەتوانا، کە یاریدەری سالیکە لە کاتی زیکری جەهری و سولووکی عەمەلیدا

ترانه: سخنی موزون که خواننده یا قوّال در بزم درویشان با صدای خوش بخواند و تأثیر آن سالک را در رسیدن به مستی معنوی یاری دهد.
تەرانە: کەلامێ کە کێشی هەیە و دەنگبێژەکان لە بەزمی دەروێشاندا دەیخوێنن، کە کاریگەریی لەسەر سالیک بۆگەیشتن بە مەستیی مەعنەوی هەیە.

خمّار: می‌فروش، باده‌فروش در اصطلاح متصوفه، پیر کامل، مرشد واصل. مقصود در اینجا حضرت حق است.
خەممار: مەیفرۆش، بادەفرۆش لە ئیستیلاحی موتەسەوفەدا پیری کامیل مورشیدی واسیلە، مەبەست لێرەدا حەزرەتی حەقە.

تجلی: روشن‌شدن، جلوه‌گر شدن، هویدا شدن، نمایان شدن، در اصطلاح عارفان، نور مکاشفه که از باریتعالی بر دل عارف ظاهر شود. تابش انوار حق در دل سالک پس از پیمودن مراحل سلوک و وصول به مقام فنا فی الله و نیز کنایه از تجلی نور باریتعالی بر کوه طور که حضرت موسی از آن مدهوش گشت.
تەجەللی: ڕووناکبوون، پەیابوون و دەرکەوتن، لە ئیستیلاحی عارفاندا، نووری موکاشەفەیە، کە لە لایەن باریتەعالاوە بۆ دڵی عارف دەردەکەوێ، تیشکی ئەنواری حەق لە دڵی سالیکدا لە دوای تێپەڕاندنی قۆناغی سلووک و

گەیشتن بە مەقامی فەنا فیللایە و کینایەیە لە تەجەلیی نووری باریتەعالا لەسەر کێویتوور، کە حەزرەتی مووسا (د) لە و تەجەللیە مەدهۆش بوو.

مُهر: نشانه کردن و کسوت مطلق در عرفان آگهی از رازهای نهانی و عالم غیب، شاعر حضرت خالص از ورود خود به این مرحله سخن می‌گوید. مولوی گوید: هر که را اسرار غیب آموختند/ مُهر کردند و دهانش دوختند

موهر: نیشانەکردن، شەقڵکردنی خەرمان و بێدەنگیی تەمام، لە عیرفاندا ئاگاداری رازە نادیارەکان، شاعیر حەزرەتی خالص باس لە گەیشتنی خۆی بەم قۆناغە دەکا، مەولەوی دەڵێ: ئەسراری نهێنییان فێری هەر کەس کرد، مۆریان کرد و دەمیان دووری.

(۱۱)

ای نور رخت در دل هر ذره هویدا!
دیدار تو دیده همه جا دیدهٔ بینا
پیدائی تو در همه پیدا و عیان است
پیدا نشود در[1] نظر دیدهٔ اعمی،[2]
دریای محیطت چو زده موج به عالم،
ظاهر شده در چشم دویی صورت صحرا
خورشید یکی، تاب یکی، لیک ز جلوه
تابش شده با رنگ ز بیرنگی بینا
حسنی‌است نهاده‌است به هر حسن ملاحت
رویی است، به هر روی گشاده است تجلا
ناظر شده از دیدهٔ مجنون نگران است
منظور شد از حسنِ جمال و رخ لیلی[3]
این قطره و موجی که مسمی است به «عالم»
در پیش حقیقت نبود جز دل دریا
هر کثرت دوری که ز آخر شده اول
از اولی و آخر واحد شده یکتا
"خالص"! بزن از صیقل عشق از مدد پیر
مرآت دلت را، که شود مظهر مولا

---

۱. بر
۲ . با (یا) ممدوده خوانده شود: اعما
۳ . به صورت «لیلا» خوانده شود.

**(١١)**

ئەی ئەوکەسەی نووری ڕوخسارت لە نێو هەموو زەڕڕەیەکدا دیارە
چاوی بینا لە هەموو شوێنێک دیداری تۆی بینیوە
دەرکەوتنی تۆ بۆ هەمووان، دیار و ئاشکرایە
[بەڵام] لەبەرچاوی مرۆڤی کوێر دەرناکەوێ
دەریای موحیتی تۆ کە شەپۆلی لە عالەم داوە
ڕوخساری بیابان لە چاوی دوویدا دەرکەوتووە
هەتاو یەکە و تیشکدانەوە یەک، بەڵام لە دەرکەوتندا
تیشکدانەوە ڕەنگی لە بێڕەنگیی بینەر، وەرگرتووە
جوانییەکە، کە خوێن شیرینیی خستۆتە هەموو جوانییەکەوە
ڕوخسارێکە درەوشانەوەی بە هەموو ڕوخسارێک بەخشیوە
بووەتە بینەر لە چاوی مەجنوونەوە دەبینێ
لە جوانی و ڕازاوەیی ڕوخساری لەیلاوە بووەتە بینراو
ئەو دڵۆپ و شەپۆلە کە پێی دەگوترێ عالەم
لەبەردەمی حەقیقەتدا هیچ نییە جگە لە دڵی دەریا
هەر زۆرییەکی دەور کە لە کۆتاییەوە بۆتە سەرەتا،
لەسەرەتا و کۆتاییەکەوە بۆتە یەکتا[1]
ئەی «خالص»! بە مەدەدی پیر، ئاوێنەی
دڵت بە عیشق مشتومال بکە تا ببێتە نوێنگەی[2] مەولا

---

١ . یەکتا (خودا)

٢ . شوێنی دەرکەوتن

## شرح فارسی و کردی غزل ۱۱
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۱۱

دریای محیط: دریا یعنی هستی، وجود را دریا گویند و گاهی به هستی مضاف گردانند و گویند. دریای هستی، محیط: اقیانوس احاطه‌کننده، فراگیرنده، خطی که دور دایره را فرا گیرد. دریای محیطت: هستی وجود لایتناهی حق مقصود است که در همه جا پیداست و دوبین و احول با وجود دریا، صحرای برهوت‌را می‌بیند.

دەریای موحیت: دەریا یانی ئەوەکە هەیە، هەستی، وجوود و گاهێ ئیزافەی دەکەن و دەڵێن دەریای هەستی، موحیت. ئوقیانووس، ئابلووقەدەری بێسنوور، خەتێ کە دەوری بازنە دادەگرێ، دەریای موحیت، هەستی وجوودی بێسنووری حەق‌تەعالایە کە لە هەموو جێگایێک هەیە بەڵام چاوی ناڕاست و لار لەگەڵ دەریای وجووددا، بیابانی بێئاو دەبینێ.

**خورشید یکی، تاب یکی، لیک ز جلوه**
**تابش شده با رنگ ز بیرنگی بینا**

شاعر گوید: خورشید و تابش او یگانه هستند اما در جلوه‌گری تابش خورشید از بیرنگ بودنِ بینا که حق باشد رنگ‌ها ایجاد کرده است، مقصود وحدت در مبدأ و کثرت در مقصد جهان است.

هەتاو یەکەو تیشکدانەوە یەک، بەڵام لە دەرکەوتندا
تیشکدانەوە ڕەنگی لە بێڕەنگیی بینەر، وەرگرتووە

شاعیر دەڵێ: هەتاو و تیشکدانەوەی ئەو یەکن، بەڵام لە جیلوەگەریدا، تیشکدانەوەی هەتاو لە بێڕەنگیی بیناوە کە مەبەست حەقە ڕەنگەکانی خوڵقاندوون، مەبەست وەحدەت لە مەبدەء و کەسرەت لە مەقسەدی جیهاندایە.

**این قطره موجی که مسمی است به عالم**
**در پیش حقیقت نبود جز دل دریا**

مقصود این که عالم جایگاه عشق است، دل هستی است و مرکز دایرهٔ وجود است.

ئــەو دڵــۆپ و شــەپۆلە کــە پێــی دەگوتــرێ عالــەم
لە بەردەمــی حەقیقەتدا هیچ نییە جگــە لە دڵی دەریا

مەبەست ئەوەیە کە عالەم جێگای عیشقە، دڵی وجوود و هەستییە و مەرکەزی بازنەی وجوودە.

**هــر کثــرت دَوْری کــه ز آخــر شــده اول**
**از اولــی و آخـــــرِ واحـــد شــده یکتـــــا**

در محیط دایره هستی آغاز و انجام در یکجا به هم متصل می‌شود و تشکیل واحد می‌دهد، زیرا در چرخش دایره، دوایر متعدد ترسیم می‌شود و به چشم می‌آید، اما در نهایت چه در ترسیم و چه در چرخش دایره واحد است.

هــەر زۆرییەکی دەور کە لــە کۆتاییەوە بۆتە ســەرەتا،
لــە ســەرەتــا و کۆتــایــی تــاکــەوە بۆتــە یەکتــا

لە موحیتی بازنەی هەستی سەرەتا و کۆتایی لە خاڵێکدا بە یەک دەگەن و دەبن بە یەک، چونکە لە خولانەوەی بازنەدا، بازنەیەکی زۆر پێک دێ و دەردەکەوێ و بەچاو دەبینرێت، بەڵام لە کۆتاییدا، چ لە حاڵەتی خولانەوە و چ لە پێکهاتندا بازنە یەکدانەیە.

**(خالــص) بــزن از صیقــل عشــق از مــدد پیــر**
**مــــرآت دلــت را کــه شــود مظـــهــر مــولا**

مدد پیر، مقصود پیر گیلانی حضرت عبدالقادر است. مولا: انسان کامل و مخصوص مولا علی (ع) است، شاعر خود را در مرتبهٔ مظهریت قرار می‌دهد که ذرهٔ انسان کامل در آینهٔ دل او که از صیقل عشق شفاف گردیده، منعکس گردد.

ئـــەی «خالص»! بـــە مـــەدەدی پـــیر، ئاوێنەی
دڵت بە عیشق مشتوومال بدە تا ببێتە نوێنگەی مەولا

مەدەدی پیر، مەبەست لە پیر، پیری گەیلانی حەزرەتی عەبدولقادرە، مەولا، ئینسانی کامیل بە تایبەت مەولا عەلی (ع) مەبەستە، شاعیر خۆی لە مەرتەبەی مەزهەریەتدا دەبینێ کە زەڕەی ئینسانی کامیل لە ئاوێنەی دڵیدا لە بریقەی ئەشق شەفاف بووە و ڕووناکیی تێکەوتووە، تا بە هۆی زەڕەی ئینسانی کامیل شەوق بداتەوە.

**(۱۲)**

**نیست به جز شــاه عشق، صدرنشین صدور**
**در دل هــر ذره‌ای کــرده جمالــش ظهــور**
**هر که ز خود گم نشــد لذت عشــقت نیافت**
**ز آنکــه...[1] دوئــی، هســت ز قــرب تــو دور**
**پرتو حســن تو را با همه کس جلوه‌ای است**
**در همه عالم فکند شــادی و ســور و ســرور**
**بــادۀ لعــل لبــت خاطــر آن کــس چشــید،**
**غــاب بســکر الهوی فیــک و فــرط الحضور**
**این، ره یکتایی اســت؛ دور شو از خویشتن!**
**مــی نکنــد انــدر او پــای دوتایــی، عبــور**
**تــا مــی لعــل لبــت ســاقی عشــقم بــداد،**
**دل نکنــد آرزو جانــب جنــات و حــور**
**در حــرم جــان و دل هاتــف عشــقم بگفت**
**لیــس ســوی نــوره لاح بــه الکــون نـــور**
**تــا زده بــر تــور دل، پرتــو انــوار یــار**
**«خالص» جان باخته سوخته شد همچو طور**

---

۱. کێشی شیعره‌که ناته‌واوه و ده‌بێ وشه‌یه‌ک پێش، یان دوای «دوئی» که‌وتبێت.

**(١٢)**

جگە لە پادشای عیشق، کەس لە لای سەرەوەی دڵان دانەنیشتوە
جەمالی ئەو لە دڵی هەموو زەڕڕەیەکدا دەرکەوتوە
هەرکەسێک کە لە خۆی ون نەبوو، چێژی عیشقی تۆی نەچەشت
لەبەرئەوەی دوویی لە نزیکـــایەتیی تـــۆوە دوورە
شەوقی جوانیی تۆ لە هەرکەسدا بە شێوەیەک دەردەکەوێت
شادی و جەژن و خۆشیی خستە هەموو عالەمەوە
خاتری ئەو کەسە شەرابی لەعلی لێوی تۆی چەشت،
کە بە مەستیی عیشق و ئامادەیی زۆر لە تۆدا ون بووبێ!
ئەمە ڕێبازی یەکتـــاییە، کەوابوو لە خـــۆت جیا بەرەوە!
لاقـــی «دوویەتی» بەلای ئەودا تێپەڕ نـــابێت
لە وەتی ساقـــی عیشق شەرابی لەعلی لێوتی پێداوم
دڵـــم ئارەزووی بـەهەشت و حـــۆری نـــاکات
پەیامهێنەری عیشق لە حەرەمی گیان و دڵدا پێی گوتم
جـگە لە نووری ئەو نوورێک نییە جیهانی پێ ڕوون بووبێتەوە...[١]

لە وەتی شەوقی نووری یار لە تۆڕی دڵی داوە،
«خالص»ی گیـــان دۆڕاو، وەک کێوی تـــوور سووتـــاوە

١. لیس سوی نوره، لاح به الکون نور

## **شرح فارسی و کردی غزل ۱۲**
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۱۲

در دل هر ذره‌ای کرده جمالش ظهور:

شاعر در هر ذره‌ای جمال خداوند را می‌بیند هاتف اصفهانی شاعر وحدت وجودی نیز می‌گوید، دل هر ذره‌ای که بشکافی آفتابیش در میان بینی...

جەمالی ئەو لە نێو هەموو زەڕەیەکدا دەرکەوتوە

شاعیر لە دڵی هەموو زەڕەیەکدا خوداوەند دەبینێ. هاتفی ئیسفەهانی شاعیری ئەهلی وەحدەتی وجوود دەڵێ؛ دڵی هە زەڕەیەک بکەیتەوە هەتاوێکی تێدا دەبینی.

هر که ز خود گم نشد لذت عشقت نیافت:

ترک خود گفتن یکی از اصول سلوک است و هر کس این مرحله را طی نکند به مرتبهٔ عشق نمی‌رسد. عارفان گویند؛ از خود گذشتن و به او رسیدن شرط سالک است.

هەر کەسێک کە خۆی لێ ون نەبوو، چێژی عیشقی تۆی نەچەشت،

خۆ لە بیربردنەوە یەکێ لە بنەماکانی سلووکە و هەرکەس ئەم قۆناغە تێپەڕنەکا بە مەرتەبەی عیشق ناگا، عارفان دەڵێن لە خۆ تێپەڕین و بەو گەیشتن مەرجی سالیکە.

پرتو حُسن تو را با همه کس جلوه‌ای است.

حُسن خداوند در اصل یک حسن واحد است اما هر کس جلوه‌ای ویژه از او می‌بیند و به تعداد موجودات جهان جلوهٔ حق وجود دارد.

شەوقی جوانیی تۆ بۆ هەرکەس بە شێوەیەک دەردەکەوێت

حوسنی خوداوەند لە بنەمادا، حوسنی یەکدانەیە، بەڵام هەرکەس شەوق و جیلوەیێکی تایبەت لەو دەبینێ و بە ئەندازەی هەموو مەوجووداتی جیهان جیلوەی حەق وجوودی هەیە.

(۱۳)

ایـــن مقام و منزل مـــاه بـــروج اولـــیـــا است
لامـــع از انـــوار شمس قـــدرت ذات خـــدا است
همچو عیسی، گر مؤید خوانیش با روح قدس،
دور نبود آن که او محییِ[۱] دین مصطفی است
در شـــب تـــاریـــک امـــکـــان ســـوی انـــــوار قدم
سالکان را پرتو انـــوار او منهج نما است
مـــاه حکمش تا ابـــد ایمن بـــود از انکساف[۲]
زانکه روشن ز آفتاب خاصهٔ خیرالوری[۳] است
باز[٤] دست قدرت است و قوتش از قادر است
عالم‌اندر چنگلش[٥] چون‌صعوهٔ بی‌پرُو پا است
تاکه از بـــرج ولایـــت مهر او آمـــد بـــرون،
ماه کشف هر ولی در پرتوش کم از سها است
چـــون کراماتش ز سر حد تواتر درگذشت؛
هر که انکارش کند چون منکران انبیا است
در ره فـــرمـــان او خـــاقـــان کمینه بنده‌ای
بر در احسان او قیصر حقیر و بینوا است
خوان جودش منبسط گردیده بر هر مستمند
بـــارگـــاه همت او ملجأ شـــاه و گـــدا است
تـــاب بـــر نـــور تـــجـــلای جـــلالـــی، کـــس نبرد
جز روان او که تأییدش ز فیض مصطفی است
روزه‌بـــــودن در رضیعی بـــر علو شـــأن او،
پیش اربـــاب خـــرد بسیار برهان ضیا است
پادشـــاها! فیض لطفـــت در دل «خـــــالص» بریز
هر چه هست،از بندگان خاص درگاه شما است

---

[۱]. باتشدید یاء دوم.
[۲]. انخساف.
[۳]. خیرالورا
[٤]. با کسر «زاء» خوانده شود
[٥]. چنگلش
[٦]. با تشدید «راء»

(۱۳)

ئـەوە مەقــام و مـــەنزڵی مانگی بـــورجی ئەولیـــایە
و لە نووری هەتاوی دەسەڵاتی زاتی خوداوە دەدرەوشێتەوە
ئەگەر بڵێی وەک عیسا یارمەتیی رۆحولقودوسی لە پشتە،
دوور نییە، بۆ ئەوکەسەی زیندووکەرەوەی ئایینی مستەفایە
شــەوقــی ئــیرشــادی ئــەو لــە شــەوی تاریکی ئیمکاندا
ڕێ پیشاندەری ڕێگای سالیکانە بەرەو نووری هەوەڵین
مانگی حوکم و فەرمانی ئەو هەتا هەتایە شارانەوەی نابێ،
چونکە ڕووناکی لە هەتاوی تایبەتی خەیرولوەرا[1] وەردەگرێ
ئەو «باز»ی دەستی خودایە و هێزی لە لای قادری تواناوەیە
عـالـەم لـە چنگیدا وەک چۆلەکەی بـێ پـەڕ و پێیە
لە وەتی هەتاوی ئەو لە بورجی ویلایەت هـاتۆتە دەر،
مــانــگــی کــەشــفــی هـــەمـــوو وەلـــیـــیـــەک لــەبــەر
تیشکی ئــەو وەک ئـەسـتـێـرەی سـوهـا کــەمنــوورە
لەبەر ئەوەی [هەواڵی] کەراماتی لە ڕادەی «تەواتور»[2] تێپەڕ بووە،
هەرکەس ئینکاری ئەو بکات وەک مونکیری پێغەمبەران بێ وایە
لە ڕێگەی فەرمانی ئــەودا خاقان نۆکەرێکی بێ نرخە
لەبەر دەرگــای ئیحسانی ئەو، قەیسەر بچووک و هەژارە
ســفــرەی بەخششی ئــەو بــۆ هــەر هــەژارێــک کــراوەیــە
بـــارەگـــای هـیـمـەتی ئــەو پــەنـاگــەی شـا و گـەدایـە
کەس تاقەتی دەرکەوتنی نووری تەجەللا [خودا]ی نەبوو
جگە لـە ڕۆحـــی ئـەو کـە بـە فـەیـزی مستەفا پشتقایمە
ڕۆژووگــرتــن لە شیرەخۆریدا لە لای خــاوەن عەقــڵان
بەڵگەیەکی ڕوونـــاکە بـــۆ بـەرزیی پـــلە و پایەی ئەو
ئەی پادشـــا! فــــەیزی لوتــفت بــڕژێنە دڵی «خالص»ەوە
هەرکەسێک بێت، یەکێکە لە کۆیلە تایبەتەکانی دەرگانەی تۆ

١ . خیرالوری

٢. هەواڵێک کە لە زمان زۆر کەسەوە دەبیسترێت

## شرح فارسی و کردی غزل ۱۳
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۱۳

**ایـــــن مقـــام و منـــزل مـاه بـــروج اولیاسـت**
**لامــــــع از انوار شـــمس قـــدرت ذات خـــداسـت**
**همچو عیســی گـــر مؤیــد خوانیش بـــا روح قدس**
**دور نبـــود زانکـــه او محیـــی دیـــن مصطفی اســت**

حضرت شیخ عبدالرحمن این غزل را برای حضرت شیخ عبدالقادر گیلانی (غوث اعظم) سروده است. شاید در زمان سرودن در بارگاه و مقبرهٔ حضرت گیلانی بوده که اشاره به مقام و منزلت او دارد. تشبیه حضرت گیلانی به ماه مقصود این که بقیهٔ اولیاء ستارگان محضر او هستند و تشبیه قدرت ذات خدا به شمس که شیوهٔ اهل عرفان است این که ماهِ وجود حضرت گیلانی از تابش نور قدرت ذات خداوند تابان است و کسب نور می‌کند. حضرت عیسی مسیح نیز در آسمان چهارم مقام دارد. بدین ترتیب منظور شاعر آسمانی بودن حضرت گیلانی است.

روح قدس: در نزد عارفان نَفَس رحمانی و در اصطلاح فلسفی و کلامی آنچه را فلاسفه جوهر عقلی نامیده‌اند، الهیون روح القدس می‌نامند. (طبقات، ص ۱۰۰۰؛ اسفار، ج ٤، ص ۸۹، ١٦٦، ۷۹، ۱۰۷ و ج ۱، ص ۷۲) و اشاره به جبرئیل است.
محیی: اشاره به لقب محیی‌الدین منسوب به حضرت گیلانی.

ئـەوە مەقـام و مـەنزڵی مانگی بـورجی ئەولیـایە و لە نووری هەتاوی دەسەڵاتی زاتی خوداوە دەدرەوشێتەوە. ئەگەر بڵێی وەک عیسا یارمەتیی ڕۆحولقودوسی لە پشتە، دوور نییە، بۆ ئەو کەسەی زیندووکەرەوەی ئاینی مستەفایە

حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمان ئەم غەزەلەی بۆ حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (غەوسی ئەعزەم) هۆنیوەتەوە، دوور نییە لە کاتی هۆنینەوەی ئەو غەزەلەدا، لە مەرقەدی حەزرەتی گەیلانی بووبێ کە ئیشارە بە مەقام و مەنزلی ئەو دەکا، مەبەست لە تەشبیهی حەزرەتی گەیلانی بەمانگ ئەوەیە کە ئەولیاکانی دی لەبەرابەر گەورەیی ئەودا ئەستێرەن و تەشبیهی قودرەتی زاتی خودا بە هەتاو کە شێوەی ئەهلی عیرفانە ئەمەیە کە مانگی وجوودی حەزرەتی گەیلانی لە تیشکی نووری دەسەڵاتی زاتی خوداوەندەوە ئەدرەوشێتەوە و کەسبی نوور دەکا، حەزرەتی عیسای مەسیحیش لە ئاسمانی چوارەمە، بەم تەرتیبە مەبەستی شاعیر ئاسمانی بوونی حەزرەتی گەیلانیە.

ڕووحولقودوس: لە لای عارفان بە نەفەسی ڕەحمانی ئەژمێردرێ و لە ئیستیلاحی
فەلسەفە و کەلامیدا بەوەی کە فەلاسیفە جەوهەری عەقڵی پێ دەڵێن
و ئیلاهیون ڕووحولقودوسی پێدەڵێن کە ئیشارە بە حەزرەتی جبرەئیلە.
(طبقات، ص ۱۰۰۰؛ اسفار، ج ٤، ص ۸۹، ۱٦٦، ۷۹، ۱۰۷ و ج ۱، ص۷۲)
موحیی: ئیشارە بە نازناوی محێدین کە دراوەتە پاڵ حەزرەتی گەیلانی.

شب تاریک امکان: ظلمات این جهان و حجاب‌های بین جان و جانان.
شەوی تاریکی ئیمکان: زوڵماتی ئەم جیهانە و ئەو پەردانە کە لە بەینی گیانی (مرۆڤ)
و گیانان واتە (خوداوەند) دان.

انوار قِدَم: نورهای ازلی.
ئەنواری قِدەم: نوورە ئەزەلییەکان.

**مـــاه حکمـش تـا ابـد ایمـن بـود از انکسـاف**
**زانکـه روشـن ز آفتـاب خاصـۀ خیرالوری‌اسـت**

خیر الوری: مقصود پیامبر اسلام است(ص)
اشاره به این بیت است

**اَفَــلَــتْ شـمــوسُ الاَوَّلــيـــنَ و شمسُنَا**
**اَبـــَـــداً على فلک العُلى لاتَــغْــرُبُ**

یعنی آفتاب دیگران غروب کرد، اما خورشید ما جاودانه تابناک خواهد بود.

مانگی حوکم و فەرمانی ئەو هەتا هەتایە شارانەوەی نابێ لەبەر ئەوەی ڕووناکی لە هەتاوی تایبەتی خەیرولوەرا وەردەگرێ خەیرولوەرا = مەبەست پێغەمبەری ئیسلامە (د) ئاماژە بەم بەیتەیە:

**افــلــت شـــمــوس الاولـــيـــن و شمسنا**
**ابـــــداً على فلک الـعُـلـى لاتغـرب**

یانی، هەتاوی ئەوانیتر ئاوا دەبێت و دەڕوا. بەڵام هەتاوی ئێمە نەمرانە هەر دەدرەوشێتەوە.

بازِ دستِ قدرت است.

اشاره به لقب "باز الله" منسوب به حضرت گیلانی که مربوط به یکی از کرامات اوست.

بازی دەستی قودرەت و دەسەڵاتی خودا...

ئیشارە بە نازناوی "بازەڵا" کە دراوتە پاڵی حەزرەتی گەیلانی و دەگەرێتەوە بۆ یەکێ لە کەراماتی ئەو حەزرەتە.

تا که از برج ولایت مهر او آمد برون...

خورشید او از برج ولایت طلوع کرد، چون خورشید طلوع می‌کند، ماه و ستارگان ناپدید می‌شوند. زیرا او واسطهٔ فی الکل است.

لە وەختێ هەتاوی ئەو لە بورجی ویلایەت هاتۆتە دەر...

مەبەستی شاعیر ئەوەیە کە کاتێ هەتاو دەردەکەوێ، مانگ و ئەستێرە ون دەبن، بۆ ئەوەی حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی واسیتە و سۆنگەیە بۆ هەمووان.

چون کراماتش ز سر حد تواتر درگذشت...

کرامات حضرت گیلانی پس از هزار سال که از زمان حیاتش می‌گذرد و هنوز بر زبان‌ها جاری و متواتر است و کتاب‌ها دربارهٔ کراماتش تألیف شده است و از این

لحاظ در بین عارفان شاخص است.

لەبەر ئەوەی [هەواڵی] کەراماتی لە رادەی تەواتور تێپەڕ بووە...

کەراماتی حەزرەتی گەیلانی لە دوای هەزار ساڵ کە لە ژیانی تێپەڕبووە، ئێستاش هەر لە سەر زار و زمانی خەڵکە، یانی بەردەوامە و کتێب و ریسالەی زۆری لە سەر نووسراوە و لەم بابەتەوە لە زنجیرەی عارفاندا بەناوبانگ و ناسراوە.

نور تجلی جلالی...

نور تجلی جلالی زمانی که حضرت حق به عظمت و قدرت و کبریا و جبروت تجلی نماید و کائنات توان دریافت تجلی جلالی ندارد و محو می‌شود، ولی شاعر گوید؛ حضرت عبدالقادر گیلانی در سایۀ فیض رسول اکرم، در مقام تجلی جلالی تاب آورده است.

نووری تەجەللیی جەلالی...

نووری تەجەللیی جەلالی کاتێ کە حەزرەتی حەق بە گەورەیی و هێز و جەبەروتی تەجەللی بکا هەر دوو جیهان و هەموو پێویستییەکانی توانای مانەوەیان لە بەر تەجەللیی جەلالی نییە و ون دەبن، بەڵام شاعیر دەڵێ؛ حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی لە سێبەری فەیزی رەسووڵی ئەکرمدا لە مەقامی تەجەللیی جەلالیشدا بەردەوام ماوەتەوە.

روزه بودن در رضیعی بر علوّ شأن او:

اشاره به این که مادر حضرت گیلانی روایت کرده است که در ماه مبارک رمضان کودک شیرخوار او شیخ عبدالقادر گیلانی از اذان صبح تا اذان مغرب سینۀ مادر را نمی‌گرفته است.

ڕۆژووگرتن لە شیرەخۆریدا لە لای خاوەن عەقـڵانەوە...

ئیشارە بەوەیە کە دایکی حەزرەتی گەیلانی گێڕاویەتەوە کە لە مانگی موبارەکی رمەزاندا کۆرپەی شیرەخۆرەی ئەو (شێخ عەبدولقادر گەیلانی) لە کاتی بانگی بەیانییەوە تا بانگی ئێوارە (مەغریب) سینگی دایکی نەدەگرت.

(١٤)

## ساقی نامه

ســاقیا! بر فرش گل خرگاه زد چتر ســحاب
بر زده مطرب نوای عشــق بـا چنگ و رباب
روی صحرا بو دهد از لاله و گل، چون بهشت
خوی شــبنم می‌چکد از لاله و از گل، گلاب
باده‌نوشان درخروش وعارفان در وجد و جوش
شــاهد زریــن قبـا برداشــته از رخ، نقــاب
نالــهٔ عشــاق و ســوزِ مطــرب و آواز نــی
شــیخ را در رقــص آورده چــو ایام شــباب
فرصتی زین وقــت نبود[1] خوبتــر، لطفی نما
از نــوال مکرمــت پــر کــن مرا جام شــراب
تا که ریزم در گلــوی جانش، از خود وا رهم
طــی کنم اوراق عقـــل و دانش و فهم و حساب
خـــالصا! آن کس ننوشــد بـــاده در فصلی چنین
گرچه انســان اســت، لیکن هســت کمتر از دواب!

---

١ . به فه‌تحی «واو»

(١٤)

## ساقی نامە

ئەی ساقی! چەتری هەور خەرگای لەسەر فەڕشی گوڵ هەڵدا و
موتریبیش بە چەنگ و ڕوبـابـەوە ئـاوازی عیشقی لێدا
ڕوخساری بیابان لەبەر هەلالە و گوڵ، بۆنی وەک بەهەشتی هەیە
عارەقی شـەونم لە هەلالە دەڕژێـت و لە گوڵیش گولاو
مەینۆشان لە خرۆشدان و عارفان لە وەجـد و جۆشدا
مەعشووقەی کەوازێڕین دەمامکی لەسەر ڕووی خۆی لابردوە
نـاڵـەی عاشقان و سـۆزی موتریب و ئـاوازی بلوێر،
شێخیشی وەک سەردەمی لاوی، هێناوەتە هەڵپەڕکێ
دەرەتـــان لـــەوە باشـتـر نـابـێ، لـوتـفـێـک بکە
لە عەتای کەرەمی خـۆت جامی شـەرابم لێواولێو بکە
بەڵکو بیکەمە گـەرووی گیانمەوە و لە خۆم بێخود بم و
لاپەڕەی عەقڵ و زانست و تێگەیشتوویی و حیساب هەڵدەمەوە
ئەی «خالص»! ئەوەی لە وەرزێکی ئەوتۆدا مەی نەنۆشێت
بـاوەکـو مـرۆڤ بێت، بـەلام لە ئاژەڵ کـەمتـرە!

(۱۵)

ســاقیا! عید است و نوروز اســت و ایام بهار
صــف‌زده گل هــر طرف انــدر کنــار جویبار
ابر نیســان بر بساط سبزه گشــته خیمه‌سا
یــار، بــر تخت زمــرد جــای کرده، شــاهوار
مطرب‌و‌چنگ‌و‌مغنی، جمله‌در‌جوش‌و‌خروش
خم می در جوش و جان بی‌صبر و خاطر بیقرار
می‌نمایــد روضــهٔ خلــد بریــن از هــر طرف
وز نسیم جـــانفزایش مست گشته هوشیار
جــام می در کف نه و در بزم رندان، باده ده
«خالــص» بیچاره را زان جام می دردی[1] بیار

---

۱ . «دالی» یه‌کەم بە زەممەیە.

**(١٥)**

ئـەی سـاقـی! جـــەژنەیە، نـــــــەورۆزە و ڕۆژانی بـــەهـــارە
گـــوڵان لە هەموولایەکەوە لە لێواری جۆگەئاو بەڕیز وەســـتاون
هەوری مانگی نیســـان لەسەر سفرەی ســـەوزە، بۆتە ڕەشماڵ
یـــار، وەک شـــاهان، لەســـەر تەخـــتی زمـــرووت دانیشـــتووە
موتریـــب و چەنـــگ و گۆرانیبێژ هەموو لە جۆش و خرۆشـــدان
کووپـــە مـــەی دەجۆشـــێ و گیان بـــێ ســـەبرە و دڵ بێقەرارە
باغی بەهەشـــتی بەرین لـــە هەموو لایەکەوە خـــۆ دەنوێنێت و
لـــە شـــنەبـــای گیانبزوێنی ئەو، هۆشـــیاران مـەســـت بـــوون
جـــامی مـەی بە دەستەوە بگرە و لە بەزمی ڕیندان[1] دا مـــەی بگێڕە
لە [کووپەی] شەرابەکەش [جامێک] تلّتە بۆ «خالص»ی هەژار بهێنە

[1]. ڕێند: هۆشمەندێک کە خەڵکانی ڕیاکار باش دەناسێت، بەڕواڵەت هیچ نییە، بەڵام لە باتیندا هەمووشتە.

## شرح فارسی و کردی غزل‌های ١٤ و ١٥
### شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلەکانی ١٤ و ١٥

ساقی‌نامه اصولاً در قالب مثنوی سروده می‌شود و به روال متداول در آغاز داستانی منظوم قرار می‌گیرد. البته، به طور مستقل هم گفته شده است. عارفان به ساقی‌نامه اقبال و اعتنا داشته‌اند که خود بحث مفصلی دارد و در این اندک نمی‌گنجد. از لحاظ تنظیم دیوان شعر نیز چنانچه ساقی‌نامه مستقل باشد، در خاتمه و پایان دیوان قرار می‌گیرد. در اینجا توضیح چند نکته ضروری است.

اول چنان می‌نماید که این ساقی‌نامه مفصل بوده و تنها همین مقدار از آن به دست آمده است.

دوم این ساقی‌نامه نه در قالب غزل بلکه ترکیب‌بند بوده و شماره‌های چهارده و پانزده را هم دربرمی‌گیرد.

سوم به خاطر رعایت و احترام تنظیم اولیه ما نیز با همان عنوان ساقی‌نامه در همین جا با توضیح لازم درج نمودیم و شرح کردیم.

در توضیحات د. مکرم طالبانی نیز عنوانی به نام ساقی‌نامه نیامده است و غزل‌ها مستقل می‌باشند.

ساقینامە لە بنەمادا دەبێ بە شێوەی مەسنەوی بوترێ و وا باوە کە لەسەرەتای داستانە مەنزوومەکاندا جێگیر دەبێ، ئەلبەت بە شێوەی سەربەخۆش وتراوە، عارفان بایەخیان بە هۆنینەوەی ساقینامەداوە کە بۆخۆی باسێکی بەربـڵاوە و لەم دەرفەتەدا ناگونجێ، لە بابەتی تەرتیب و داڕشتنی دیوانی غەزەلیات ئەگەر ساقینامە سەربەخۆ بێ، دەبێ لە کۆتایی دیوانەکەدا دابنرێت. لێرەدا ڕوونکردنەوەی چەن خاڵ پێویستە.

یەکەم وادیارە ئەم ساقینامەیە درێژتر بووە و تەنیا ئەم شیعرانەی بەدەستی ئێمە گەییشتوون.

دووەم ئەم ساقینامەیە نە لە شێوەی غەزەل، بەڵکو تەرکیب‌بەند بووە و غەزەلی ژمارە چواردە و پازدەیش لە خۆ دەگرێ.

سێیەم لەبەر حورمەتی داڕشتنێ، کە یەکەم جار کراوە، ئێمەیش هەر بە ناوی ساقینامە لەم جێگەیەدا دامان نا و شرۆڤەمان کرد.

لە ڕوونکردنەوەکەی د. موکەڕەم تاڵەبانیدا بەشێ بە ناوی ساقینامە نەهاتووە و غەزەلەکان جیاواز و سەربەخۆن.

ساقی: ساقی شرابدار را گویند و آن که شراب دهد و کنایت از فیاض مطلق است و در بعضی موارد اطلاق بر ساقی کوثر شده است و به طریق استعارت بر مرشد کامل نیز اطلاق شده است و گفته شده است مراد از ساقی ذات، به اعتبار حب ظهور و اظهار است. (ریاض العارفین، ص ٤٠؛ اصطلاحات فخرالدین عراقی، شرح گلشن راز، ص ٦١٩)

ساقی: ساقی بە شەرابگێڕ و شەرابدار دەڵێن و کینایە لە فەیازی موتلەقە. لە بڕێ جێگە بە ساقیی کەوسەر دەوترێ و بە ڕێگەی ئیستعارە بە مورشیدی کامیل دەڵێن و وتراوە مراز لە ساقی زاتە بە ئیعتیباری حوب و زوهوور و ئیزهار. (ریاض العارفین، ص ٤٠؛ اصطلاحات فخرالدین عراقی، شرح گلشن راز، ص٦١٩)

مطرب: مطرب در اصطلاح صوفیه فیض‌رسانان و ترغیب‌کنندگان را گویند که به کشف رموز و بیان حقایق دل‌های عارفان را معمور دارند و نیز به معنی آگاه‌کنندگان عالم ربانی آید و بالآخره پیر کامل و مرشد مکمل را نیز گویند(کشاف، ص ٨٩٩).

موتریب: موتریب = (ژەنیار)، لە زاراوەی تەسەوفدا بە پێوەنددەران و هاندەران دەڵێن، کە بە ئاشکرایی ڕەمز و وتنەوەی حەقایق، دڵی عارفان ئاوەدان دەکا و بە مانای ئاگادارکەرانی عالەمی ڕەبانی و لە کوتاییدا بە پیری کامیل و مورشیدی موکەممیل دەڵێن. (کشاف، ص ٨٩٩)

لاله و گل: لاله نتیجهٔ معارف را گویند که مشاهده کنند، کنایت از چهرهٔ گلگون محبوب است که عاشق مهجور را داغدار کند.

لالە و گوڵ: لالە بە بەرهەمی مەعارف دەڵێن کە ببینن، کینایە لە ڕوومەتی سووری مەحبووبە، کە عاشقی دوورخراو داخدار دەکا.

عارفان: عارف یعنی شناسنده و کسی است که حضرت الهی او را به مرتبت شهود و اسماء و صفات خود رسانیده باشد و این مقام به طریق حال و مکاشفه بر او ظاهر گشته باشد، نه به طریق مجرد علم و معرفت حال.

بعضی گویند: عارف کسی است که فنای در حق یافته و هنوز به مقام بقاء بالله نرسیده باشد و از مقام تقید به مقام اطلاق سیر نموده و (معروف) حق مطلق است که مبدأ و معاد همه است «العارفون یقوون بمعروفهم وسائر الناس یقوون بالأکل والشرب». (طبقات، ص ٥٠٦)

پیر طریقت گفت: بهرهٔ عارف در بهشت سه چیز است؛ سماع و شراب و دیدار. سماع را گفت؛ «فهم فی روضه یحرون» شراب را گفت؛ «ویسقیهم ربهم شراباً طهوراً» دیدار را گفت؛ «وجوه یومئذ ناضرة الی ربها ناظرة» سماع بهرهٔ گوش، شراب بهرهٔ لب، دیدار بهرهٔ دید، سماع وجدان را، شراب عاشقان را، دیدار محبان را، سماع طرب فزاید، شراب زبان گشاید، دیدار صفت رباید.

سماع مطلوب نقد کند، شراب راز جلوه کند، دیدار عارف را فرد کند. (عده، ج ١، ص٣١١)

عارفان: عارف یانی شوناسەندە و ئەو کەسەیە کە حەزرەتی ئیلاهی ئەوی بە پلەی شوهوود و ئەسما و سیفاتی خۆی گەیاند و ئەم پلەیە بە تەریق و ڕێگەی حاڵ و موکاشەفە بۆ ئەو زاهیر و ئاشکرا بووبێ، نە لە ڕێگەی موجەڕەدی عیلم و مەعریفەتی حاڵەوە.

برێ کەس دەڵێن؛ عارف ئەو کەسەیە کە لە حەقدا فانی بووبێ و هێشتا بە مەقامی "بەقائون بیلـلا" نەگەیشتبێت و لە مەقامی تەقەیود و یەخسیریەوە بەرەو مەقامی ئیتلاق و سەربەخۆیی بڕوا، دەبێ بزانین (مەعرووف) حەقی موتلەقە کە مەبدەء و مەعادی هەموانە «العارفون یقوون بمعروفهم و سائر الناس یقوون بالاکل و الشرب.» (طبقات، ص ٥٠٦)

پیری تەریقەت گوتی: بەهرەی عارف لە بەهەشت سێ شتە، سەماع و شەراب و دیدار، سەبارەت بە سەماع گوتی؛ «فهم فِي روضة يحرون»
سەبارەت بە شەراب گوتی: ویسقیهم ربهم شراباً طهوراً

سەبارەت بە دیدار گوتی: **وجوه یومئذ ناضرة الی ربها ناظرة**

سەماع بەهرەی گوێیە، شەراب بەهرەی لێوە، دیدار بەهرەی چاو و بینینە، سەماع بۆ ویژدانە، شەراب بۆ عاشقانە، دیدار بۆ موحیببانە، سەماع تەرەبئەفزایە، شەراب زوبانگوشایە، دیدار سیفەتڕوبایە.

سەماع نەخت کەرەوەی چاکەیە، شەراب ئاشکراکەری نهێنیە و دیدار عارف هەڵبژێرە.(عده، ج ۱، ص۳۱۱)

شاهد: شاهد یعنی گواه و مشاهده‌کننده «الشاهد ما یشهد بما غاب عنک» و نیز شاهد به معنی حاضر آمده است «و شاهد الحق شاهد فی ضمیرک» و تجلی جمال ذات مطلق را در لباس شاهد، عیان و بیان فرموده‌اند و گفته شده است: که شاهد؛ حق است به اعتبار ظهور و حضور. (رساله قشیریه، ص٤٤؛ شرح گلشن راز، ص ٥٨٣)

شاهید: شاهید یانی، شایەت و بینەر؛ ( الشاهد ما یشهد بما غاب عنک)[1] و شاهید بە مانای حازرە؛ (وشاهد الحق شاهد فی ضمیرک)[2] و تەجەللیی جەمالی زاتی موتلە ق لە جلوبەرگی شاهید ئاشکرا دەفەرمووێ و گوتراوە؛ کە شاهید حەقە بە ئیعتباری زوهوور و حوزوور.(رساله قشیریه، ص ٤٤؛ شرح گلشن راز، ص ٥٨٣)

عشاق: جمع عاشق، عاشق جویندۀ حق تعالی را گویند. با وجود طلب وجد تمام و غیرمحبوب حقیقی خود کسی را نخواهد و نجوید... او را نه کفر و نه دین است و شعار عاشقان این است.

عوششاق: جەمعی وشەی عاشقە، عاشق بە بەدواداگەڕی حەقتەعالا دەڵێن، لەگەڵ داخوازی و تێکۆشانی تەواودا و جگە لە مەحبووبی حەقیقیی خۆی کەسیتری نەگەرەک بێ و بە دوویا نەگەڕێ... ئەو نە کوفری هەیە نە دین و شیعری سەر زاری عاشقان ئەمەیە.

---

۱ . شاهید ئەو کەسەیە وا بەو شتە کە تۆ نایبینی شایەتی ئەدا

۲ . شاهیدی حەق لە دڵی تودا شاهیدە

یار بر تخت زمرّد جای کرده شاهوار؛

یار؛ یار عالم شهود را گویند یعنی مشاهدهٔ ذات حق (کشاف، ص **١٥٦٤**).

زمرّد: گوهری گرانبهاست، در اصطلاح صوفیان نَفْس کلی را زمرّد گویند که صور تمام موجودات در آن مرتسم است. (اصطلاحات شاه نعمت‌الله ولی، ص **١٦**).

شاعر در این یک مصرع با اصطلاح عرفانی تمام عالم جسم و جان، عرض و جوهر، ذات و معنی را در نهایت مقام سلوک ترسیم کرده است.

یار، وەک شاهان لەسەر تەختی زومڕوت دانیشتووە

یار؛ یار بە عالەمی شوهوود دەڵێن یانی بینینی زاتی حەق.(کشاف، ص **١٥٦٤**)

زمرووت: گەوهەرێکی پڕبایەخە، لە ئیستیلاحی سۆفیەدا بە نەفسی کوللی

دەڵێن زمرووت، کە وێنەی هەموو مەوجوودات لەودا کیشراوەتەوە.(اصطلاحات شاه نعمت‌الله ولی، ص **١٦**).

شاعیر لەم دێڕەدا بە ئیستیلاحاتی عیرفانی تەواوی عالەمی هەست و گیان، عەرەز و جەوهەر، زات و مانای لە کۆتایی پلەی سلووکدا رەسم کردووە.

گلاب: سالکانی که پیرو ذکر خفی هستند و بیشتر پرده‌نشینند و از حضور و تردد در جمع پرهیز دارند.

گوڵاو: ئەو سالیکانەی وا پەیڕەوی زیکری خەفین و زۆرتر پەردەنشینن و خۆیان دەرناخەن و لە هاتوچۆ و ئامادەبوون لە نێو خەڵکدا خۆ دەپارێزن.

باده‌نوشان: باده نزد صوفیان نصرت الهی است و عشق منیف را نیز باده گویند. لاهیجی گوید: بعضی در مدرسهٔ میان اهل وسوسه بسیار جان کنده‌اند و کمندی چند از تقلید در گردن افکنده‌اند نه در میخانه به حق باده عرفان نوشند، نه در قدم پیر مغان به تهذیب اخلاق کوشند.

بادەنوشان: بادە لە لای سۆفیان سەرکەوتنی ئیلاهیە و بە عیشقی بەرزیش دەڵێن بادە ، لاهیجی دەڵێ؛ برێ کەس لە مەدرەسەی ئەهلی وەسوەسە گیانیان کەندوە، چەرمەسەرییان دیوە و کەمەندی تەقلید و لاسایی کردنەوەیان

له ملی خۆیان خستووه، نه له مەیخانه بادەی عیرفانیان نۆشیوه، نه له خزمەتی پیری موغان بۆ تەهزیب و پاکیی ئەخلاق تێکۆشاون؛

خُم می: مراد قلب عاشق شیداست که از غلبات عشق بیتاب و واله می‌شود.
خومی مەی: مراز دڵی عاشقی شەیدایه که لەسەرکەوتنی عیشقدا واله و نائارام دەبێ.

(۱٦)

نوربخــش روی مهــر آســمان، پیداســت کیســت
جلوه‌گر در صورت حســن بتان، پیداســت کیست
دلبــری کــز هــر نظربــازی بــه رنگــی دل بــرد،
پیش عــارف در میان دلبران، پیداســت کیســت
منعکس گردد به ضدش، هر چه از حدش گذشــت
آن که از فرط ظهوراتش نهان پیداســت کیســت
آن کــه هم دور اســت و هم نزدیــک از هر ذره‌ای
همچو خورشــید فلک اندر جهان پیداست کیست
گرچــه انــدر بی‌نشــانی، از نشــان نبــود نشــان
آن که باشد با نشــان و بی‌نشان، پیداست کیست
صــورت لیلــی و مجنون جــز خیالی بیش نیســت
ناظرانــدر این و منظوراندر آن پیداســت کیســت
خالصا! چشمت پر از گرد و غبار کثرت است
ورنه، در هر جا هویدا و عیان، پیداست کیست

**(١٦)**

ئــەوەی نوور خەڵاتی ڕووی هەتاوی ئاسمان دەکات، دیارە کێیە
ئەوەی لە ڕوخســاری جوانیی بوتاندا دەردەکەوێت، دیارە کێیە
ئــەو دڵبەرەی دڵــی هــەر نەزەربازێک بە شــێوەیەک دەبات
لــە لای عـــارف، لەنـــاو دڵبەرانــدا، دیــارە کێیــە
هەرشــتێک لە سنووری خــۆی تێپەڕ بێت، دەبێتە دژی خۆی
ئــەوەی کە لەبەر زۆریی دەرکەوتنــەکانی، نادیارە، دیارە کێیە
ئــەوەی لــە هەمــوو زەڕڕەیــەک هــەم دوورە و هــەم نزیک
وەک هەتــاوی ئاسمــان لــە جیهانــدا، دیــارە کێیــە
گەرچی لە بێ نیشــانەییدا هیچ نیشــانەیەک لە نیشــانە نییە،
ئــەوەی وا خاوەننیشــان و بێنیشــانە، دیــارە کێیــە
ڕوخســاری لەیــلا و مەجنــوون لــە خەیاڵێــک زیاتــر نییــە
نــازری ئەمیــــان و مـــەنــزووری ئەویـــــان دیــارە کێیە
ئەی «خالص»! چــاوت پڕە لە تۆز و خۆڵی زۆربینی
دەنا لە هەموو شوێنێک، بە ڕوونی و ئاشکرا دیارە کێیە

## شرح فارسی و کردی غزل ۱۶
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۱٦

در این غزل شاعر عارف نکات ظاهر را به کثرت و نهایت را به وحدت آورده است. واژۀ (کیست) در ردیف غزل هم سئوال و هم جواب است، چون با کلمۀ (پیداست) همراه شده است و هستۀ اصلی آن تفسیر وحدت وجود و وحدت موجود است. نور، جلوه، حُسن، دلبری، رنگ، انعکاس، ضد، فرط ظهور، دور و نزدیک، نشان و بی‌نشان، مجازی و حقیقی و در نهایت کثرت و وحدت سیر این بررسی را به خوبی می‌نمایاند.

لەم غەزەلەدا شاعیری عارف خاڵە زاهیریەکان بە زۆرینە و بەربڵاوی و کۆتایی بە یەکدانە هاوردوە، وشەی "کێیە" لە ڕەدیفی غەزەلەکەدا هەم پرسیارە و هەم وەڵامی پرسیارەکەیە، بۆ ئەوەی هاوڕێ لەگەڵ وشەی "دیارە" هێناویە، نێوەڕۆکی غەزەلەکە شرۆڤەی باسی وەحدەتی وجوود و وەحدەتی مەوجوودە، وشەی نوور، جیلوە، جوانی و حوسن، دولبەری، ڕەنگ، تیشکدانەوە، پێچەوانە، زۆریی زوهوور، دوور و نزیک، نیشان و بێنیشان، مەجازی و حەقیقی و لە کۆتاییدا زۆری و یەکدانەیی، بەرەو پێشەوەچوونی هەڵوێستەکە پیشان دەدا.

(۱۷)

فــاق مــن فــرط الهــوی قلبــی علی
کل هــاو فــی هــواه قــد عــلا
در تمنــای لبــت، بــس اهــل دل
باذلــوا الــروح کاهــل الکربــلا
گــر نبــودی عشــق شــورانگیز تــو،
بالبــلا، بــال المحــب مــا ابتلــی
از بــرت دورم مکــن، چــون در ازل
کان قلبــی فــی هــواک قــد ولــی
گــر بــه تیــر غمــزه دلــدارت زنــد،
لاتخــف، فــی العشــق منــه ماقلــی
تــا نگــردد عشــق در دل منجلــی،
لایــکــون مســتعــدا للجـــلا
در بــلا، «خالــص»! بلی‌گــو، زانکه یار
کم بــــلا بــــال المحــــب بــــالبلا

**(١٧)**

دڵی من لەبەر عیشقی زۆر بەسەر هەموو ئەوانەی
لــە عیشــقدا پایــــەبــــەرزن، ســەرکەوت
بـــە تـــەمەننای لێــوت گـــەلێــک ئەهـلی دڵ
وەک ئەهلـــی کەربـــەلا ڕۆحی خۆیان بەخشـــی[١]
ئەگـــەر عیشــقی هەســتبزوێنی تــۆ نـــەبووایە
لە بەڵادا دڵدار شارەزای ئەوە بوو کە تووشی بووە
لــە خــۆتم دوور مەخـــەوە چونکە لــە ئەزەلەوە
دڵــم بــە عیشــقی تــۆ ئاشــنا بـــووە[٢]
ئەگـــەر دڵدارەکەت بە تـــیری خەمزە لێت بدات
مـــەترسە، لە عیشقدا ئەوەی دەسووتێ لە وەوەیە[٣]
تـــا عیشـــق لــە دڵــــدا تیشــک نـــەداتەوە
ئامــادە نابـــێ بـــۆ ئـــەوەی بدرەوشـــێتــــــەوە[٤]
خالــص! لــە بــەڵادا بڵـــێ بەڵـــێ، چونکــە یار،
چەند جــار دڵدار شــانازیی بە بــەڵاوە کردووە[٥]

---

[١]. باذل الروح کاهل الکربلا ← مانند شایستگان کربلا جان خود را بخشیدند.

[٢]. کان قلبی فی هواک قد ولی ← دلم در هوای عشق تو به مرحلهٔ دوستی و ولایت رسیده است. (رک شرح / بڕوانە بۆ شەرحەکان) (م، ع، س)

[٣]. لاتخف فی العشق منه ماقلی ← از عشق مترس زیرا اگرچه عشق دشمنِ عاشق است، اما در برابر او ناچیز است. (رک شرح / بڕوانە بۆ شەرحەکان)

[٤]. لایکون مستعدا للجلی ← کسی که زمینهٔ مساعد نداشته باشد، آمادگی این کار را ندارد یا متجلی نمی‌شود. (رک شرح / بڕوانە بۆ شەرحەکان)

[٥]. کم بلا باذل المحب بالبلا ← که چقدر خاطر عاشق گرفتار مصیبت شده است. (رک شرح / بڕوانە بۆ شەرحەکان) (م، ع، س)

## شرح فارسی و کردی غزل ۱۷
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۱۷

یکی از نکات اصلی سلوک عرفانی این است که سالک برای تعالی روح باید شایستگی و زمینهٔ لازم را داشته باشد. حافظ می‌گوید:

**نطفهٔ پـــــاک بود تا که شود قـــابل فیض**
**ورنه هر سنگ و گلی لوءلوء و لالا نشود**

حضرت شیخ عبدالرحمن خالص در این غزل بحث شایستگی لازم را آورده است و می‌فرماید که توانایی عشق تو مرا پیروز کرد و دلم را آسمانی و متعالی ساخت، زیرا خداوند هر کس را هدایت فرماید پیروز می‌شود که البته [اشاره] به خود شاعر دارد.

پیام این غزل این که؛ روح شایسته، نطفهٔ پاک، ارادهٔ عاشق در برابر مصیبت‌های عشق ناچیز است.

این غزل در کتاب د. مکرم طالبانی (ص ١٤٩) با قافیه‌هایی که املای متفاوت با متن دیوان جذبهٔ عشق دارد، آمده است؛ دانشمند ارجمند انور سلطانی نیز مصاریعی را به کُردی برگردانده است و شارح کمترین مابقی را با برداشت خویش چنین فهم نموده و به فارسی تقدیم کرده‌ام؛

فاق من فرط الهوی قلبی علی ← از شدت عشق دلِ من اوج گرفت.

کل هاو فی هواه قد علا ← هر هدایت‌گری در هوای عشق او متعالی می‌شود.

در نسخهٔ د. مکرم طالبانی؛ قد علا آمده است. (رک ص ١٤٩)

باذلوا الروح کاهل الکربلا ← مانند شایستگان کربلا جان خود را بخشیدند.

بالبلا باذل المحب مابتلی ← عاشق به دشواری از بلایای عشق عبور می‌کرد و فدا می‌شد.

در نسخهٔ د. مکرم طالبانی؛ ما ابتلا آمده است. (رک ص ١٤٩)

کان قلبی فی هواک قد ولی ← دلم در هوای عشق تو به مرحلهٔ دوستی و ولایت رسیده است.

در نسخهٔ د. مکرم طالبانی؛ قد ولا آمده است. (رک ص ١٤٩)
لاتخف فی العشق منه ماقلي ← از عشق مترس زیرا اگرچه عشق دشمنِ عاشق است، اما در برابر او ناچیز است.
در نسخهٔ د. مکرم طالبانی؛ منه ماملا آمده است. (رک ص ١٤٩)
لایکون مستعدا للجلي ← کسی‌که زمینهٔ مساعد نداشته باشد، آمادگی این کار را ندارد یا متجلی نمی‌شود.
در نسخهٔ د. مکرم طالبانی؛ ا... مستعدا بالجلا آمده است. (رک ص ١٤٩)
کم بلا باذل المحب بالبلا ← که چقدر خاطر عاشق گرفتار مصیبت شده است.

یەکێ لە خاڵە سەرەکییەکانی سولووکی عیرفانی ئەوەیە کە سالیک دەبێ بۆ بەرز بوونەوەی رۆحی، شیاو بێ. حافز دەڵێ؛

بنەمـــای پـــاکی دەوێ تا بۆ فەیز وەرگرتن قابیل بێ
دەنا هەر کوچک و بەرد و هەرگێ نابێ بە گەوهەر و زیو

حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمان لێرەدا باسی ئەوە دەکا کە لە زۆریی **عیشقی** تۆ دڵی من سەرکەوت و ئاسمانی بووە و هەر کەس خوداوەند هیدایەتی بکات سەردەکەوێ و بەرز دەبێتەوە.

ئەگەر عیشقی بزوێنەری تۆ نەبوایە ئەستەم بوو عاشق لە چەرمەسەرە و سەختیی عیشق دەپەڕیەوە و لەناودەچوو، بەڵام عیشقی تۆ منی بە پلە و پایەی بەرز گەیاندوە و بەرهەم و پەیامی غەزەلە کە ئەمەیە کە؛ رۆحی شیاو، بنەمای پاک، ئیرادەی عاشق لە بەرابەر کارەساتی عیشق‌دا هیچ نییە و سەرکەوتن بە سالیکە.

ئەم غەزەلە لە کتێبەکەی د. مکرم تالە بانی (ل ١٤٩) قافییەکانی بەم شیوە هاتوون ١ـ... قدعلا ٤ ـ... ما ابتلا ٥ ـ... قد ولا ٦ـ... منه ماملا ٧ـ... مستعدا بالجلا، کە لەگەڵ دیوانە فارسیەکەدا جیاوازە. کاک ئەنوەر چەن دێڕیکی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی. منیش بە گوێرەی تێگەییشتنی خۆم لێرەدا فارسی و کوردیەکەم هێناوە تا بزانین بیروڕای مامۆستایان چییە؟

فاق من فرط الهوی قلبی علی ← له زۆری عیشق دڵی من سەرکەوت و پیرۆز و ئاسمانی بوو.

کل هاد فی هواه قد علی ← هەر ڕێنوێنێ لە هەوای عیشقی ئەودا بەرز دەبێتەوە

باذل الروح کاهل الکربلا ← وەک شەهیدانی کەربەلا گیانی خۆیان بەخت کرد

بالبلا باذل المحب مابتلی ← عاشق بە سەخلەت و دژواری لە بەڵای عیشق تێدەپەڕێ و لە ناودەچێ

کان قلبی فی هواک قد ولی ← دڵم بە هەوای عیشقی تو بە قۆناغی وەلایەت گەییشتووە

لاتخف فی العشق منه ماقلی ← لە ئەشق مەترسە ئەگەرچی دژایەتیی عاشق دەکا، بەڵام [لە بەرابەر ئیرادەی عاشق] بچووکە و ناشتێک نییە

لایکون مستعدا للجلی ← ئەو کەسە کە شیاو نەبێ ئامادەی ئەم کار و هەرمانە نییە و ڕووناکیی پێ ناگات

کم بلا بال المحب بالبلا ← کە خاتری عاشق چەند تووشی کارەسات بووەتەوە

(۱۸)

عشـــق برداشـــت ز دل بـــار مـــن و مایـــی را
عاقبـت داد مـرا رتبـۀ رسـوایی را
چـــون قدم را بنهادم به ســـر کوچۀ عشـــق،
بربودنــد ز مــن نقــد شــکیبایی را
دل دیوانــۀ مــن کام نمی‌دانــد چیســت
جز جنـــون نیســـت نصیبی دل ســـودایی را
نـــی کجـــا نغمـــه کنـــد، راه به خود کـــی آرد
گـــر در او[1] ره نبـــود دســـت و دم نایـــی را
نیـــک و بـــد راه ندارنـــد به صحـــرای جنون
اتحـــادی اســـت در او[2] زشـــتی و زیبایـــی را
جز تـــو هر جا که حبیبـــی و در آن معتمدی
اعتبـــــاری نبـــود شاهـــد هـــر جـــــایی را
هر که «خالص» به غم یوسف خود مونس بود،
بـــه دو عالـــم نـــدهد وحشـــت تنهـــــایی را

۱ . درو
۲ . درو

**(١٨)**

عیشق، باری «من و ئێمە» ی لەسەر دڵ هەڵگرت و
سەرئەنجام پلەی نــاوزڕانی پێ بەخشیم،
هــەر کــە پێم نایە ســەر کــۆڵانی عیشق،
نــەغــدیــنــەی ســەبــریــان لــێ ڕفــانــدم
دڵــی شێتی مــن نــازانــێ کــامــەرانی چییە
دڵی سەوداسەر جگە لە شێتی هیچی پێ نەبڕاوە
نەی چۆن ئاواز دەڵێ و چۆن ڕێگای خۆی دەدۆزێتەوە
ئەگەر دەست و هەناسەی نەیژەنی نەگاتێ
ئــــەم چــــاکــــەو ئــــەو خــــــراپ لــە
ســــەحــــرای شــێــتی ڕێــــی پــــێ نــادرێــت
لــەوێــدا نــاحــەزی و جــوانی هــەر یەکن
جــگــە لــە تــۆ کــە لــە هــــەر جــێــیــەک
خــۆشــەویــســت و بــاوەڕپــێــکــراوێــکــی لێیە
شاهیدی[١] دوور لە ئەخلاق لە وێ بایەخی نییە
ئەی «خالص»! هەرکەس هاودەمی خەمی یووسفی خۆی بوو،
تــرسی تەنیامانەوە [لە خەڵک] بە هەر دوو عالەم نــاگۆڕێتەوە

١. لە سۆفیایەتیدا، شاهید ئەوەیە وا لە دڵی سالیکدایە و بوونی بە سەر دڵدا زاڵە

## شرح فارسی و کردی غزل ۱۸
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۱۸

عشق برداشت ز دل بار من و مایی را... : شاعر در این سروده، غزل معروف شیخ اجل سعدی را استقبال کرده است که می‌فرماید:

**لا ابالی چه کند دفتر دانایی را؟ طاقت وعظ نباشد سر سودایی را...**

(رک؛ دیوان غزلیات سعدی، به کوشش دکتر خلیل خطیب رهبر، ج ۲، ص ٣٤)

غزل سعدی شگفت، ساده، روان و مفهوم است که اکثر عارفان از جمله حضرت شیخ عبدالرحمن طالبانی آن را استقبال کرده اند. بار من و مایی مقصود نفی فرد و جمع و اثبات وحدت است.

عیشق باری «من و ئێمە»ی لەسەر دڵ هەڵگرت:... شاعیر لەم هەڵبەستەدا، پێشوازیی لە غەزەلی مەعرووفی شێخی مەزن (سەعدیی شیرازی) کردووە کە دەفەرمووێ:

لاابالی چه کند دفتر دانایی را... هەر لەسەر ئەو کێش و رەدیف و قافیە

(غزلیات سعدی، به کوشش دکتر خلیل خطیب رهبر، ج ۲، ص ٣٤)

ئەم غەزەلە شیعرێکی سەرسوورهێنەرە؛ سادە و ڕەوان و تێگەیێنەر، کە زۆر لە عارفان لەوانە حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی پێشوازییان لەم غەزەلە کردووە.

باری من و ئێمە؛ مەبەست لابردنی تاکەکەسی و فرەکەسیە و هاوردن و پێبەجێ بوونی وەحدەتە.

جـَیبی: به معنی آغوش، سینه و دل برای تأمین وزن مشدد باید خواند

جز تو هرجای[که] جیبـّی و در آن معتمدی اعتباری نبود شاهد هر جایی را

جز تو که در دل جا داری، در هر جا معشوقی در آغوش عاشق جا دارد امـا شاهد و دلبر هرجایی اعتباری ندارد، زیرا دلبر قابل اعتمادی نیست، واژهٔ هر جایی افادهٔ معنی متکثر می‌نماید، در حالی که معشوق یکی است و آن معشوق حقیقی است.

[که] را برای تأمین وزن اضافه نمودم.

جەیبی: بە مانای باوەش و سینگ و دڵ کە بۆ پۆڕانی کێشەکە مووشەدەدکراوە؛ جگە لە تۆ کە جێگەت لە دڵدایە لە هەر جێگەیێ دولبەرێک لە باوەشی عاشقێکدا هەیە، بەڵام دڵبەری فرەلایەنە باوەڕ پێ‌کراو نییە، سیفەتی «هەرجایی» مانای فرەلایەنی هەیە، ئەمە لە حاڵێکدایەکە مەعشووق یەکدانەیە و ئەو مەعشووقی حەقیقیە.

غم یوسف خود... : اشاره به حضرت یعقوب پیامبر است. در ترکیب غم یوسف بار معنایی هجران، زیبایی و دلبر معشوق، دلبستگی و عاطفه، پاکی و زلالی، سلطنت و فقر، وصال، نهفته است:

خەمی یووسفی خۆی...: ئاماژەیە بە حەزرەتی یاقووبی پێغەمبەر. لە تەرکیبی خەمی یووسف، باری مانایی دووری، جوانی، دولبەری، پێوەندی و خۆشەویستی، پاکی و بێ‌خەوشی، دەسەڵات و نەداری، ویسال و بەیەک گەییشتن بە بیردێتەوە.

(۱۹)

ای کــرده بنــا شــیوهٔ حســـن تــو جفــا را
طــی کــرده بــه دَورش ورق مهــر و وفــا را
ابــروی کمانــت ز مــژه بــر دل خلقــی
افکنــده بســی نــاوک پیــکان قضــا را
زیــن درد اگــر ناله کنم هیچ عجب نیســت
دردی اســت ندانند طبیبانــش دوا را
از عشــق تو سرگشــته و شیدا شــدم آخر
دریــــاب مـــن غمـــزدهٔ بی‌ســر و پــا را
«خالــص»! تو اگر راهروی در طلب دوســت
از دســت مـــده دامـــــن اربـــاب صفــا را

**(١٩)**

ئەی ئەوکەسەی شێوەی جـوانیت جـەفای بنیاتنـاوە و
پـەڕەی میهر و وەفـای لە دەوری پێچاوەتەوە و
ئـــــەبـــــرۆی کـــــەوانـــــت بـــــە بـــــرژانـــــگ
نووکی تیری قـەزای لە دڵی خەڵکێکی زۆر داوە
ئەگەر لەم دەردە بناڵم، هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە
ئـەوە دەردێکە کە چازانان دەرمانەکەی ناناسن
لە عیشقی تۆدا سەرئەنجام سەرلێشێواو و شەیدا بووم
فریای منـــی خـــەفـــەتبـــاری بـێسـەرو پـــێ بکەوە
«خالص»! ئەگەر تۆ بەدوای دۆستدا عەودالّی،
داوێـــنی خـــــــاوەن سـەفـایـان بـەر مـــەدە!

## شرح فارسی و کردی غزل ۱۹
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۱۹

حُسن تو: حُسن به معنی نیکویی و خوبی باشد و در اصطلاح عبارت از چیزی است که موافق امر بود و کمالات ذات احدیت را گویند. (طبقات، ص٤٠١)
حوسنی تۆ: حوسن بە مانای چاکی و جوانیە و لە ئیستیلاحی تەسەوفدا عیبارەتە لە شتێ کە یەکدەنگی لەگەڵ ئەمردا هەیە و بە کەمالاتی زاتی ئەحەدیەت دەڵێن. (طبقات، ص٤٠١)

جفا: جفا به معنی ستم و ظلم و در اصطلاح پوشانیدن دل سالک بود از معارف و مشاهدات و بی‌وفایی محبوب را نیز جفا گویند. (کشاف، ص ١٥٥٥)
جەفا: جەفا بە مانای ستەم و بێدادگەریە و لە ئیستیلاحدا داپۆشانی دڵی سالیک لە م عارف و شوناس و چاوپێکەوتنە و بە بێوەفایی مەحبووبیش دەڵێن. (کشاف،ص ١٥٥٥)

ورقِ مهرِ وفا: اشاره‌است به داستان عشق و دلدادگی "مهر و وفا" که در بین شعرا مشهور است. حافظ گوید:

**ما قصهٔ سکندر و دارا نخوانده‌ایم — از ما به جز حکایت مهر و وفا مپرس**

پەڕەی میهر و وەفا: ئاماژەیە بە داستانی عاشقی و دڵسپاری "میهر و وەفا" کە لە نێو شاعیران‌دا مەشهوورە، حافز دەڵێ:
ئێمە داستـــانی ئەسکەندر و دارامـــان نەخوێندووەتەوە
جگە لە داستانی میهر و وەفا لە ئێمە مەپرسە

ابرو: مقصود صفات است از آن رو که حاجب ذات است تعبیر به ابرو می‌گردد و عالم وجود از آن جمال گیرد.
برۆ: برۆ یا ئەبرۆ، مەبەست سیفاتە، لەبەر ئەوەی کە پەردە و حاجبی زاتە بە ئەبرۆ شروڤە دەکرێ و عالەمی وجوود جوانی و جەمال لەو وەردەگرێ.

مژه: موی پلک چشم را گویند و در اصطلاح صوفیان حجاب سالک است و در ولایت
به کوتاهی در اعمال و در اصطلاح عشاق اشارت به سنان و نیزه و پیکان است
که از کرشمه و غمزهٔ معشوق به هدف سینهٔ عاشق می‌رسد و او را به فریاد
می‌دارد. (کشاف، ص ١٥٦٢)

موژه: به مووی برژانگ دەڵێن و لە زاراوەی سۆفیاندا پەردەی سالیکە لە پلەی
وەلایتدا. ئاماژە بۆ کەمتەرخەمی لە کردەوەدایە و لە زاراوەی عیشق و عیشقدا
ئاماژەیە بۆ سەنان و رم و پەیکان، کە لە کریشمە و خەمزەی مەعشووقەوە
بەرەو سینگی عاشق دێت و دەیخاتە داد و هاوار.(کشاف،ص ١٥٦٢)

زین درد اگر ناله کنم...

درد بی‌درمان را گوید که درمان ظاهری ندارد و ناله عارفان از این درد است
که اطبای جهان از چاره‌اش فرو می‌مانند.

ئەگەر لەم دەردە بناڵم...

مەبەستی دەردی بێدەرمانە، کە دەرمانی زاهیریی نییە و ناڵەی عارفان لەم
جورە دەردانەیە کە چازانان و پیزشکانی جیهان لە چارەیان داماون.

(۲۰)

باز شــو ای دیده! شــق کــن پردهٔ پنــدار را
بنگــر، از هــر جا عیــان بین جلــوهٔ دلدار را
پرتــو رخســار جانان جلــوه بر هــر جا زده
نیســت فرقــی در تجلایــش در و دیــوار را
تا به کــی از ظلمت هســتی نمی‌آیی برون؟
تــا عیــان یابــی بــه هر جــا پرتــو انــوار را
گرد امــکان گر نگیــرد صفوت مــرآت دل،
بی‌گمــان در خویشــتن بینی جمــال یار را
غیرت عشــقم زبان از شــرح اسرارش برید
ورنــه در هر جــا بیان می‌کردمش اســرار را
هــر کجــا عاشــق نظــر بــر دار دنیــا افکند
غیــــر دلــدارش نمی‌بینــد در و دیــوار را
خالصا فریاد کن با گریه و زاری که دوســت
دوست دارد چشم پــــر اشک و دل افگار را

**(٢٠)**

ئـــەی چـــاو! بـکـرێـوە و پـــەردەی گـومـان بدڕێنە
بڕوانە و لە هەموو شوێنێکەوە دەرکەوتنی دڵـدار ببینە
تیشکی ڕوخساری دڵدار لە هەموو شوێنێک دەرکـەوتووە
دەرک و دیوار بۆ دەرکەوتنی جیاوازییان لەگەڵ یەکتر نییە
تـا کەنگێ لـە تـاریـکـی «بـــوون» ناچییە دەرەوە؟
تا لە هەموو جێیەک تیشکی نـــوور بـــە ئاشکرا ببینی
ئەگەر تۆزی جیهانی خاکی لەسەر ئاوێنەی دڵ نەنیشێ
بێگومان لە جەستەی خۆتدا جوانی و جەمالی یار دەبینی
غیرەتی عیشق زمانی شرۆڤە کردنی نهێنییەکانی ئەوی بڕیم
دەنـا لە هەموو شوێنێک نهێنییەکانیم ئاشکرا دەکرد
عاشق لە هەرکوێیەک بڕوانێتە خانووبەرەی ئەم جیهانە،
دەرک و دیـــواریشی بـــە دڵـدارەکـەی دەبیـنێـت

ئەی «خالص»! بە گریان و ڕۆڕۆوە هاوار بکە، چونکە دۆست
چـــاوی بـــەفرمێسک و دڵـی شکـــاوی خـــۆش دەوێـت

**شرح فارسی و کردی غزل ۲۰**

شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۲۰

پردۀ پندار: پرده، حاجب میان حق و بنده است و مانعی را گویند که میان عاشق و معشوق باشد و از لوازم طریق باشد از جهت معشوق.

پندار، یکی از مراحل چهارگانۀ درک که شامل عقل، وهم، خیال= "پندار" و حسن است و در اصطلاح عارفان، خودبینی گفته می‌شود.

پەردەی پندار: پندار واتە گومان پەردەیە لە مابەینی حەق و مرۆڤدا و بە کۆسپێک دەوترێ کە لە بەینی عاشق و مەعشووقدا بێ، لە پێویستیەکانی ڕێگەی سلووکە لە بابەتی مەعشووقەوە.

پندار یان گومان یەکێ لە چوار پلەی ئاگاداریە کە بریتین لە عەقڵ، وەهم، خەیاڵ = "گومان" و حوسن واتا چاکی، لە زاراوەی عارفاندا، خۆبینیە.

جلوۀ دلدار: انوار الهی را گویند که بر دل سالک عارف، ساطع گردد و او را واله و شیدا کند و عالم و آدم همه جلوات انوار حق تعالی می‌باشد و همه اشعه و پرتوی از نور وجودند که در مرتبت تفصیل به طور مختلف نمودار می‌گردند.

جیلوەی دڵدار: بە ئەنواری ئیلاهی دەڵێن کە لەسەر دڵی سالیکی عارف دەدرەوشێتەوە و شەیدای دەکا و عالەم و ئادەم هەموو جەلەواتی ئەنواری حەق تەعالایە و هەموو تیشکی نووری وجوودن کە لە پلەی بەرەو پێشەوە بە شێوازی جۆراوجۆر دەبینرێت و ئاشکرا دەبێ.

... در تجلایش در و دیوار را: اشاره به این بیت معروف در ترجیع‌بند هاتف اصفهانی شاعر همفکر جناب شیخ عبدالرحمن است که؛

**جـــلوۀ یـــار از در و دیـــوار      در تجلی است یا أولی‌الأبصار**

شیخ با دیوان هاتف نیز آشنایی داشته است.

سید احمد هاتف اصفهانی از سادات حسینی، اصل خاندان او چنان که از تذکرهٔ نگارستان دارا و تذکرهٔ محمد شاهی برمی‌آید از اهالی اردوباد آذربایجان بوده که در زمان صفویه به اصفهان هجرت کرده است. هاتف در نیمهٔ اول قرن دوازدهم در اصفهان متولد و در ۱۱۹۸ هجری قمری در قم به رحمت ایزدی پیوست. (برای آگاهی بیشتر رک ← دیوان هاتف اصفهانی به انضمام رشحهٔ دختر هاتف، تصحیح استاد وحید دستگردی، با مقدمهٔ عباس اقبال آشتیانی)

... دەرک و دیواریشی بە دڵدارەکەی دەبینێت: ئاماژە بەم دێڕە بەناوبانگەی تەرجیعبەندی هاتیفی ئیسفەهانیە، کە شاعیری هاوفیکری حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمان بووە، کە دەڵێ؛

جیلوەی یار لە دەرک و دیوار    ها لە تەجەللیدا ئەی ساحیبانی چاوی بینین

شێخ شارەزای دیوانی هاتیف بووە

سەید ئەحمەدی هاتیفی ئیسفەهانی لە ساداتی حوسێنی، بنەماڵەکەی، هەروەها کە لە تەزکەرەی نیگارستانی دارا و تەزکەرەی محەمەد شاهیدا هاتووە؛ خەڵکی ئوردوبادی ئازەربایجان بوون، کە لە زەمانی سەفەویەوە بەرەو ئیسفەهان کۆچیان کردووە، هاتیف لە نیوەی یەکەمی سەدەی دوازدەهەمی کۆچیدا لە ئیسفەهان لە دایک بووە و لە ۱۱۹۸ ک. م لە شاری قوم بەرەحمەتی خودا چووە (بۆ ئاگاداری فرەتر بڕوانە ← دیوان هاتف اصفهانی به انضمام رشحهٔ دختر هاتف، تصحیح استاد وحید دستگردی، با مقدمهٔ عباس اقبال آشتیانی)

ظلمت هستی: مراد عالم سفلی و جهان طبیعت است.

زولمەتی هەستی: زوڵمەت واتە تاریکی، هەستی واتە جیهان، مەبەست جیهانی خوارووە و جیهانی سروشتە.

گرد امکان: غبار عالم خاکی که مانع دیدن است و جهان را فرامی‌گیرد.

گەردی ئیمکان: تۆز و غوباری عالەمی خاکی کە کۆسپی دیتنە و هەموو جیهان دادەگرێ.

مرآت دل: آینهٔ دل که محل تجلی نور الهی است.

میرئاتی دڵ: میرئاتی دڵ واتە ئاوێنەی دڵ کە جێگای تەجەللی و تیشکی نووری ئیلاهیە.

... بی‌گمان در خویشتن بینی جمال یار را: بدون تردید در نزد عارفان تو انسان آینهٔ خدانما خواهی شد و جمال یار در وجود تو خودنمایی خواهد کرد. گر به خود آیی به خدایی رسی، مقصود از به خود آمدن، خودشناسی است.

... بێ‌گومان له جەستەی خۆتدا جوانی و جەمالی یار دەبینی: بەبێ شک له لای عارفان مرۆڤ ئاوێنەی خودانوێنه و جوانی و جەمالی یار له وجوودی تۆدا خۆی دەنوێنێ، دەڵێن ئەگەر وەخۆ بێیتەوه به خودایی دەگەی، وەخۆهاتنەوه مەبەست خۆناسینه.

غیرت عشق: رک به شرح غزل‌های پیشین.
غەیرتی عیشق: بڕوانه شرۆڤەی غەزەله کانی پێشوو.

**(۲۱)**

**جلوۀ جانان به چشـم عاشـقان مسـتور نیسـت**
**لیـک اظهـارش بـر[1] خلق جهان دسـتور نیسـت**
**عاشـقان را جبهـۀ هـر ذره، «طـور»ی می‌شـود**
**جلـوه‌گاه حسـن جانان خـاص کوه طور نیسـت**
**ذات وصفـش همچو خورشـید جهان پرتو اسـت**
**گرچـه خود دور اسـت، امـا پرتو آن دور نیسـت**
**سـرّ عشـق انـدر دل دیوانـه می‌گیـرد قـرار**
**گنـج پنهـان در میـان خانـۀ معمـور نیسـت**
**در ره جانـان، بسـی عشـاق سـر را باختنـد**
**سـر نهاده در رهش، تنها همین «منصور» نیسـت**
**هرکه از صهبای عشـقش جرعـه‌ای را نوش کرد،**
**التفاتش بر رخ غلمـان و حسـن حـور نیسـت**
**خودبه خود خالص میان جان و جانان حایل است**
**ورنه، جانانش ز جان و جانش از وی دور نیست**

---

۱ . با کسر (راء)

**(٢١)**

دەرکەوتنی دڵدار لەبەرچاوی عاشقان شاراوە نییە
بەڵام مۆڵەتی دەربڕینی لە لای خەڵکی جیهان نەدراوە
شوێنی دەرکەوتنی جوانیی دڵدار تایبەت بەکێوی توور نییە
بۆ عاشقان بەرەی[1] هەر زەڕڕەیەک دەبێتە [کێوێکی] توور
زاتی وەسفی ئەو وەکو هەتاوی تیشکهاوێژی جیهانە
گەرچی خۆی دوورە، بەڵام تیشکەکەی دوور نییە
نهێنیی عیشق لە دڵی شەیدادا جێگیر دەبێت
گەنجی شاراوە لە ماڵی ئاوەداندا نییە
زۆر عاشق لە ڕێی دڵداردا گیانیان لە دەستدا
ئەوەی لە ڕێی ئەودا سەری داناوە تەنیا مەنسوور نییە
هەرکەس قومێکی لە جامی شەرابی ئەو خواردەوە
هەرگیز ڕوو ناکاتە ڕووی غیلمان و جوانیی حۆری
«خالص» خۆی لە خۆیدا دیواری نێوان گیان و دڵدارە
دەنا دڵدارەکەی لە گیانی و گیانی لە دڵدار دوور نین

---

١ . جبهە

## شرح فارسی و کردی غزل ۲۱

شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۲۱

طور:

**عـــاشــقان را جبــهــۀ هــر ذره طوری می‌شــود**
**جلــوه‌گاه حســن جانان خــاص کوه طور نیســت**

طور اشاره به دیدار حضرت موسی پیامبر در کوه طور با خداوند است که گزارش آن در قرآن کریم آمده است. در نزد شاعر عارف در همه جای جهان تجلی خداوند و دیدار انسان و خداوند میسر است و اختصاص به کوه طور ندارد.

توور: شوێنی دەرکەوتنی جوانیی دڵدار تایبەت بە کێوی توور نییە

بــۆ عاشقان بــەرەی هــەر زەڕەیــەک دەبێتە کێوێکی تــوور

"توور" ئاماژە بە دیداری حەزرەتی مووسای پێغەمبەر لە کێوی توور لەگەڵ خوداوەندە، کە هەواڵی ئەو دیدارە لە قورئانی کەریمدا هاتووە، بەلای شاعیر و عارفەوە هەموو جێگایەک لە جیهاندا جێگەی تەجەللیی خوداوەندە و دیداری مرۆڤ و خودا گونجاوە.

ذات و وصفش همچو خورشید جهان و پرتو است... در این مصرع/واو/باید در بین دو واژۀ ذات، وصف و جهان، پرتو بیاید زیرا مقصود شاعر بیان نسبت است یعنی نسبت ذات و وصف یا صفت خداوند همانند نسبت خورشید جهان و پرتو خورشید است و می‌گوید، خداوند مانند خورشید است اگرچه از ما دور است اما پرتو ذات که صفاتش می‌باشد سراسر جهان را فرا گرفته است.

زاتی وەسفی ئەو وەکو هەتاوی تیشکهاوێژی جیهانە:... لەم دێڕە شیعرەدا پیتی /واو/ دەبێ لە نێوان دو وشەی؛ زات و وەسف، جیهان، پەرتەو (تیشک) دا، ببێ لەبەرئەوەی بەیانی نیسبەتە یانی نیسبەتی زات و وەسف، یان سفەتی خوداوەند هەروەک نیسبەتی هەتاوی جیهانە لەگەڵ تیشکی خۆرەتاودا و دەڵێ خوداوەند وەک هەتاوە هەرچەندە لە ئێمەوە دوورە بەڵام تیشکی خورەتاوی زاتی ئەو، کە بریتییە لە سیفاتی خوداوەند سەرانسەری جیهانی داگرتووە.

سرّ عشق اندر دل ویرانه می‌گیرد قرار: اشاره به روایتی که دل شکسته جایگاه خداوند است.

نهێنیی عیشق له دڵی وێراندا جێگر دەبێت: ئاماژە بەڕەوایەتێ کە دڵی شکاو جێگەی خوداوەندە.

... سر نهاده در رهش تنها همین منصور نیست: مقصود حسین بن منصور حلاج است که سر در راه حقّ فدا کرد.

... ئەوەی وا له ڕێی ئەودا سەری دانا تەنیا مەنسوور نییە: مەبەست حوسێن کوڕی مەنسووری حەلاجە، کە سەری لە ڕێگای حەقدا فیدا کرد.

... خود به خود"خالص" میان جان و جانان حایل است: اشاره به بیت معروف خواجه حافظ شیرازی که؛

تو خود حجاب خودی حافظ از میان برخیز.

..."خالص" خۆی له خۆیدا دیواری نێوان گیان و دڵدار: ئاماژە بە دێڕە شیعری خواجە حافزی شیرازیی کە دەڵێ؛

حافز تۆ خۆت پەردەی نێوان گیان و دڵداری، لەم نێوە هەستە و لاچۆ.

**(۲۲)**

**یـارم از دیـر بـرون رفـت و بیفکنـد نقاب**
**زلف آشفته و سرمست و به کف جام شراب**
**رخ برافروختـه و جلوه‌کنـان می‌آمـد**
**نرگسش عربده می‌جست‌و لبش ناز و عتاب**
**چشـم مسـتش نظری کرد به مستان لبش**
**همـه را تـا بـه ابـد نشـئهٔ او کـرد خـراب**
**هـر کجـا روی عزیمـت بنهـد، بخرامـد**
**می‌دود لشـکر جـان در عقب او به شـتاب**
**بزم عشـاق بـه یاد لـب او در طرب اسـت**
**خاصه وقتی که زند مطرب با چنگ و ربـاب**
**خـالصـا! شـیوهٔ اربـاب محبـت باشـد**
**نالـهٔ نیـم شـب و سـوز دل و چشـم پرآب**

**(٢٢)**

یــارم لە دەیری ڕەبەنــان چووە دەر و دەمامکی فڕێدا
پەرچەم ئاڵۆز و سەرخۆش و پیــاڵەی شەراب بە دەستەوە
بە ڕوخســاری تووڕەوە خــــۆی دەنــواند و دەهــات
چــاوی لە شەڕ دەگەڕا و لێوی نــاز و لۆمەی دەفرۆشت
چاوی مەســتی ئاوڕێکی لەسەرخۆشــانی لێوی دایەوە
نەشــەی ئــەو هەموویــانی بۆ هەمیشــە مەســت کرد
ڕووی ڕۆیشــتن بکاتــە هەرلایــەک و بــە نــاز بــڕوات
لــە شــکری گیــان بــە پەلــە بــە شــوێنیدا دەڕوات
بەزمــی عاشــقان بــە یــادی ئــەو پــڕ لــە شــادییە
بەتایبــەت کاتێ کە موتریب چــەنگ و ڕوباب لێدەدات

ئــەی «خالص»! بەش و شــێوەی میهرەبـانـان
ناڵەی نیوەشەو و ســۆزی دڵ و چاوی پڕ لە ئاوە

## شرح فارسی و کردی غزل ۲۲
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۲۲

دیر: دیر محل و موقف عبادت راهبان و راهبات است و در اصطلاح عارفان و متصوفه معانی چند دارد. از جمله: عالم انسانی را گویند. (اصطلاحات فخرالدین عراقی، ریاض العارفین، ص ۳۹)
دەیر: دەیر جێگای عیبادەتی راهبی پیاو، و راهبی ژنە و لە ئیستیلاحی عارفان و موتەسەوفەدا چەن مانای هەیە، بۆ نموونە دەیر بە عالەمی ئینسانی دەڵێن. (اصطلاحات فخرالدین عراقی، ریاض العارفین، ص ۳۹)

زلف: زلف موی مجعد در سر است و در اصطلاح صوفیان کنایت است از مرتبت امکانیه از کلیات و جزئیات و معقولات و محسوسات و ارواح و اجسام و جواهر و اعراض. زلف کنایت از ظلمت کفر است.
عراقی گوید؛ زلف غیبت هویت را گویند که هیچ کس را بدان راه نیست. (تذکرهٔ ریاض العارفین، ص ۳۹؛ اصطلاحات فخرالدین عراقی)
و درازی زلف جانان اشارت به عدم انحصار موجودات و کثرات و تعینات است و چنان که زلف پردهٔ روی محبوب است هر تعینی از تعینات حجاب و نقاب وجه واحد حقیقی است. (شرح گلشن راز، ص ۵۷۷)
زولف: زولف مووی لوول و بە یەکداچووی سەرە و لە زاراوەی سۆفیاندا کینایە لە پلە و پایەی ئیمکانیە بەگشتی و بەتاک، هەروەها مەعقوولات و مەحسووسات و ئەرواح و ئەجسام و جەواهیر و ئەعراز، هەروەها کینایە لە زوڵمەتی کوفرە. عێراقیی هەمەدانی دەڵێ؛ زولف بە غەیبەتی هوڤیەت دەڵێن کە هیچکەس رێی تێ نابا وە نایدۆزێتەوە. (تذکرهٔ ریاض العارفین، ص ۳۹؛ اصطلاحات فخرالدین عراقی)
درێژیی زولفی دڵدار ئاماژەیە بە نەبوونی ئینحساری مەوجوودات و کەسەرات و تەعەیوونات، هەروەها زولف پەردەی رووی مەحبووبە و هەر تەعەیونێ لە تەعەیوناتی پەردە و حیجاب و نیقاب روومەتی واحدی حەقیقیە. (شرح گلشن راز، ص ۵۷۷)

جام شراب: دل شیخ است که پر از بادهٔ معرفت و تجلیات انوار حق است.
جامی شەراب: دڵی شێخە کە پڕ لە بادەی مەعریفەت و تەجەلیاتی ئەنواری حەقە.

**رخ بـــــر افـــروختــه و جـــلوه‌کنـان می‌آمــــد**
**نرگســش عربــده می‌جســت و لبش نـاز و عتاب**

جناب شیخ عبدالرحمن در این بیت اشاره به دو بیت معروف از خواجه حافظ شیرازی دارد که؛

**دوش می‌آمد و رخساره برافروخته بود      تا کجا باز دل غمزده‌ای سوخته بود**

(رک دیوان حافظ، غزل ۲۱۱، ص ۳٤٦)

**نرگســش عربده جوی و لبش افســون‌کنان**
**نیم شــب دوش به بالین من آمد بنشســت**

(رک دیوان حافظ، غزل ۲٦، ص ۹۳) نسخه د. حسینعلی یوسفی

بە ڕوخساری تووڕەوە خۆی دەنواند و دەهات
چاوی بۆ شەڕدەگەڕا و لێوی ناز و لۆمەی دەفرۆشت
حەزرەتی شێخ عبدوڕەحمان لەم دێڕە شیعرەدا ئاماژەی بە دوو دێڕە شیعری بەناوبانگی حافزی شیرازی کردووە کە دەڵێ:
دوێنێ دەهات و ڕوخساری تووڕەبوو
داخۆ لە کوێ دیسان دڵی خەم لێدراویک سووتابوو
(بڕوانە ← دیوان حافظ شیرازی، غزل ۲۱۱، ص ۳٤٦)
چاوی نێرگسی بۆ هەرا و هوریا دەگەڕا و لێوی بە ئەفسوون‌کردنەوە
دوێنێ نیوەی شەو هاتە سەرینم و دانیشت
(بڕوانە ← دیوان حافظ شیرازی، نسخهٔ د. حسینعلی یوسفی، غزل ۲٦، ص ۹۳)

**(۲۳)**

**ما محرم سـلطانیم، هی هـی جبلی، قم قم!**
**مـا صاحب دیوانیم، هی هـی جبلی، قم قم!**
**دریـای طریقـت را، درهـای[1] حقیقـت را**
**مـا گوهـر غلطانیم، هی هی جبلـی، قم قم!**
**در عالـم جسـمانی، در زمـرهٔ روحانـی،**
**مـا مظهر جانانیـم، هی هی جبلـی، قم قم!**
**خورشـید حقیقـت را، مـا مطلـع انواریـم**
**مـا، پرتـو تابانیم، هـی هی جبلـی، قم قم!**
**از بحـر قـدم[2] جوییم، نه اوییـم و هم اوییم**
**زین حادثه حیرانیم، هی هی جبلی، قم قم!**
**در میکـدهٔ کثـرت، خوردیـم مـی وحدت**
**مـا زمرهٔ مسـتانیم، هی هی جبلـی، قم قم!**
**مـا، «خالص» ناسـوتیم، مست می لاهوتیم**
**هم صورت رحمانیم، هی هی جبلی، قم قم!**

---

۱ . با ضم (دال)

۲ . با کسر (قاف)

**(٢٣)**

ئێمە مەحرەمی پادشاین، ڕابــە چیایی! هەستە هەستە!
ئێمە خـــاوەن دیــوانــین، ڕابــە چـیـایـی! هەستە هەستە!
ئێمە بــۆ دەریـــــای تــەریـقــەت و مـــرواریـــی حەقیقەت
گـەوهــەری خـلـۆرەوەبـوویـن، ڕابــە چیایی! هەستە هەستە!
لــە عـالــەمــی جیسمانی و لــە جـەمـعـی ڕووحـانـیـیـانـدا
ئێمە نوێنگەی عاشقایەتین، ڕابــە چیایی! هەستە هەستە!
ئـێـمـە ئـاسـۆی دەرکـــەوتــــنی هـــەتـــاوی حەقیقەتین
ئێمە تیشکی درەوشـــاوەیـــن، ڕابــە چیایی! هەستە هەستە!
ئێمە جۆگەلەیەکی دەریای قیدەمین، هەم عیشق و هەم ئەوینین
ســەرمــان لــەم ڕووداوە ســورِمـــاوە، ڕابـــە چیایی! هەستە!
لـە مەیخانەی زۆریـــدا، بـــادەی یەکتاییمان خــواردۆتــەوە
ئێمە جەمعی ســەرخـۆشـانـین، ڕابـــە چـیـایـی! هەستە!
ئێمە «خالص»ی جیهانی ماددەین، سەرخۆشی بادەی لاهووتین
ڕوخســـاری ڕەحمـــانیشین، ڕابە چیـــایی! هەستە هەستە!

* ئەم پارچە شیعرە لەسەرەتای دەست پێکردنی زیکر لە ڕۆژانی هەینی لە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک: بە ئاوازێکی تایبەتەوە دەخوێندرێ.

## شرح فارسی و کردی غزل ۲۳

شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۲۳

ما محرم سلطانیم هی هی جبلی قم قم...

جناب شیخ عبدالرحمن خالص این غزل را به استقبال غزل جناب نور علیشاه نعمت‌اللهی از اقطاب طریقهٔ نعمت‌اللهیه که در بخش مخمس‌ها به احوال او خواهیم پرداخت، سروده است. دو سلسلهٔ طالبانی قادری و معصومعلیشاهی نعمت‌اللهی هر دو از هند به ایران و بین‌النهرین آمده‌اند. نورعلیشاه به دنبال درگیری با علما و فقهای ایران مدتی در ذهاب و سپس عراق به سر برده و چنان می‌نماید که با پیران طالبان دیدار و ملاقات و دوستی داشته است و به همین سبب جناب خالص ایشان را (نورعلی) عنوان کرده و وارد القاب و تشریفات طریقتی نشده است. غزل جناب نورعلیشاه چنین است:

**ما ابـــر گهربـاریم هی هی جبلی قـم قـم**

**مـا قلزم زخّاریـم هی هی جبلـی قـم قـم**

**گر نور خـــدا جـــویی بیهوده چـه می‌پویی**

**مـا مشـرق انواریـم هی هی جبلـی قم قم**

**اســرار نهـــانی را گــر فاش و عیان خواهی**

**ما مخـزن اسـراریم هی هی جبلـی قم قم**

**این روز تو همچون شـب گر تیره و تاریک است**

**ما شـمع شـب تاریم هی‌هی جبلـی قم قم**

**با قـافلهٔ وحـدت گر ز آنـــکه سـری داری**

**ما قـــافله سـالاریم هی هــی جبلی قم قم**

**مـا رند قدح نوشـیم از نـام و نشـان رسته**

**در میکـده خمـاریم هی هــی جبلی قم قم**

**در روز ازل با حــــق چون قـول بلی گفتیم**

**ما بر سـر اقراریـم هی هی جبلـی قـم قم**

**بـا جنـت و بـا دوزخ مـا را نبود کـاری**
**مـا طالـب دیداریم هی هی جبلـی قم قم**
**مـا بـاقی بـالله ایم فـانی ز خودی[1] خود**
**منصـور سـرِ داریم هی هـی جبلی قم قم**
**در اول و در آخـر در ظاهـر و در بـاطن**
**مـا پرتو دلداریـم هی هی جبلـی قـم قـم**
**در طـور لقـای حـق "رب أرنی" گویـان**
**مسـتغرق دیداریم هـی هی جبلـی قم قم**
**ای زاهـد افسـرده! رو طعنه مزن بر مـا**
**ما آه شـرربارِیم هـی هی جبلـی قـم قـم**
**در میکـدهٔ وحدت چـون "نور علی" دایم**
**مسـت می جباریم هـی هی جبلـی قم قم**

(دیوان نورعلیشاه، ص ۱۱۷)

در غزل جناب شیخ عبدالرحمن آنچه بیشتر جلب توجه می‌کند این است که می‌فرماید؛ ما مظهر جانانیم... اعتناء و اعتقاد ایشان به مظهریت و خود را مظهر جانان دانستن در عرفان اسلامی سخن و ادعای بزرگی است که کمتر کسی توان بیان آن را دارد.

ئێمە مەحرەمی پادشاین، ڕابە چیایی! هەستە!

حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمانی خالص ئەم غەزەلەی بە پێشوازیی ئەو شیعرەی حەزرەتی نوورعەلی‌شای نیعمەتولایی لە ئەقتابی تەریقەتی نیعمەتولایی هۆنیوەتەوە، کە لە بەشی پێنجخشتەکییەکانی ئەم دیوانەدا بە سەرهاتی نووسراوە، دوو زنجیرەی تاڵەبانی قادری و مەعسووم عەلیشایی نیعمەتولایی بە یەکەوە لە هیندوستانەوە بەرەو ئێران و میزوپوتامیا بەڕێ‌کەوتن، نورعەلی‌شا بەدوای کێشەو ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ عولەمای شەریعەت لە ئێران هەڵات، ماوەیێ لە شاری زەهاو

[1]. با شد ای/

بوو، جا بەرەو عیراق (گەرمیان و کەرکووک) بەڕێ کەوت، وا دەردەکەوێ، کە لەگەڵ پیرانی تاڵەبان چاوپێکەوتن و برادەری و دۆستایەتییان هەبووە و هەر بەو هۆیەوە حەزرەتی خالص عینوانی نوورعەلی بۆ نووسیوە و چاوپۆشیی لە نازناوی تەریقەتی و تەشریفاتی خانەقایی کردووە، لەبەرئەوەی غەزەلەکەی حەزرەتی نوورعەلیشام بە فارسی لەسەرەوە هێناوە لێرەدا درێژەی پێ نادەم و تەنیا مەتلەعی غەزەلە، کە وەردەگێڕمە سەر زمانی کوردی:

ئێمـــە هـــەورێکین گەوهەر دەبـارێنین   ڕابە چیایی! هەستە، هەستە

ئێمەدەریای پڕلەخەزینەین ولیواولێوین   ڕابەچیایی!هەستە،هەستە...

لەم غەزەلەی حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحماندا ئەوەی لە هەموو وشەیێ سەرنجڕاکێشترە ئەوەیە کە دەفەرمووێ؛ (ما مەزهەر جانانیم) واتە ئێمە نوێنگەی دڵدارین...

باوەڕ بە مەزهەریەت و خۆبەمەزهەرو نوێنگەی گیانان = خوداوەند زانین لە عیرفانی ئیسلامیدا وتە و بانگەشەیەکی گەورەیە، کە کەمتر کەسێ لە عارفان توانیویانە ئەو باسە بکەن.

قِدَم: در اصطلاح صوفیه عبارت از سابقه‌ای است که حکم کرده است به آن حق بر بنده ازلاً و کامل می‌شود بنده بدان. (کشاف، ص ۱۲۱۱)

بحر، کنایه از لایتناهی بودن است.

قیدەم: قیدەم لە ئیستیلاحی سۆفیدا عیبارەتە لە پێشینەیێ، کە خوداوەند لە ئەزەل و مێژووی بێ‌سەرەتاوە بە سەر بەشەریدا سپاندوە و مرۆڤ بەو پێشینەیە کامیل دەبێ. (کشاف، ص۱۲۱۱)

بەحر، کینایە لە بەربڵاویی و بێ‌سنووریە

حیران: حیرت ر.ک شرح غزل‌های پیشین

حەیران: حەیرەت، بڕوانە شرۆڤەی غەزەلە کانی پێشوو.

میکدهٔ کثرت: محل مناجات بنده با حق را گویند به طریق محبت.
مەیکەدەی کیسرەت: کیسرەت واتە فرەیی، بەجێگای وتووێژی سالیک لەگەڵ خوداوەندا دەڵێن بە ڕێگای مەحەبەت.

می وحدت: می غلبات عشق را گویند. می وحدت غلبهٔ عشقی ربانی که به یگانگی معشوق و توحید رهنمون آید.
مەیی وەحدەت: مەی بە غەلەبە و سەرکەوتنەکانی عیشقی ئیلاهی دەڵێن، مەیی وەحدەت سەرکەوتنی عیشقی ڕەببانیە کە ڕێنموونی سالیکە بۆ یەکدانەیی مەعشووق و یەکبوونی خوداوەند.

خالص ناسوت: ایهام دارد به این که شاعر عارف تخلص (خالص = ناب) خود را به عالم مادی نسبت می‌دهد و دوم او ناب و زلال در جهان جسم است
خالصی ناسوت: ئەم تەرکیبی ئیزافە، ئیهامی تێدایە بۆ ئەوە شاعیر عارف نازناوی؛ خالص واتە بێخەوش و بێدەخەڵە، خۆی دەداتە پاڵی جیهانی سروشتەوە و دووەم کە خۆی بی‌خەوش و بێدەخەڵ لە جیهانی لەش دایە.

مست می لاهوت: مست فرو گرفتن عشق است. جمیع صفات درونی را و آن عبارت از سکر است که عارفان کامل از بادهٔ هستی مطلق سرمست شده و محو الموهوم گشته از خود بیخود می‌شوند.
لاهوت؛ الوهه، خداوندی، در اصل لاه به معنی اله بوده، /واو/ و /تا /برای مبالغه به آن افزوده شده مانند واو و تای جبروت و ملکوت. می لاهوت؛ عشق خداوند.
مەستی مەیی لاهووت: مەست یانی، باڵکێشانی عیشق بەسەر هەموو سیفاتی دەروونیدا و ئەوە عیبارەتە لە عالەمی سوکر کە ئیستیلاحە، ئەو کاتەی کە عارفان لە بادەی هەستی موتلەق واتە بۆنی تەواو سەرمەست دەبن و لەبەرابەریاندا پلەی وەهم لەنـــاودەچێ و بەپایەی ڕاستەقینە دەگەن و لە خۆ دەچنە دەر.

لاهووت یا ئولووهەت، واتە خوداوەندی، لە بنەمادا (لاە) سەرەتای وشە بە مانای ( اله) و /واو/ و /تی/ = /وت/بۆ موبالیغە و زۆرکردنی پلە و پایەیە وەک /ووت/ لە جەبەرووت و مەلەکووتدا، مەیی لاهووت، عیشقی خوداوەند.

هم صورت رحمانیم: اشاره به نام خود دارد "عبدالرحمن"، این سخن نیز ادعای فرازمندی است و به مظهر جانان برمی‌گردد که در آغاز و مطلع غزل دربارۀ آن سخن گفتیم.

هەم سوورەتی ڕەحمانیم: ئاماژە بە ناوی خۆی دەکات و ئێمە ڕوخساری ڕەحمانین، بانگەشەییێکی زۆر بەرزە کە دەگەڕێتەوە بۆ مەزهەری جانان یا گیانان کە لەسەرەتای غەزەلەکەدا باسمان کرد.

**(۲٤)**

غیــر حق در چشــم حق بین، می‌نماید چون ســراب
هر که مطلق شــد ز قید ما و من، رســت از عذاب
بــر رخ لامــع میــان جــان و جانــان نقش تســت
خط هســتت پاک شــو، باشــی ز جان تا بهره‌یاب
اصــل، یــک دریاســت مطلــق از قیودات شــئون
کــی مقیــد می‌شــود در صــورت مــوج و حبــاب
وحــدت از کثــرت نیابــی تــا تــو انــدر کثرتــی
محــو شــو از خویــش و مطلق از قیودات حســاب
مســت و بیخود از شــراب ســر[1] وحدت گشته گم
خــط کثــرت محــو گردانــم ز ســیلاب شــراب
پیــر ما، در بــزم رندان دوش می‌گفت این ســخن:
ســر[2] حــق پنهــان کنیــد از زاهــدان دل خــراب
جان «خالص» روز و شب در بحر وحدت نکته‌گوست
صبــر و آرامی نــدارد، همچــو ماهــی انـــدر آب

---

۱ و ۳. باشد (راء)

**(٢٤)**

له چاوی حەقبیندا جگه له حەق، هەموو شتێک وەک تراویلکه دەنوێنێت
هەرکەس له بەندی «من و ئێمه» دوور کەوتەوە، له ڕەنج و عەزاب ڕزگاریی هات
لەسەر ڕوخساری درەوشاوە ، نەخشی تۆ له نێوان گیان و گیاناندایه
له هێڵی بوون پاک ببەوە، تا له گیان بەهەرەوەر بی
ئەسڵ، دەریایەکە له بەندی شئوون ڕزگار بووە
[دەریای ئەوتۆ] کەی بە شەپۆل و بڵق زنجیر دەکرێت؟
هەتا خۆت له زۆریدا بیت یەکتایی له زۆریدا نادۆزیەوە
له خۆت پاک بەرەوە و له قوڵف و بەندی حیسابات ئازاد بە!
من به شەرابی نهێنییەکانی یەکتایی سەرخۆش و بێخود بووم[1]
هێڵی زۆری بە سێلاوی شەراب دەسڕمەوە
دوێشەو پیری ئێمه له بەزمی مەیئۆشاندا ئەمقسەیەی دەکرد
نهێنییەکانی حەق له زاهیدی دڵ چەپەڵ بشارنەوە!
گیانی «خالص» ڕۆژ و شەو قسەی خۆشی دەریای یەکتایی دەکات و
وەک ماسی نێو ئاو ئۆقرە و ئارامی نییە

---

١ . له دەقەکەدا نووسراوە «....گشته گم» واته سەرخۆش و بێخود له شەرابی یەکتایی، ون بووە، لام وایه هەڵەیه و دەبێ «گشتەام» بێت، واته: من له شەرابی وەحدەت سەرخۆش و بێخود بووم».

## شرح فارسی و کردی غزل ۲٤
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۲٤

مطلق شدن: جدایی از عالم جسم و آزادبودن از بند مادیات و هوس‌ها و غرایز.
موتلەق بوون: جیابوونەوە لە جیهانی سروشت و لەش و ئازادبوون لە بەندی هەوا و هەوەس.

قید: بند، زندان
قەید: بەند، زیندان

خطّ: اشارت است به تعینات عالم ارواح که اقرب مراتب وجود است و گفته شده است که مراد از خطّ، عالم کبریایی است که عالم ارواح مجرده است که اقرب مراتب وجود است با مرتبت غیبت هویت.
خەت: هێڵ = ئاماژەیە بۆ تەعەیوناتی عالەمی ئەرواح کە نزیکترین مەرتەبە لە مەراتبی وجوودە و گوتراوە کە مراز لە خەت، جیهانی کیبریاییە کە عالەمی ئەرواحی موجەڕدە و پلەی نەمانی شوناسی زاهیریە.

محو شدن: محو در لغت پاک کردن نوشته است از لوح و نزد صوفیان عبارت از محو اوصاف عادت است همان طور که اثبات اقامهٔ احکام عادت است و بر سه طریق، محو زلت از ظواهر و محو غفلت از ضمائر و محو علت از سرائر.
محو عبارت است از دور کردن اوصاف نفوس.
مەحو: مەحو بە مانای سڕینەوەی نووسراوە لەسەر لەوحە و لە لای سۆفیان بریتییە لە سڕینەوەی ئەوسافی عادەت هەر وەک پێبەجێبوون ئیقامەی ئەحکامی عادەتە و بە سێ ڕێگە دەناسرێت؛ یەکەم سڕینەوەی ترس و نەزاری لە زاهیر، دووەم سڕینەوەی نائاگایی لە بیروڕا و سێیەم سڕینەوەی عیللەت لە سەرائیر واتە نهێنییەکان.

**مست و بیخود از شراب سرّ وحدت گشته گم**
**خطّ کثـــرت محـــو گردانم ز سیلاب شراب**

مصرع اول نفی منیّت است، این بیت تفسیر مرحلهٔ یقین و پشت‌سرگذاشتن عالم کثرت و رسیدن به وحدت کامل و خنثی‌نمودن تأثیر عوامل جسم مادی است. سرّ، الطف از روح است و سرِّ وحدت پیوند سرّ به اصل خود می‌باشد. خطّ که شرح آن گذشت، مقصود محو کثرت روحانی است و شاعر در اینجا به روشنی عبور از مرحلهٔ جسمانی و روحانی و ورود به دایرهٔ ربانی را برای خودش بیان می‌دارد.

من به شەرابی نهێنییەکانی یەکتایی سەرخۆش‌و بێخود بووم
هێڵی کیسرەت "زۆری" بە سێـڵاوی شەراب دەسڕمەوە

میسرەعی یەکەم سڕینەوەی مەنییەتە، ئەم شیعرە شرۆڤە و ڕوونکردنەوەی پلەی یەقین و پەڕینەوە لە جیهانی کیسرەت و زۆری بینینە و گەییشتنە بە وەحدەت و یەکدانەیی کامیل و لە ناو بردنی کاریگەریی هۆکارەکانی لە شی سروشتیە.

سڕ، نەرمونیانتر و ناسکتر لە ڕۆحە و سڕی وەحدەت و یەکدانەیی پێوەندە بە بنەمای خۆ، مەبەست لە خەت، یان هێڵ کە لە شرۆڤە و ڕوونکردنەوەکانی پێشوودا هاتووە سڕینەوەی کیسرەت و زۆریی ڕووحانیە، شاعیر لیرەدا بە ڕوونی پەڕینەوە لە قۆناغی جیسمانی و ڕووحانی و گەییشتن بە بازنەی ڕەببانی بۆخۆی دەر دەبڕێ.

**جانِ خالص روز و شب در بحر وحدت نکته‌گوست**
**صبـــر و آرامـــی ندارد همچـــو مـــاهی اندر آب**

بحر مقام ذات و صفات بی‌نهایت حق است که تمام کائنات امواج بحر نامتناهی اویند، عالم وجود کلی است.

مقام وحدت بحر است و مقام کثرت امواج بحرند. (شرح گلشن راز، ص ۲۹۹) جان را به ماهی تشبیه کرده است و ماهی عبارت از عارف کامل است که مستغرق بحر معرفت است که هیچ گاه در دریا ناپدید نمی‌شود و جدایی از دریا برای او مقدور نیست.

گیانی خالص! ڕۆژ و شەو قسەی خۆشی دەریای یەکتایی دەکات و

وەک ماسی لە نێو ئاو ئۆقرە و ئارامی نییە.

بەحر لە زاراوەی تەسەوفدا مەقامی زات و سیفاتی بێنیهایەتی حەقە کە تەمامی کاینات شەپۆلی بەحری بێسنووری ئەو زات و سیفاتەن و جیهان وجوودێکی گشتییە.

مەقامی وەحدەت بەحرە و مەقامی کیسرەت شەپۆلی بەحر. شاعیر، گیانی بە ماسی شوبهاندوە، ماسی بریتییە لە عارفی کامیل کە لە بەحری ماریفەتدا مەلەوانی پسپۆڕە و هیچ کاتێ لە بەحردا ون نابێ و جیابوونەوە لە بەحر بۆ ئەو شتێکی نەگونجاوە.

(۲۵)

دل از کفم برون شد آن شوخ بی‌وفا را
جان تیــر غمزهٔ او از دســت برد ما را
در کوچهٔ محبت از نقد جان گذشتیم
آخــر تلطفی کــن احوال ایــن گدا را!
در مجلــس مغانم، ســاقی! بیار جامی
با یــاد روی جانان، مطــرب! بگو نوا را
اسرار عاشــقان را از زاهدان مجویید
از آشــنا بپرســید احــوال آشــنا را
آیینهٔ جمالت مطلب‌نمای جان اســت
بنمای تا که چشــمم بیند در او خدا را
در کوی خوبرویان رسم است بی‌وفایی
مأمول کی توان کرد از خوبرو، وفا را؟
«خالص»! به عشــق خوبان باید بلا کشیدن
نشــنیــده و ندیــده کس عشــق بی‌بـــلا را

**(٢٥)**

دڵــم بــۆ ئــەو شۆخە بــێ وەفــایــە لــە دەســـت دەرچـــووە
تــیری غــەمــزەی ئــەو، گیـــانی لــە دەســـت سەندین
لە کۆڵانی خۆشەویستیدا دەستمان لە نەغدینەی گیان هەڵگرت
دەی تــۆش کەرەمێک بە حاڵی ئــەم سواڵکەرە بکە
ســاقــی! مــن لــە کــۆڕی مــوغــانــدام؛ جامێکم بــۆ بێنە
موتریب! بــە یــادی ڕوخـــساری دڵـــدار ئــاوازێــک بڵێ
نهـــێــنــیــی عـــاشـــقـــان لـــە زاهـــیــــدان مـــەپـــرســـن
ئــەحــواڵــی نــاســیــاوان دەبـــێ لــە نــاســیــاو بپرسرێت
ئاوێنەی ڕوخـــســـارت مەتڵەبی گیان پیشان دەدات
[کەوابوو، ڕوخسارت] بنوێنە تاوەکو چاوم خودای تێدا ببینێت
بێوەفـــایی ڕەســـــم و دابــــی گــەڕەکــی جوانـــانە
کــەی دەتــوانــرێــت لــە جــوانــان وەفــا ئـــارەزوو بکرێت؟
«خالص»! لە عیشقی جواناندا دەبێ [باری] بەڵا بکێشی
کــەس نەیدیوە و نـــەیبیستوە عیشقی بێ بەڵا هەبێت

## شرح فارسی و کردی غزل ۲۵
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۲۵

این غزل استقبال از غزل خواجهٔ شیراز است که فرمود:

**دل مـی‌رود ز دسـتم صاحـب‌دلان خـدا را**
**دردا کـه راز پنهـان خواهـد شـد آشـکارا...**

(رک، دیوان حافظ، د. حسینعلی یوسفی، غزل ۵، ص ٦٣)

دل: دل در اصطلاح، معانی مختلفی دارد، در شرح گلشن راز است که دل پیش این طایفه عبارت از نفس ناطقه است و محل تفصیل معانی است و به معنی مخزن اسرار حق است که همان قلب است.

کاشانی گوید: مراد از دل به زبان اشارت آن نقطه است که دایرهٔ وجود از دور حرکت آن به وجود آمد و بدو کمال یافت و سرّ ازل و ابد به هم پیوست و مبتدای نظر در وی به منتهای بصر رسید و جمال و جلال وجه باقی بر او متجلی شد و عرض رحمان و نزل قرآن و فرقان و برزخ میان غیب و شهادت و روح و نفس و مجمع‌البحرین ملک و ملکوت و ناظر و منظور شد. (کشاف، ج ۲، ص ۱۵۵۷)

ئەم غەزەلە پێشوازی لە و غەزەلە ی حافزی شیرازییە کە دەڵێ:

دڵ لە دەستم دەڕوا ئەی خاوەندڵان بۆ خاتری خودا
ئـەی هـاوار کـە نهێنییەکان ئـاشـکرا دەبـن

(بڕوانە، دیوان حافظ، د. حسینعلی یوسفی، غزل ۵، ل ٦٣)

دڵ: دڵ لە ئیستیلاحی تەسەوفدا، مانای جۆراوجۆری هەیە، لە کتێبی شەرحی گوڵشەنی رازدا هەیە کە دڵ لە بیروڕای تایفەی سۆفیاندا عیبارەتە لە نەفسی ناتیقە و جێگای پەرەپێدانی مەعانیە و بە مانای مەخزەنی ئەسراری حەقە کە مەبەست هەمان قەلبە.

کاشانی دەڵێ: مراز لە دڵ بە زمانی ئاماژە و ئیشارەت ئەو خاڵەیە کە بازنەی وجوود لە خولانەوە و دەوری بزاڤی ئەو پێک دێ و بە یارمەتیی ئەو بە کەمال دەگا و نهێنیی ئەزەل و ئەبەد بەیەکەوە پێوەند دەدا و سەرەتای نەزەر

و بیروڕا لەودا بە کۆتایی بەسەر و بینین دەگا و جەمال و جەلالی ڕوومەتی ئەمر لەسەر دڵ موتەجەللی دەبێ و عەرشی ڕەحمان و مەنزلی قورئان و فورقان و بەرزەخ لە نێوان نهێنی و ئاشکرادا ڕۆح و نەفس و مەجمەعولبەحرەینی مڵک و مەلەکووت و نازر و مەنزوور بووە.(کشاف، ج ۲، ص ۱۵۵۷)

**اســرار عاشــقان را از زاهــدان مجوییــد**
**از آشـنـــا بپرسـید احـوال آشـنــا را**

آشنا متعلق به خدا و بیگانه از خود، تعلق ربقۀ ربوبیت را گویند که به موجودات پیوسته است. چون تعلق خالقیت به مخلوق و نیز عبارت از دقیقۀ ربوبیت است که با همۀ مخلوقات پیوسته است. (کشاف، ص ۱۵۵۱)

اسرار جمع سرّ؛ بمعنای راز است و تفاوت آن با رمز این که راز ناگشودنی است اما رمز کشف و گشوده می‌شود. عارف زهد و ظواهر را موجب دریافت اسرار نمی‌داند و عشق و عاشق و آشنا را برای آگاهی از اسرار معرفی می‌کند.

نهێنیی عاشقان لە زاهیــدان مــەپرسن
ئەحواڵی ناسیاوان دەبێ لە ناسیاو بپرسرێت

ناسیاو لە ژێر ئەمری خوداوەند دایە و لە خۆی بیانی و بێگانەیە، تەعەلوق واتە خۆ بەستن و هەڵواسراو بە گورسی رووبووبیەتی خوداوەندەوەیە، دەڵێن، کە بەسراوە بە هەموو هەستەکانەوە، وەک بەستن و هەڵواسینی ئەفرێنەر بە ئەفرێندراو، هەروەها بریتییە لە کات و ساتی خوداوەندیی پەروەردگار کە بەسراوە بە گشت ئەفرێندراوەکانەوە. (کشاف، ل۱۵۵۱)

ئەسرار، نهێنیەکان جەمعی وشەی سرڕە، واتە نهێنی، سرڕ بە مانای ڕازە، جیاوازیی ڕاز لەگەڵ ڕەمزدا ئەوەیە کە ڕاز ئاشکرا نابێ و ناکرێتەوە، بەڵام ڕەمز ئاشکرا دەبێ و دەکرێتەوە، عارف زوهد و زاهیر بە هۆی وەرگرتنی ئەسرار نازانێت و عیشق و عاشق و ناسیاو بۆ ئاگاداری لە ئەسرار و نهێنیەکان دەناسێنێت.

غمزه: غمزه حالتی است که از برهم‌زدن و گشادن چشم محبوبان در دلربایی و عشوه‌گری واقع می‌شود و برهم‌زدن چشم کفایت از عدم التفات و گشادن چشم اشارت به مردمی و دلنوازی است و آثار این دو صفت است که موجب خوف و رجا است و نیز غمزهٔ اشارت به استغناء و عدم التفات است که از لوازم چشم است و اشارت به مرتبت فناست. (شرح گلشن راز، ص ۵۷۳)

خەمزە: خەمزە شێوەیەکی ڕوانینە لە کردنەوە و قووچاندنی چاوی مەحبوبان لە دڵبەری و عیشوەگەریدا و قووچاندنی چاو کینایە لە نەبوونی ئیلتیفاتە و کردنەوەی چاو ئاماژەیە بەهاوڕێیی و دڵنەوازی و کاریگەریی ئەم دوو سیفەتەیە کە دەبێ بە مایەی خەوف و ڕەجاء، هەروەها خەمزە؛ ئیشارەیە بۆ بێنیازی و نەبوونی ئیلتیفات کە لە پێویستیەکانی چاوە و ئاماژەیە بۆ مەرتەبەی فەنا. (شرح گلشن راز،ص ۵۷۳)

**آیینهٔ جمــالت مطلب‌نمای جان است**
**بنمای تا که چشــمم بیند در او خدا را**

عارف در جمال زیبا خدا را می‌بیند. چنانکه گویند:

"نظر بر منظر خوبان حلال است　　نظر بر صنع ذات ذوالجلال است"

یا

"آن گلستانی که دام اولیاست　　عکس مەرویان بستان خداست"

جمال: رک شرح‌های پیشین

ئاوێنەی ڕوخسارت مەتڵەبی گیان پیشان دەدات

[کە وابو، ڕوخسارت] بنوێنە تا وەکو چاوم خودای تێدا ببینێت

عارف لە ڕوخساری جواندا خودا دەبینێ هەروا کە وتوویانە:

نــوارین بۆ ڕوخساری جوانان حــەلالە
وەک نوارین بۆ هونەری زاتی خوداوەندە

یان:

ئەو گوڵســتانەی کە ئەولیا سەرسام دەکا و ڕاویان دەکا
وێنــەی جوانیی مانگ‌ڕوخســارانی باغــی خــوداوەندە

جەمال: بڕوانە شرۆڤەکانی پێشوو.

**"خالـص" بـه عشــق خوبـان بایـد بـلا کشــیدن**
**نشــنیــده و نــدیــده کــس عشــق بی‌بـــلا را**

عشق و بلا دو واژۀ آمیخته‌اند از آغاز تا امروز تمام عشق‌ها با بلا آغاز و با خون پایان یافته است و عشقِ عارف که عبور از سه مرحلۀ عشق جسمانی و روحانی تا رسیدن به عشق ربانی است، بلای خاص خود را دارد.

مولوی گوید:

**عشق اول سرکش و خونی بود   تا گریزد هر که بیرونی بود**

حافظ که دیوانش با عشق آغاز می‌شود، در بیت اول دیوانش می‌گوید:

... که عشق آسان نمود اول ولی افتاد مشکلها...

«خالص!» له عیشقی جواناندا دەبێ [باری] بەڵا بکێشی
کەس نەیدیوە و نەیبیستوە عیشقی بێ‌بەڵا هەبێت

وشەی عیشق و بەڵا دوو وشەی تێکەڵاون لەسەرەتاوە تا ئەمڕۆ هەموو عیشق و عیشقێک هاورێ لەگەڵ بەلادا بووە و بە خۆین و کوشتن دوایی هاتووە، عیشقی عارف، کە بە پەڕینەوە لە سێ پلەی عیشقی جیسمانی و ڕووحانی تا گەیشتن بە عیشقی ڕەببانییە، بەڵا و کێشەی تایبەتی خۆی هەیە،

مەولەوی دەڵێ:

**عیشــق لەســەرەتا دا ســەرەذۆ و خوێناویــه**
**بــا هەرکــەس بیانیــه لێــی دوور کەوێتــەوە**

حافزی شیرازی،کە دیوانی شیعرەکانی بە عیشق و عیشق دەس پێ دەکات، لە دێڕی یەکەمی دیوانەکەیدا دەڵێ... کە عیشق لەسەرەتادا ئاسانی نواند بەڵام، کارەساتەکان دەرکەوتن.

(۲٦)

ای جـان جهـان بـس کـه منـزّه ز نشـانی
بـر هـر چه گمـان پی بـرد آنی، تـو نه آنی
بـا آیـت آفـاق در آیینـهٔ انفـس
هـر لحظـه ز نـو در سـریان و جَوَلانـی
در عیـن عیـان از نظـر خلـق نهانـی
بـا سـرّ نهـان در همـه جـا عیـن عیانـی
مـرآت جهـان مظهـر انـوار رخ تسـت
چونـت نگرم چـون نه بـرون و نـه در آنی
در حیطـهٔ امـکان نَبُـوَد بی‌تـو مکانـی
سرگشـته از آنـم کـه تـو بی‌جـا و مکانی
بـا قیـد ز اطـلاق و ز تقییـد برونـی
بی‌قیـد در اطـلاق هـم اینـی و هـم آنـی
"خـالص" چـو سـر دایـرهٔ اول و آخـر
یک شـد، تو دگر در چه شتاب و چه درانی

**(٢٦)**

ئەی گیانی هەموو جیهان ئەوەندە لە نیشانە کردن [وناسین]، دووری
مرۆڤ هەر گومانێکت پێ بەرێت و بڵێ ئەوەی، ئەو نیت!
بە نیشانەکانی ئافاقەوە و لە ئاوێنەی ئەنفوسدا
هەموو دەمێک لە گەڕان و جووڵانەوەدای
لە عەینی دیار بووندا، لەبەرچاوی خەڵک ونی
بە سیرڕی شاراوەوە، لە هەموو شوێنێک عەینی دیاربوونی
ئاوێنەی جیهان نوێنگەی تیشکی ڕوخساری تۆیە
چۆنت سەیر بکەم تۆ نە لە دەرەوە و نە لە نێو[ئاوێنە] دای؟
لە عالەمی ئیمکاندا هیچ مەکانێک بێ تۆ نییە
سەرم لەوە سوڕماوە کە بێ جێ و مەکانیشی!
بە قەیدەوە لە (اطلاق) و (تقیید) بەدەری
بێ قەیدیش لە ئیتلاقدا هەم ئەم و هەم ئەوی
«خالص»! کاتێک سەری بازنەی سەرەتا و کۆتایی
بۆتەوە یەک، ئیتر تۆ چ پەلەیەکتە و چ دەدرێنی؟

**شرح فارسی و کردی غزل ٢٦**

شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ٢٦

جان جهان:مقصودخداونداست.

گیانی جیهان: مەبەست خوداوەندە.

آیت آفاق: نشانۀ افق‌ها، آفاق جمع افق است. یکی از مقدمات سیر و سلوک عرفانی سیر آفاق و انفس است و این دستوری است مأخوذ از قرآن مجید که فرمود؛ " سَنُرِیهِمْ آیاتِنا فـي الافاقِ وفـي اَنْفُسِـهِمِ حتّي يـَتَـبَيّنَ لَهُم اَنـهُ الْحَق" (٤٢/٥٣) و این روش را کُل سران طریقت مورد عمل قرار می‌دادند زیرا دانش و معرفت حقایق از این راه آید.

ئایەتی ئافاق: نیشانەی ئاسۆکان. ئافاق جەمعی وشەی ئوفوق، واتە ئاسۆیە، یەکێ لە سەیر و سولووکە سەرەتاییەکانی، عیرفانی، سەیری ئافاق و ئەنفوسە و ئەمە لە قورئانی پیروز وەرگیراوە کە دەفەرمووێ:" سنریهمآیاتنا فـی الافاق و فـی انفسهم حتی یتیبن لهم أنه الحق" (٤٢/٥٣) و هەموو سەرانی تەریقەت ئەم شێوەیەیان بەکار هێناوە، لەبەر ئەوەی زانست و ماریفەتی حەقایق لەم رێگایەوە دێن.

آیینۀ اَنْفُس: اَنْفُس به شرح آیت آفاق برمی‌گردد. اَنْفُس؛ جمع نَفْس به روایتی دیگر آفاق و اَنْفُس، بیرون و درون.

ئاوێنەی ئەنفوس: شرۆڤەی ئەنفوس دەگەڕێتەوە بۆ شرۆڤەی پێشوو، کە لەسەر ئافاق کراوە، ئەنفوس، جەمعی نەفسە، بە ریوایەتێکی دی ئافاق و ئەنفوس، دەرووون و دەرەوەی مرۆڤ مەبەستە.

**مــــرآت جهــان مظهر انوار رخ تُست**

**چونت نگرم چون نه برون و نه درآنی**

آینۀ جهان محل آشکار شدن انوار زیبایی رخسار تو می‌باشد. چگونه به تو بنگرم که تو نه در دایرۀ جهان و نه بیرون از دایرۀ جهان هستی.

اشاره به لامکان بودن خداوند دارد.

ئـاوێنەی جیهـان شوێنی دەرکــەوتنی ڕوخساری تۆیە

چۆنت سەیر بکەم تۆ نە لە دەرەوە و نە لە نــاوی [ئاوێنە]دای!

ئاوێنەی جیهان شوێنی ئاشکرا بوونی ئەنواری جوانیی ڕوخساری تۆیە...

شاعیر دەڵێ کە تۆ (خوداوەند) نە لە بازنەی جیهاندا و نە لە دەرەوەی بازنەی جیهان جێت نابیتەوە، لەبەر ئەوەی وا خوداوەند بە هەست هەیە، بەڵام بە دیتن لە جوزئدا نییە، ئەوەش ئاماژە بە لامەکان بوونی خوداوەندە.

حیطۀ امکان: مقصود جهان خاکی است.

حیتەی ئیمکان: مەبەست ئەم جیهانەیە.

**بـا قیـد ز اطـلاق و ز تقیید برونی**

**بی‌قید در اطلاق هم اینی و هم آنی**

جمع ضدین مورد نظر است که در صفات خداوند اضداد چون لطف و قهر، رحم و خشم، جذب و دفع و... هست و قید = محدود بودن، اطلاق= رها، آزاد

نه در محدودیت و دایرۀ اندیشۀ جزئی می‌گنجی نه در بی‌منتهایی زیرا بالاتری از هر چیزی و این مصرع معنی «الله اکبر» است. اما بدون محدود بودن در رهایی و بی‌انتهایی هم متجلی در دل مقید و محدودی و هم لایتناهی هستی.

بـە قـەیدەوە لە ئیتــلاق و تـەقیید بـــەدەری

بێ قەیدیش لە ئیتلاقدا هەم ئەم و هەم ئەوی

لێرەدا جەمعی دژەکان مەبەستە لەبەر ئەوەی لە سیفاتی خوداوەندا وەک؛ لوتف و قار، ڕەحم و قین، جەزب و دەفع هەیە و قەید واتە دەورەگیراو و ئیتلاق واتە بەرەڵا و ئازاد. شاعیر دەڵی، خوداوەند نە لە دەورەگیراوی و بەرتەسکیی جیهان و نە لە بازنەی بیروڕای جوزئیدا و نە لە بەربـڵاوی و بێسنووریدا ناگونجێ، لەبەرئەوەی خوداوەند لە هەموو شتێ بانترە و ئەم دێڕە شیعرە شرۆڤەی "الله اکبر"ـە. هەروەها بەبێ دەورگیراوی و لە بێسنووری و بەربلاوییشدا لە دڵی دەورەگیراودا جێگات دەبێتەوە و لەلایەکی تریشەوە بەربـڵاو و بێسنووری.

**(خـــالص) چـــو سر دایـــرهٔ اول و آخـــر**
**یک شد تو دگر در چه شتاب و چه در آنی**

برای شرح این بیت رجوع به تفسیر (دل) در غزل شمارهٔ ۲۵ (غزل پیشین) ضروری است. حضرت شیخ عبدالرحمن در اینجا مرتبهٔ کمال خود را متذکر می‌شود که در دایرهٔ هستی از سیر من الحق الی الخلق فارغ شده و سیر من الخلق الی الحق را طی کرده و با یگانه، یکی شده است و فانی گشته و وجودی ندارد جز او، نهیبی می‌زند بر خویش که تو دیگر نیستی و این واژه (در آنی) ایهام دارد. معنی اول؛ به این که تو در او موجودی و او در تو موجود است. معنی دوم (چه درانی) = چه چیز را پاره می‌کنی و آشکار می‌سازی؟!

به قول مولانا؛

**هر که را اسرار غیب آموختند　　مهر کردند و دهانش دوختند**

"**خالص**" کاتێ که سەری بازنەی سەرەتاو کۆتایی

گە یشتۆتەوە یەک، ئیتر تۆ چ پەلە یەکتە و لەودا چییت؟

بۆ شرۆڤەی ئەم شیعرە دەبێ شرۆڤەی (دڵ) لە غەزەلی ژمارەی بیست و پێنج (غەزەلی پێشوو) لەبەرچاو بگرین. حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمان لێرەدا مەرتەبەی کەمالی عیرفانیی خۆی وەبیردەخاتەوە، کە لە بازنەی هەستیدا لە سەیر لە حەقەوە بەرەو خەڵک پەڕیوەتەوە و سەیری لە خەڵکەوە بەرەو حەقی تێپەڕاندوە و لەگەڵ خوداوەندی یەکدانەدا یەکیان گرتووە و عارف فانی بووە و وجوودی نەماوە، جگەلە خودا شتێ نییە، جا دێت بەسەر خویدا و دەڵێ (تۆ) ئیتر نیی. وشەی (درآنی) ئیهامی تێدایە، مانای یەکەم ئەمەیە کە تۆ لە وجوودی ئەودا مەوجوودی و ئەو لە دەروونی تۆدا مەوجوودە مانای دووەم (چە درانی) واتە چ دەدڕێنی و دەردەخەی و ئاشکرای ئەکەی.

بەوتەی مەولانای رۆمی:

ڕازی نهێنی، یان بە هەرکەس گوت　　مۆریان کرد و دەمیان دووری

(۲۷)

## بحر طویل

بـاز شـیدا شـدم از عشـق رخ لب سـمنی
فتنـه‌ای، عشـوه‌گری، نازک سـیمین بدنی
نوجـوان جادویـی و سـروقدی کبک خرام
آفتـی، عربده‌جویـی، دل عالـم فگنـی
جنگجـو قاتلکـی، تنـگ قبایـی دلکـش
دلبـری، مـوی میانی، کله بر سـر شـکنی
چشـم آهونگهـی، لـب گلکـی، چه‌زنخی،
خسـروی، زرکمـری، فتنه‌گـری، پرفتنـی
بتکـی، عقـل بری، سـیمبری شهرآشـوب
بهـر نقـد دل و جـان، جسـت ره راهزنـی
نازنیـن پادشـهی، سـیم عـذار افـروزی
کاکل از نـاز زنـی، رخ قمـری، گـو ذقنـی
گفتمش: «چیست بهای لبت، ای جان جهان؟»
گفت: «جـز دادن جان، هیچ نـدارد ثمنی»
مهـر او، مهـر سـلیمان بـود ای بـار خـدا!
مهــــر حفظش نهـی از آفت هـر اهرمنی
خـــالصا! وصل چنین شـــاهد زیبـــا، نبود
با چنین عشــق، ســزاوار کـس همچو منی!

**(٢٧)**

دیسانەکە شەیدای عیشقی ڕووی کەسێک بووم، کە لێوی وەک گوڵی سەمەنە
فیتنەیەک، بە لەنجەولارێک، ناسکێکی لەش زێوین
جادوویەکی تازە پێگەیشتوو، باڵا سەولێک و ڕەوتکەوێک
بەڵایەک، نەعرەتەکێشێک، کە دڵی عالەمی بەرداوەتەوە
قاتڵێکی بچووکی شەڕانخێو، کەوا تەنگێکی دڵکێش
دڵبەرێک، کەمەر وەک موویەک، کڵاولارێک
ئاسک نیگایەک، لێو وەک گوڵێک، چەنەگە چاڵێک
پادشایەک، کەمەر زێڕینێک، فیتنەگەرێک، فیتنەبازێک
بوتێکی بچووک، عەقڵبەرێک، زێوین ڕوخسارێک، شارشێوێنێک
بۆ بردنی نەغدینەی دڵ و گیان چەتەیەکی چوست و چالاک
پادشایەکی نازەنین، زێوی ڕوخسارهەڵکراوێک
لەبەر ناز، زوڵف هەڵپاچیوێک، ڕوخسارمانگێک، چەنەخڕێک
گوتم ئەی گیانی جیهان نرخی لێوت چەندەیە؟
گوتی جگە لە وەی گیانی بۆ بدرێت، نرخێکی دیکەی نییە
ئەی خوایە، مۆری ئەو هەر مۆرەکەی سولەیمانە
تۆ مۆری پاراستنی لەسەر بدەیت و لە بەڵای هەموو شەیتانێکی بپارێزیت
ئەی «خالص»! وەسڵی دڵدارێکی وا ڕازاوە و جوان
بەمجۆرە عیشقەوە شایانی کەسێکی وەک من نییە

## شرح فارسی و کردی غزل ۲۷

شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۲۷

در آغاز این غزل عنوان "بحر طویل" نوشته شده است اما تا آنجا که بحر طویل را می‌شناسیم، سیمای این شعر با بحر طویل از لحاظ ساختاری متفاوت است و از لحاظ وزن نیز شاید تکرار "فَعَلاتن" وجه مشترک شعر یاد شده با بحر طویل باشد که آن نیز چون شناسهٔ اصلی نیست، نمی‌توان به غزل یاد شده عنوان بحر طویل داد.

لەسەرەتای ئەم غەزەلە، "بەحری تەویل" نووسراوە، بەڵام ئەوەندەی ئێمە بەحری تەویل دەناسین، شێوازی ئەم شیعرە لەگەڵ "بەحری تەویل" جیاوازە و لە کێشی شیعرەکەدا دووبارەبوونەوەی کێشی"فەعەلاتون" نابێ بە هۆی یەکبوونی ئەم غەزەلە لەگەڵ "بەحری تەویل" دا، و ئەم هۆیە لە بەحری تەویلدا سەرەکی و بنەمایی نییە و ناتوانین بەم غەزەلە بڵێین "بەحری تەویل".

باز شیدا شدم از عشق رخ لب سمنی...

در این غزل شاهد برای شاعر عارف با توجه به ترکیب‌های؛ نوجوان جادویی، خسرو زرکمر، و... مرکر است. این بحثِ الّولی در عرفان است که در عشق عرفانی جنسیت مطرح نیست، زیرا عارف از مرز جنسیت می‌گریزد. چنانچه شیوه عارفان متقدّم بوده و لّنع خداوند را در جمال زیبا می‌یافتند و سیر می‌کردند، حُلمانی‌ها به جمال زیبا سجده می‌کردند.

دیسانە کە شەیدای عیشقی ڕووی کەسێک بووم، کە لێوی وەک گوڵی سەمەن خۆش‌عەتر و چکۆلەیە

لەم غەزەلەدا شاهیدی عیشق بۆ شاعیری عارف بەهۆی ئەو وشەو تەرکیبانەوە، کە لە غەزەلەکەدا هاتوون وەک؛ نوجوان جادوویی، خسرو زرکمر، و... نیرێنەیە ئەمە باسێکی بنەماییە لە عیرفاندا کە لە عیشق و عیشقی عیرفانیدا پیاو، یان ژنبوونی مەعشووق مەبەست نییە، چونکە عارف ئەو سنوورەی تێپەڕاندوە. هەروەها عارفانی پێشکەوتوو گەورەیی هونەری بێوینەی خوداوەندیان لە ڕوخساری جواندا دیوە.

حولمانیەکان کە پەیڕەوانی یەکێ لە تەریقەتەکانی تەسەووف بوون سوجدەیان بۆ ڕوخساری جوان دەبرد.

بیت پنجم، مصرع دوم... بهر نقد دل و جان جُست، روی راهزنی
به صورت بالا اشتباه و (چُست رَو) صحیح است به معنی شاطری و تندروی که در بعضی طرائق از عناوین سالک بوده است.
شیعری پێنجەم، بەشی دووەم؛ بەهری نەقدی دل و جان جوست، ڕەوی راهزنی به شێوەی نوسراو لە دیوانەکەدا هەڵەیە و چوستڕەو واتە شاترو تیژڕەو دروستە کە لە بڕێ تەرائقدا لە عینوانەکانی سالیک بووە.

بیت هفتم، مُهر او مُهر سلیمان بود ای بار خدا...
این مصرع مُهر تأیید بر این که مخاطب غزل مذکر است و اهل عرفان و انسان کامل می‌باشد که در جمال ظاهر و باطن تمام بوده و مرتبهٔ سلیمانی داشته است.
شیعری هەفتەم، موهر او موهر سلیمان بوود ئەی بار خدا...
ئەم بەشە لە دیوانە فارسیەکەدا مۆری تەئییدە و پشتڕاستکردنەوەیە، کە مەبەستی غەزەلە کە نێرینە و ئەو نێرینە ئەهلی عیرفانە و ئینسانی کامیلە کە لە جەمال و جوانی زاهیری و باتنیدا تەواو بووە و بە مەرتبەی سلێمانی گەیشتووە.
"خالصا"وصل چنین شاهد زیبا نبود...
که خالص خود را شایستهٔ وصل او نمی‌بیند! و این حکایت از شهودی عارفانه دارد.
ئەی خالص! وەسڵی شاهیدێکی وا ڕازاوە و جوان...
کە خالص خۆی بە شیاوی ئەوە نازانێ کە بە ویسالی ئەو بگا! ئەمەش بەڵگەیە بۆ شهوودی عیرفانی.

**(۲۸)**

**یـا غَـزَالَ الحـی یـا ظبـیِ اللّـوی**
**هَجَـرْ عَینیکُـم حَشـای قَدشَـوی**
**عـاذل العشـاق جهـلا بالهـوی**
**لـو علمـت مـا الهـوی رمـت الهوی**
**یـا جـوادا بالوصـال[1] جـد لقـد**
**ذاب جسـمی مـن لظـی نـار الجوی**
**جـای طاعـت بـس بـود عشـاق را**
**نالـه در شـب در سـحر آرد تـو را**
**جـاه و اسـتغنای جانـان را چـه باک**
**گـر فتـد در کـوی او صـد بینـوا**
**خالصـا کـی خاطـرت از درد عشـق**
**یقبـل عنـد الاطبـاء الدوی[2]**

۱ . درنسخهٔ کتاب جذبهٔ عشق «بالرصال» آمده است. در نسخهٔ د. مکرم طالبانی «بالوصال» است. (م، ع، س)
۲ . در نسخهٔ د. مکرم طالبانی «الدوا» آمده است و در شرح عربی «ان تقبل من الاطباء الدوا» آمده است. (ص۱٤۸) ← (م، ع، س)

**(٢٨)**

ئـــەی ئاسکی گــــەڕەک و ئــەی کــارمـامــزی بیابان
دوورکـەوتـنــەوە لە چـاوانت هەناوی منی سووتــاند
ئەی ئەوەی لۆمەی عاشقانت کرد، چونکە نەتزانی عیشق چییە!
ئەگەر دەتـــزانی عیشق چییە بە شوێنیدا دەگــەڕای
ئەی بەخشەندە! چێژ و بەختی ویسالم پێ ببەخشە، چونکە
جـەسـتــەی مــن لــە ئــاگــری عـیـشـقـدا تـــواوەتـــەوە
لــە جـیــاتی تــاعــەتی واجـــب بــۆ عــاشــق بـەســە، کـە؛
نـالّـیـنـی شـــەو و بـــەیـانی بــۆ تــۆ بـــەرز دەکـــاتـــەوە
شـکـۆ و بـێـنـیـازیـی دڵـــدار بـاکـی چـیـیـە ئـەگـەر؛
ســـەد بـێـنـــــــەوا لـــــە کـــــۆڵانــەکــەیــدا بـکـەون
«ئەی «خالص» کەی خاتری تۆ لە دەردی عیشق
لە لای تـــەبیبـــان دەرمـــان قـــەبــووڵ دەکا[١]»

١ . دەقی ئەم شیعرە و وەرگێڕاوەکەی بەکوردی لە نێو نوسراوەکانی کاک ئەنوەردا نەبوو، نووسینەوەو، وەرگێڕان و شەرحی بە ئەستۆی خۆمە ـ (م، ع، س)

**شرح فارسی و کردی غزل ۲۸**

شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۲۸

ظبی: آهو، از نمادهای رازآلود در داستان‌های عرفانی است.
زەبی: ئاسک، لە نیمادەکانی ڕەمزورازی حیکایەتە عیرفانییەکانە.

عین: چشم، رک شرح‌های پیشین
عەین: چاو، بڕوانە بۆ شرۆڤەکانی پێشوو

عاذِل: نکوهشگر، مقصود قشریون هستند.
عازل: لۆمەکەر، مەبەست ئەهلی ڕواڵەت و سەرپێستی مەزهەبە.

جواد: بخشنده، از صفات خداوند است.
جەواد: بەخشەندە، لە سیفاتی خوداوەندە.

طاعت: عبادات روزمره، عارفان انجام عبادت را زمانی صحیح می‌دانند که حضور قلب باشد و بی‌حضور قلب آن را با سایر حرکات فرقی نمی‌گذارند. در نالۀ شب و آه سحر علاوه بر حضور قلب پیوند دائم وجود دارد.
تاعەت: مەبەست عیبادەتی ڕۆژانەیە، عارفان بەجێهێنانی عیبادەت کاتێ بە دروست دەزانن کە حوزووری قەلب هەبێ و بێ حوزووری قەلب ئەو عیبادەتە لە جووڵانەوەکانی تری مرۆڤ بە جیاواز نازانن، بەڵام لە ناڵەی شەو و ئاهی بەیانی لە پاڵی حوزووری دڵدا پێوەندیی عابید و مەعبوود هەیە.
استغنا: بی‌نیازی و قطع علاقه از بهره‌های دنیا از جاه و مقام و منال:
حافظ گوید:

**بیـــار بـــــاده که در بـــــارگاه اســتغنـــا**
**چه پاسـبان و چه سلطان چه هوشیار و چه مست**

ئیستیغنا: بێ نیازی و دابڕانی گشتی لە بەهرەکانی دنیا لە شکۆ و مەقام و سەروەت و سامان،
حافز دەڵێ:

بـــادە بێرە کـــە لـــە بـــارەگـــای بێنیـــازیـدا
چ پاسەوان و چە سوڵتان، چ هۆشیار و چ مەست

درد عشق: در دیدگاه عرفایی که اهل سلوک عملی هستند، این ترکیب خود کتابی مفصل و مستقل می‌خواهد. درد عشق ورای جسم و درمان آن با طبیب باطنی است.
حافظ گوید: درد عشقی کشیده‌ام که مپرس...
مولانا خالد گوید؛ فرو ماندند اطباء جهان از چاره‌ام آخر...
خالص گوید: آنقدر درد خاطر من گران بود که علاج طبیبانرا نمی‌پذیرفت و...
دەردی عیشق: لە بیروڕای عارفانێکدا کە ئەهلی سولووکی عەمەڵی بوون، تەرکیبی دەردی عیشق کتێبێکی سەربەخۆی دەوێ، دەردی عیشق جەستەی تێپەڕاندوە و پزشکی باتینیی هەیە.
حافز دەڵێ؛ دەردی عشقێکم کێشاوە کە بە زمان ناوترێت، پرسیار مەکە...
مەولانا خالید دەڵێ؛ هەموو تەبیبانی جیهان لە دەرمانم داماون...
خالص دەڵێ:دەردی دڵم ئەوەندە گرانە کە دەرمانی تەبیبان وەرناگرن...

(۱)

## مخمس بر غزل (مغربی)

ز شـــوق بادهٔ عشــقت چنــان سرمســـت و حیرانم
شــعوری نیســـت تـــا دانم کــه کافر یا مســـلمانم
ولـــی از جـــــلوهٔ حســن تـــو جــانا اینقــدر دانم:
«گــه از روی تــو مجموعــم، گه از زلفت پریشـــانم
از ایــن در ظلمــــت کفــرم وز آن در نـــور ایمانم»
ز عشـــق اوســـت گر در میکــده دیوانــه، در بندم
ز مهــر او بــود در کعبــــــه گر با طوف خرســـندم
بــه ســوی روی او بــا جان چنــان مــن آرزومندم،
«ز شـــوق مــوی او باشــد اگــر زنــار بربنــدم
بــه یــاد روی او باشــد اگــر قبلــه بگردانــم»
به هر جــــا بنگرم، روی تو باشــد عین مقصودم
نیــاید جــز خیـــالت در دو چشــم گــریه‌آلــودم
به هر خاکـــی که از بهر عبادت من جبین ســودم،
«تویی معبود و مقصودم، تویی موجود مســـجودم
اگـــــر در مســـجدالاقصی، وگــــر در دیر رهبانم»
ز جـــــوش بـــادهٔ عشقت، دمادم در تف و جوشم
چوکف در جنبشم ز ان جوش و آن را همچو روپوشم
چـــو مستانم کسی دیگر گــــرفته بـــر سر دوشم
«ادب از من چه می‌جویی؟ تو می‌دانی که مدهوشم
طریق از من چه می‌پرسی؟ تو میدانی که حیرانم»
مـــن از جــام محبت از ازل سرمســـت و سرشـــارم
نباشــد بـــا خردمندان و عهد سستشـــان کـــارم
مجو رســم خــرد از من، کــه من رســوای بـــازارم
«مـــن آن طاقت کجــا آرم که پیمـــان را نگه‌دارم؟
بیــــا ای ســاقیا! بشــکن بــه یک پیمانــه پیمانم»

تجلی کرد حســـن یـــــار در تفصیـل و اجمــالی
ز حســـنش یافتم در دل بســی انـــوار اجـــلالی
کنون جــز یاد جانان نیســت در ملــک دلم، والی
«نیــم یک لحظه از ســودای زلف و خــال او خالی
گهــــی سرگشــتهٔ اینــــم، گهی آشــفتهٔ آنــــم»
بــرو زاهدا! به کیــش خــود مکن دیگــر مرا تلقین
که من در مذهب عشقم، ندانم چیست کفر و دین
جــز از زلــف و رخ جانان مــده پندم بــه آن و این
«حدیث کفر و دین پیشــم مگو، زیرا من مسکین
بــه جز رویــش نمی‌بینم، به جز مویــش نمی‌دانم»
وجود ســایه و محوش به بی‌خورشــید، کی شاید؟
ظهـــور ضوء ثـــانی بی‌نخســتین ضوء، ننمـــاید
فنـــاء ســایه «خـــالص» را طلــوع مهــر می‌باید
«تـــو مهــر مغربی، ســایه چنان کز تــو پدید آید
کــه تاهم گم شــود درتــو، بتــاب ای مــاه تابانم»

## (۱)
## تەخمیسی غەزەلی (مەغریبی)[1]

لە ئاشۆبی شـــەرابی عیشقت وەهـــا سەرخۆش و سەرلێشێواوم
ئـــەوەنـــدەم تێگەیشتن نییە بـــزانم کـــافـــرم، یا مسوڵمـــان،
بـــەڵام لە دەرکەوتنی جوانیی تۆ گیانەکەم ئەوەندە دەزانم
«کـە بە هۆی ڕوخساری تۆوە، گردوکۆم و بە هۆی زوڵفیشتەوە پەرێشانم
لە میانەوە کەوتوومەتە تاریکایی کوفر و لەویانەوە لەبەر شەوقی نووری ئیمانم»
ئەوە بە هۆی عیشقی ئەوەوەیە، کە لە مەیخانەدا شێت بووم و پابەست کراوم
لە خۆشەویستیی ئەویشەوەیە ئـەگەر لە ماڵی کەعبە بە تەواف کردن خۆشحاڵـم
وەهـــا لە گیـــانەوە ئـــارەزووی زوڵـــف و ڕووی ئـــەوم هەیە، کە
«بـــە شـــەوقـــی مـــووی ئـــەوەوەیـــە ئـــەگـــەر زونـــار ببەستم و
بـــە یـــادی ڕووی ئـــەوەوەیـــە ئـــەگـــەر قیبلە بـــگۆڕم»
ســـەیـــری هـــەرلایـــەک دەکـــــەم، ڕووی تـــۆم مەبەستە
جـــگـــە لـــە تـــۆ، هـــیـــچ نـــایـــەتـــە چـــاوی پـــڕ گـــریـــانمـــەوە
ســــەری عـــیـــبـــادەتم لـــە هـــــەر خـــاکـــێـــک هـــەڵـــسوو،
«تۆ مەعبوود و مەقسوودمی و تۆ ئەو وجوودە کە سوجدەی بۆ دەبەم
جـــا لـــە '**مسجدالاقصی**' بم یا لـــە دەیـــری ڕەبەنـــان»
بە جۆشی بادەی عیشقی تۆوە وەها هەردەم لە کوڵ و جۆشدام،
بەهۆی ئەو جۆشەوە وەک کەف لە بزووتندام و وەک ڕووپۆشی ئەوم لێهاتوە
وەک سەرخـــۆشانم و خـــەڵکانی تر لە کۆڵیان کـــردووم
«داوای ئـــەدەبی چیـــم لێدەکـــەی کـــە دەزانی بێهۆشـــم؟
ڕێـــگای چیـــم لێدەپرســـی کـــە دەزانی سەرلێشـــێواوم؟»

---

۱ . مەلا محەمەد شیرین مەغریبیی تەورێزی (شمس مغربی).

من هــەر لە ئەزەلەوە بە جامی خۆشەویســتی ســەرخۆش و سەرڕێژم
کــــارم بــە عاقــڵان و پــەیمانی شــل و شــەوێقی ئــەوان نییە
دابونەریــتی عەقــڵ لــە مــن مەپرســە، مــن لــە بــازاڕ نــاوم زڕاوە

«ئــەو تــاقەتــە لــە کــوێ بێنــم کــە پەیمـــان ڕابگــرم؟
وەرە ســاقی! بــە پیاڵەیــەک پەیمــانەکــەم بشــکێنە!»

جـــوانیــی یـــار لــە کـــورتی و درێژیــدا دەرکـــــەوت
لــە جـــوانیی ئـــەو لەدڵدا گـــەلێــک نـــووری ئیجــلالم بینــی
ئێســتاش لــە ملکی دڵمــدا جگە لە یــادی دڵدار کــەس حاکم نییە

«دەمیکیــش لــە ســەودای زوڵــف و خاڵــی ئــەو خاڵــی نیــم
هەندێک جار سەرلێشــێواوی ئەمیانم و هەندێک جار ئاڵۆزی ئەویانم»

بــــڕۆ ئەی زاهیــــد، ئــاییــنی خـــۆت بــە گوێمــدا مەخـــوێنە!
مـــن لە ئایینی عیشــق دام و نـــازانم کفـــــر و دیــن چیـــن
جگــە لە زوڵف و ڕوخســاری دڵدار نەســیحەتی ئەمــە و ئەوەم مەکە

«قســەی کفـــر و دینــم لــەوە زیاتر لە لا مەکە، لەبــەر ئەوەی من
جگە لە ڕوخســاری ئەو هیچ نابینم و لە زوڵفــی بەولاوە هیچ نازانم»

بــوونی ســێبەر و لاچــوونی ئــەو، بە بێ هەتــاو چــۆن دەگونجێت؟
نـــووری دووەم بــە بــێ نـــووری یــەکــەم دەرنــاکەوێــت
بــۆ فەنای ســێبەر بۆ «خالص» پێویســت بە هەڵاتــنی هەتاو دەکات

«تــۆ هــەتــاوی مــەغریبی[1] بەجۆرێک کە سێبەر لە تــۆوە دروست دەبێــت
بــۆ ئەوەی لە تۆشــدا ون بێت، بدرەوشــێوە ئــەی مانگی تیشــک هاوێژم!»

---

١ . تۆ بۆ «مەغریبی» شاعیر، وەک هەتاوی

## شرح مختصر زندگانی شاعر غزل

کورتەی ژیانی شاعیری غەزەلەکە

**مغربی:**

ابوعبدالله شمس‌الدین محمد بن عزالدین بن عادل یوسف البرازینی تبریزی مشهور به مغربی ملقب به محمد شیرین یا ملامحمد شیرین، از عارفان و شعرای قرن هشتم هجری. مذهبش وحدت وجود و مشربش لذت شهود به علوم ظاهر و باطن عالم وصیت فضائلش مغرب و مشرق را فراگرفته. مغربی مرید شیخ بهاءالدین همدانی و سهروردی طریقه است. رشته های طریقتی متعدد داشته، از طریق سعدالدین حموی به شیخ نجم‌الدین کبری می‌رسد. طریقهٔ دیگر از طریق صدرالدین قونیوی به شیخ محیی‌الدین عربی می‌رسد و همچنین از طریق اوحدالدین کرمانی به ابوالنجیب سهروردی می‌رسد. خرقهٔ اصلی خرقهٔ ارادت و خرقه‌های بعدی خرقهٔ تبرک است. با طرائق خلوتی و شطاری و نقشبندیه ارتباط داشته است.

از آثار او، مرآت العارفین به عربی در تفسیر سورهٔ فاتحه، دُرر الفرید به فارسی مشتمل بر سه اصل توحید و افعال و صفات خدا، رسالهٔ جام جهان‌نما در علم توحید و مراتب وجود به فارسی، دیوان اشعارش به زبان فارسی به اهتمام د. ابوطالب میرعابدینی در تهران چاپ و منتشر شده است و غزل مورد تخمیس خالص در صفحات ٦٦-١٦٥ دیوان شمس مغربی آمده است.

غزل در دیوان شمس مغربی این گونه آمده است:

**گـه از روی تو مجموعم گـه از زلفـت پریشـــانم**
**کــزین در ظلمـــت کفـــرم وز آن در نور ایمانم**
**نیم یک لحظـه از سودای زلـــف و خـال تو خالی**
**گهـــی سرگشتهٔ ایـــنم گهـــی آشفتهٔ آنـــــم**
**حــــدیث کفــر و دین پیشم مگو زیرا من مِسکین**
**بجــــز رویش نمی‌بینم بجـــــز مویش نمی‌دانـــم**
**ز شوق مـــوی او بــــاشد اگـــر زنـــار بــــربندم**
**بـــه یــــاد روی او بـــاشـد اگـــر قبــله بگردانم**

**تویی مطلوب و مقصودم تویی معبود و مسـجودم**
**اگـــر در مسـجدالاقصی وگـــر در دیـــر رهبانم**
**ادب از من چه می‌جویی چو می‌بینی که مدهوشم**
**طریق از من چه می‌پرسـی چو میدانی که حیرانم**
**الا ای سـاقی بـاقی بیـاور بـادەای درده**
**کـه مـن از خویش بیزارم دمـی از خویش برهانم**
**مـن آن طـاقت کجـا دارم کـه پیمان را نگه دارم**
**بیـا ای سـاقی و بشـکن به یـک پیمانه پیمانم**
**تـو مهری مغربی، سـایه چنـان از تو پدید آید**
**که تـا هم گم شـود در تـو بتـاب ای مهر تابانم**

(دیوان شمس مغربی، ص ٦٦-١٦٥)

- چون نسخۀ غزل در تخمیس آمده است، در اینجا برای تفاوت با نسخۀ دیوان آوردیم و از برگردان به کُردی خودداری می‌شود.
- لەبەر ئەوەی غەزەلە کە لە پێنج خشتەکیەکەدا هاتووە، لێرەدا بۆ جیاوازیەکانی لەگەڵ نوسخەی دیوانەکە هێناومانە و وەرمان نەگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی.

مەغریبی:

ئەبو عەبدوڵلا شەمسەدین محەمەد کوڕی عیزەدین کوڕی عادل یووسفی بەرازینی تەوریزی، بە ناوبانگ بە مەغریبی بە نازناوی محەممەدی شیرین، یان مەلا محەمەد شیرین، لە عارفان و شاعیرانی سەدەی هەشتەمی کۆچی، مەزهەبی وەحدەتی وجوود و مەشرەبی لە زەتی شوهوود بووە، لە عولوومی زاهێر و باتن، عالم و ئاگادار بووە، هەواڵی عیلم و فەزلی رۆژئاوا تا رۆژهەڵاتی گرتۆتەوە، مەغریبی موریدی شێخ بەهائەدینی هەمەدانی و سوهرەوەردی تەریقەتە، چەند زنجیرەی تەریقەتی بووە، لە زنجیرەی سەعدەدینی حەمەویەوە، بە شێخ محێدینی ئیبنی عەرەبی دەگا، هەروەها لە زنجیرەی محێدینی کرمانیەوە بە ئەبو نەجیبی سوهرەوەردی دەگا،

خەرقەی ئەسڵی، خەرقەی ئیرادەتە و ئەو خەرقەی دی خەرقەی تەبەڕوکبوون، لەگەڵ تەریقەتەکانی خەڵوەتی و شەتاری و نەقشبەندی پێوەندەیی هەبووە.

لە بەرهەمەکانی، "مرآت العارفین" بە عەرەبی لە تەفسیری سوورەتی فاتیحەدا، "دُرر الفرید" بە فارسی، کە باس لە تەوحید و ئەفعال و سیفاتی خودا دەکات، ریسالەی "جام جهان‌نما" لە عیلمی تەوحیددا و مەراتبی وجوود بە فارسی، دیوانی ئەشعاری بە زمانی فارسی کە، بە تێکوشانی د. ئەبوتالبی میرعابدینی لە تاران چاپ کراوە و بـڵاو بووەتەوە، ئەم غەزەلە کە حەزرەتی خالص کردوویە بە پێنجخشتەکی لە لاپەڕەی **١٦٥-٦**ی ئەو دیوانەدا هاتووە.

## شرح تخمیس غزل مغربی سرودهٔ حضرت خالص ۱
شەرحی پێنج خشتەکیی غەزەلی مەغریبی هەڵبەستی حەزرەتی خالص۱

کافر: کافر مقام تفرقه را گویند و کسی را که از جمع به فرق آمده باشد و صاحب مقام حال تفرقه را گویند.
کافر: بە مەقامی تەفرەقە دەڵێن، هەروەها بەو کەسەکە لە جەمعەوە بۆ فەرق هاتبێ و ساحیبی مەقامی تەفرەقە بێ.

مسلمان: مقام جمع است.
موسڵمان: مەقامی جەمعە.

بادهٔ عشق: باده نزد صوفیان نصرت الهی است و عشق منیف را نیز باده گویند.
بادەی عیشق: بادە لەلای سۆفیان سەرکەوتنی ئیلاهیە، بە عیشقی بەرزیش دەڵێن.

جلوهٔ حُسن: جلوهٔ انوار الهی را گویند که بر دل سالک عارف، ساطع گردد.
جیلوەی حوسن: جیلوەی ئەنواری ئیلاهیە کە لەسەر دڵی سالیک ئەدرەوشێتەوە.

ظلمت کفر: پوشش از حق و هواهای نفسانی است که موجب ستر عبد است از حق.
زوڵمەتی کوفر: داپۆشێنەری حەق. ئەوە هەوای نەفسە کە دەبێ بە هۆی جیایی عەبد لە حەق و پەردەیە لە بەینی عەبد و حەقدا.

نور ایمان: نور (رک شرح‌های پیشین)، نور ایمان بعد از نور اسلام است. با ایمان نور صدق است، چنان که با اسلام نور اخلاص است.
نووری ئیمان: نوور (بڕوانە شرۆڤەکانی پێشوو)، نووری ئیمان لە دوای نووری ئیسلامە، هاوڕێی ئیمان نووری سیدق و هاوڕێی ئیسلام نووری ئیخلاسە.

زنّار: زنار علامت عیسویان است و در اصطلاح زنّار، بستن عقد خدمت است. یعنی در زبان اهل حال اشارت به بستن بند خدمت و طاعت محبوب حقیقی در هر مراتب که باشد. (شرح گلشن راز، ص ٦٣٩)
زوننار: زوننار هێمای پێڕەوانی مەسیحە و لە زاراوەی تەسەوفدا زوننار، بەستنی گرێبەستی خزمەتە، یانی لە زمانی ئەهلی حاڵدا ئیشارە بە بەستنی پەتی خزمەت و تاعەتی مەحبووبی حەقیقیە لە هەر مەراتبێ کە هەبێ. (شرح گلشن راز، ص ٦٣٩)

مطلوب: مطلوب و مقصود حق است.
مەتلووب: مەتلووب و مەقسوود حەقە.

جام محبت: جام به معنی کاسه و ظرفی است که در آن آشامیدنی نوشند و در اصطلاح، دل عارف سالک است که مالامال از معرفت است.
و گفته‌اند مراد از جام «بدن» و از باده، تصفیۀ بدن است. جام محبت، دل عارف کامل که از مهر و دوستی خداوند لبریز است.
جامی مەحەببەت: جام بە مانای کاسە و کەرستەیێکە کە ئاوی پێ دەخورێتەوە و لە زاراوەی تەسەوفدا، دڵی عارفی سالیکە کە پڕە لە ماریفەت.
گوتراوە مراز لە جام «لەشە» و مراز لە بادە پاک و خاوێنیی لەشە لە پیسیی دەروونی.
جامی مەحەببەت، دڵی عارفی کامیلە کە پڕە لە دۆستیی و مەحەببەتی خوداوەند.
تجلی تفصیلی: تجلی، نور مکاشفه‌ای است که از باری تعالی بر دل عارف ظاهر می‌گردد...
هجویری گوید: تجلی تأثیر انوار حق است به حکم اقبال بر دل مقبلان که بدان شایستۀ آن شوند. (شرح مثنوی، ص ٥٥؛ مصباح الانس، ص ٥؛ کشف المحجوب، ص ٦٤٠)
تجلی اول را اجمالی و تجلی دوم را تفصیلی گویند.

تجلی اول؛ عبارت از تجلی ذاتی است و آن حضرت احدیت بود. (اصطلاحات شاه نعمت الله، ص ٤٦)
تجلی دوم؛ عبارت از ظهور اوست در اعیان ممکنات که شئون ذات اویند.
تجلی سوم؛ تجلی شهودی است که لدی‌الفتح حاصل می‌شود.
تەجەللیی تەفسیلی: تەجەللیی، نووری موکاشەفەیە کە لە لایەن باری تەعالاوە لەسەر دڵی عارف ئاشکرا دەبێ، هوجویری دڵێ؛ تەجەلی کاریگەریی ئەنواری حەقە بە حوکمی پێشوازی لەسەر دەڵێ پێشوازکەرانی قەبووڵکراو کە بەوەوە شانازییان پێ دەبەخشرێت. (شرح مثنوی، ص ٥٥؛ مصباح الانس، ص ٥؛ کشف المحجوب، ص ٦٤٠)
بە تەجەللیی یەکەم ئیجمالی و بە تەجەللیی دووەم تەفسیلی دەوترێت.
تەجەللیی یەکەم؛ بریتییە لە تەجەللیی زاتی و ئەوە زاتی حەزرەتی ئەحەدییەتە. (اصطلاحات شاه نعمت الله، ص ٤٦)
تەجەللیی دووەم؛ بریتییە لە زوهووری ئەو لە ئەعیانی ممکناتدا کە ئەعیان دەبن بە شوئوونی زاتی.
تەجەللیی سێیەم؛ تەجەللیی شوهوودیە کە لەسەرکەوتندا بەدەست دێ.
انوار اجلالی؛ انوار برتر، منبعث از صفات جلال، و در این مصرع بیانگر این که از حسن جمال حق در دل انوار اجلال ساطع گشت. درک شکوه و عظمت الهی مقصود است.
ئەنواری ئیجلالی؛ ئەنواری بەرز وەرگیراو لە سیفاتی جەلال، ئەم دێڕە شیعرە وا دەنوێنێ کە بە هۆی جوانیی جەمالی خوداوەند لە دڵی شاعیری عارفدا ئەنواری ئیجلالی درەوشاوەتەوە و گەورەیی و شکۆی ئیلاهی پێ گەیشتووە.

زلف: رک شرح‌های پیشین.
زولف: بڕوانە شرۆڤەکانی پێشوو.

خال: خال عبارت از نقطهٔ وحدت حقیقی است من حیث الخفاء و در اصطلاح صوفیان اشاره به نقطهٔ وحدت است که مبدأ و منتهای کثرت است.
خال: خاڵ بریتییە لە نوقتەی وەحدەتی حەقیقی لە ڕوانگەی نهێنییەوە و لە زاراوەی سۆفیاندا ئاماژە بە نوقتەی وەحدەتە کە سەرەتا و کۆتایی کیسرەتە.

ازل: ازل به معنی قدم است و ازلیت مخصوص خداوند است و ازل نامی از نام‌های خداوند است و ازلیت صفتی از صفات اوست و آنچه را اول نیست، ازل گویند چنان که، ابدی چیزی است که او را آخر نباشد.
در اصطلاحات صوفیه است که ازل امتداد فیض را گویند از مطلق معنی و ظهور ذات احدیت در مجال اسماء بر وجهی که مسبوق به ماده و مدت نباشد. (لمع، ص ٣٦٤)
ئەزەل: ئەزەل بە مانای قیدەم و ئەزەلییەت تایبەتی خوداوەندە و ئەزەل ناوێ لە ناوەکانی خوداوەندە، ئەزەلییەت سیفەتێ لە سیفاتی ئەوە و ئەوەی سەرەتای نییە پێی دەڵێن ئەزەلیی هەروەک ئەوەی کۆتایی نییە پێی دەوترێ ئەبەدیی.
لە زاراوەی تەسەوفدا بە درێژەی فەیزی ئەزەل دەڵێن لە موتلەقی مانا و زوهوری زاتی ئەحەدییەت لە مەجالی ئەسمادا بە شێوازێ کە بە مادە و زەمان نەگەڕێتەوە. (لمع، ص ٣٦٤)

خردمندان: مقصود فلاسفه است.
ئاوەزمەندان: مەبەست فەلاسیفەیە.

عهد سست: مقصود تغییر آراء و عدم ثبات و نظریهٔ فلاسفه است. مولوی بلخی فرماید؛

**پای استدلالیان چوبین بود پای چوبین سخت بی‌تمکین بود**

عەهد و پیمانی لەرزۆک: مەبەست گۆڕانی دەنگ و بێبنەمایی بیروڕای فەلاسیفەیە، مەولەوی بەڵخی دەفەرمووێ؛

پێی ئەهلـــی ئیستیدلال دارینە پێی دارین زۆر نامەحکەمە

تلقین: عبارت ذِکر را به کسی آموختن.
تەڵقین: فێرکردنی کەلامی زیکر بە کەسێکی دی.

... که من در مذهب عشقم ندانم چیست کفر و دین: مسئلهٔ کفر و دین در وادی عقل و شرع بررسی می‌شود و وادی عشق در منتها از بحث عقل جزئی و بندگی عامی مبرااست.

... من لە ئایینی عیشقدام و نازانم کوفر و دین چین: باسی کوفر و دین لە بازنەی عەقڵ و شەرعدا شرۆڤە دەکرێ و بازنەی عیشق لە کۆتاییدا لە باسی عەقڵی جوزئی و بەندەگی رواڵەتی دوور و جیاوازە.

سایه: مراد ظل و شَبَح حقیقت است که به منزلهٔ قشر و پوست است.
سایە: واتە سێبەر مراز سێبەر و شەوەی حەقیقەتە کە وەک پێست و رواڵەت وایە.

محو: رک، شرح‌های پیشین.
مەحو: بڕوانە شرۆڤەکانی پێشوو.

ضوء: کشفی که بعد از ظهور مستور نگردد، ضوء را نور هم گویند. که مراتب دارد ضوء نخستین، ضوء ثانی.
زەوء: ئەو کەشفەیە کە لە دوای ئاشکرا بوون ون نابێ و ناشارێتەوە، بە زەوء نووریش دەڵێن، کە مەراتبی هەیە وەک زەوئی یەکەم، زەوئی دووەم.

## (۲)
## تخمیس غزل (مغربی)

دلبـــرا! در همه‌جـــا در نظـرت می‌بینـم
گاه بیـرون ز جهـان، گاه درت می‌بینـم
گرچـه بیرنـگ ولـی در صـورت[۱] می‌بینـم
«صنمـــا! هـر نفســی در گـذرت می‌بینم
بـر دل و دیـدهٔ جـان جلوه‌گـرت می‌بینم»

در گـــذر، بـا همه کس می‌روی و می‌آیـی،
لیـک در دیـــدهٔ بیگـــانه عیـــان ننمایی
این عجب‌تـر، که نه در جایی و در هر جایی
«گرچه از منـزل خود هیچ بـرون می‌نایی،
لیک پیوســته چو مه در نظـــرت می‌بینم»

هـر چـــه را می‌نگرم، روی تـو را می‌گروم[۲]
هـر کجـــا روی نهـم، راه به بـــوی تو روم
گاه از بوی تو هشـیار و گهی مسـت شـوم
«گاه از بـاد صبـا بـوی خوشـت می‌شـنوم
گـــاه همـــراه نسـیم سـحرت می‌بینم»

چشم از عشق به عـــالم نظر انداخت بسی،
جـز وجـــود تـــو نمـایانش نشد دادرسی
ای که پیدا و نهان نیست به غیر از تو کسی،
«گـرچه صد بار کنی جلوه مرا، هر نفســی
لیـک هر لحظه به حسـن دگـرت می‌بینم»

هــــر دم از مطلـع ذرات جهـــان، تـابـانی
آنچـــه پیدا و هـــویداست، تو عیـــن آنی
چون که رخشان و عیان درهمه، در هر آنی
«دایـم از غـایـت پیدایی خـــود، پنهـانی
گرچـه تابنده‌تـر از ماه و خـورت می‌بینم»

---

۱ . با فتح/واو/ و /راء/
۲. در متن «می‌گردم» بود.

جان جانــی و ز اشــکال جهان جلــوه گری
در یکــی روی نمـــایــی، ز دگــر می‌نگــری
در میــان نـــاظــر و منظــور نباشــد دگری
«تویی نـــــور بصر و گرچه نهــان از نظری،
گاه شمســی و گهی چون قمــرت می‌بینم»
خالصــا! گرچــه به صــورت ز جهانــی کمتر،
لیــک معنیت بــود از همه عـــالــم بهتـــر
تـــا نهـــادنــد تــو را تــاج خلافت بر ســر
«مغـــربــی»! از فلــک و از ملکــی بالاتــر
گرچــه دائــم بــه لبــاس بشــرت می‌بینم»

## (٢)

## تەخمیسی غەزەلی (مەغریبی)

هۆ دڵبەرەکەم! من لە هـــەموو شوێنێکدا لەبەرچـــاوی خۆمت دەبینم
هەندێک جار لە دەرەوەی جیهان و هەندێک جاریش لەنـــاویدا دەتبینم
هەرچـــەندە بێڕەنگی، بـەڵام لە وێنەی جۆربەجۆردا دەتبینم
«ئـەی بـت! هەموو ساتێک لە ڕێـبـازدا دەتبینم[1]
دەردەکـەوی و لەسەر دڵ و چاوی گیانت دەبینم»

لـــە ڕێـــبـــازدا لـــەگـــەڵ هـــەمـــووکـــەس دێـــی و دەچـــی
بـــــەڵام لـــەبـــەرچـــاوی بێگـــانە دەرنـــــاکـــــەوی
سەیرتر ئەوەیە لە هیچ کوێیەک نی و لە هەموو شوێنێک هەی
«هـــەرچەندە هەرگیز لە مـــاڵی خۆت نایەیتەدەر،
بـەڵام هەمیشە وەکـو مانگ لەبەرچاومت دەبینم»

سەیری هـــەرشتێک دەکـەم، ئیمان بە ڕووی تۆ دێنم
ڕوو بکەمە هەرکوێیەک، بـــۆ لای بۆنی تۆ دەچـــــم
بە بۆنی تۆ، جارێک سەرخۆش دەبم و جارێکیش وشیار دەبمەوە
«جـــارێک لە بـــای سەبا بۆنی خـۆشی تۆم بۆ دێ
جارێکیش هاوڕێ لەگەڵ نەسیمی بەیانی دەتبینم»

چـــــاو بـە عـیـشـقـەوە زۆری سـەیـری عـالـەم کـرد
جگە لە وجـــوودی تۆ هیچ دادڕەسـێـک فریای نەکەوت
ئەی ئەوەی بە دیـــار و نادیار جـــگە لە تۆ کەسی تر نییە
«گەرچی لە هەر نەفەسێکدا سەدجارم لێ دەردەکەوی
هـەرجارەی بە جوانییەکی دیـکـەوە دەتبینم»

هـــەردەم لە ئاسۆی زەڕڕاتی جیهـــاندا دەدرەوشێیەوە
تـــۆ عـــەینی ئەوشتەی کە هـــەم دیـار و هـــەم نـــادیارە
لەبەر ئەوەی هەموو دەمێک لە هەموو [شتێک] دا درەوشاوە و دیاری
«هەمیشە لەبەر زۆر دیـاربـوونی خـۆت نادیاری
گـــەرچی بریقەدارتر لە مـانگ و ڕۆژت دەبینم»

---

١ . لە کۆلان و گوزەردا دەبینم

تۆ گیانی گیانی و له هەموو بیچمێکی جیهاندا دەردەکەوی
له یەکیاندا ڕوو دەنوێنی و له یەکی دیکەیانەوە دەبیە بینەر
له نێوان نـــــازر و مـــەنزووردا کـــەسی دیکه نییه
«تـــۆ نـــووری بینایی، هەرچەندە لەبەر چـــاوان شاراوەی
هەندێک جار وەک هەتاو و هەندێک جاریش وەک مانگت دەبینم»
ئەی «خالص»! گەرچی بە ڕواڵەت له هەموو جیهان کەمتری
بـــــەڵام واتـــــاکـەت لــە هــەمــوو عــالــەم بـاشـتـرە
لـەو سـاوە کـــە تـــاجی خـــەلافەتیان کـردە سـەرت،
ئەی «مەغریبی! تۆ له ئاسمان و فریشتەکان بەرزتری[1]
هـــەرچـەندە هەمیشه لەبەرگی مرۆڤدا دەتبینم»

---

١ . وەحدتی وجوود

## شرح تخمیس غزل مغربی سرودهٔ حضرت خالص ۲

## شەرحی پێنجخشتەکیی غەزەلی مەغریبی هەڵبەستی حەزرەتی **خالص** ۲

**شمس مغربی:**

برای احوال شمس مغربی رک شرح حال در آغاز تخمیس غزل مغربی، پیشتر؛ این غزل تخمیس شده در دیوان شمس مغربی صفحه (١٦٧/٨) آمده است.

بۆ ژیانی شەمسی مەغریبی بڕوانە شەرحی حاڵی لەسەرەتای یەکەمین پێنجخشتەکیی غەزەلی مەغریبیدا، ئەم غەزەلە کە لێرەدا شەرحی دەکەین لە لاپەرەی ١٦٧/٨ی دیوانی شەمسی مەغریبیدا بەم شێوەیە هاتووە:

غزل در دیوان شمس مغربی این گونه آمده است:

| | |
|---|---|
| **صنما هر نفسی بر گُذرت می‌بینم** | **بر دل و دیدهٔ جان جلوه‌گرت می‌بینم** |
| **گرچه صد بار کنی جلوه مرا هر نفسی** | **لیک هر لحظه به حُسن دگرت می‌بینم** |
| **گرچه از منزل خود هیچ برون می‌نایی** | **لیک پیوسته چو مه در سفرت می‌بینم** |
| **بر سپهر دل و بر چرخ روان تابنده** | **گاه چون شمس‌وگهی چون قمرت می‌بینم** |
| **دایم از غایت پیدایی خود پنهانی** | **گرچه تابنده‌تر از ماه و خورت می‌بینم** |
| **تویی نور بصرم گرچه نهان از نظری** | **زانک[1] در دیده چو نور بصرت می‌بینم** |
| **غایب ازدیده نه‌ای زانک به صدکسوت‌خوب** | **هر زمانی گذران بر نظرت می‌بینم** |
| **مغربی از فلک و از مَلَکی بالاتر** | **گرچه دایم به لباس بشرت می‌بینم** |

(دیوان شمس مغربی، ص ١٦٧/٨)

بیرنگ: بریده از تعلقات و وابستگی‌های مادی.

بێڕەنگ: دابڕاو لە پێوەند و تەعەللوقاتی ماددی.

صُوَر: جمع صورت است. صورت انواع مختلف دارد؛ در اینجا مقصود صورت الهی و مراد انسان کامل است.

سووەر: جەمعی وشەی سوورەتە، سوورەت واتە رواڵەت، ئەنواعی جیاوازی هەیە، لێرەدا مەبەست سوورەتی ئیلاهیە و مراز ئینسانی کامیلە.

---

١. زانکه

دل و دیدهٔ جان: دیده دروازهٔ دل است و صورت‌ها از دیده به دل نقش می‌بندد.
دڵ و چاوی گیان: چاو دەلاقەی دڵە و سوورەت لە دەلاقەی چاوەوە لەسەردڵ نەقش دەبەستێت.

جلوه‌گر: زیاد جلوه‌کننده.
جیلوەگەر: ئەو زاتەی وا زۆر جیلوە دەکا.

... می‌بینم: عالم شهود
... دەبینم: مەبەست عالەمی شوهوودە.

در بند سوم مصرع اول قافیهٔ "می‌گردم" اشتباه و "می‌گَرَوَم" صحیح است.
لە بەشی سێیەم، دێڕی یەکەم قافییەی "می‌گەردەم" هەڵەیە و"می‌گرەوەم" راستە.

... چشم از عشق به عالم نظر انداخت بسی:
نگاه به جهان از دیدگاه عشق که جدای از دیدگاه علم و فلسفه است.
... چاوم بە عیشقەوە زۆری سەیری عالەم کرد:
سەیری جیهان لە روانگەی عیشقەوە لە ڕوانگەی عیلم و زانست و فەلسەفە جیاوازە...

هر دم از مَطْلَع ذرّات جهان تابانی...
عارف درهر ثانیه و آنیه در ذرات جهان خداوند را حاضر می‌بیند.
هەردەم لە شوێنی سەرهەڵدانی زەڕاتی جیهاندا دەدرەو شێتەوە
عارف هەموو چرکە و ئانێک لە هەموو زەڕاتی جیهاندا خوداوەند بە حازر دەزانێ و دەیبینێ.

## (۱)
## تخمیس غزل حافظ

شوانی الحب فی نار الفراق
ولا ادری متی یوم التلاقی
جری فی العین دم الاشتیاق
«سلیمی منذ حلت بالعراق
ألاقی فی هواها ما ألاقی»

الا ای رهنورد مرحل دوست!
نگاهی کن به سوی بیدل دوست
نشان کن ماندگان را منزل دوست
«الا ای ساربان محمل دوست!
الی رکبانکم طال اشتیاقی»

نشد جانم ز ره بوییدن دوست[1]
دلم شیدا شد از کوشیدن دوست
برفتم از خود و جوییدن دوست
«درونم خون شد از نادیدن دوست
الا تعساً لأیام الفراق»

گم از عشق تو شد نام و نشانم
به لب آمد ز سودای تو جانم
ترحم کن به حال ناتوانم
«بیا ساقی! بده رطل گرانم
سقاک الله من کاس دهاق»

---
۱. بشد جانم ز ره پوییدن دوست

ز شوق عشق، عقل از دست دادم
جز از مستی نباشد در نهادم[1]
به بانک مطرب خوش لهجه، شادم
«جوانی باز می‌آرد به یادم
سماع چنگ و دست افشان ساقی»

ز بانگ شاهد[2] سیمین بناگوش
به وجد آی و به ذوق و شوق بخروش
ز ذوق عشق می‌کن رقص با جوش
«خرد در زنده‌رود انداز و می‌نوش
به گلبانگ جوانان عراقی»

نماند ای ساقی مه روی لب گل
به تاب فرقتم دیگر تحمل
مکن محرومم[3] از جام تسلسل
«می باقی بده تا مست و خوشدل
به یاران برفشانم عمر باقی»

نصیب الخالص فی العشق زجر
له فی کل جور الزجر اجر
دواء داء زجر الهجر صبر
«مضی یوم الوصال جاء هجر
بگو «حافظ» غزل‌های فراقی»

---

۱ . دهانم رک شرح تخمیس/ بروانه شەرحی پێنج خشته‌کییه‌که(م.ع.س)
۲ . ز بانگ و شاهد
۳ . محروم

## (١)
## تەخمیسی غەزەلێکی حافزی شیرازی[١]

عیشق لە ئاگری دووریدا برژاندمی[٢]
نازانم رۆژی دیدارمان کەنگێیە[٣]
فرمێسکی خوێنینی تامەزرۆیی لە چاوم ڕژا[٤]
«لەئەوکاتەوەکە"سولیما"لەعێراقدانیشتەجێبووە[٥]
من لەدووریی ئەوئەوەدەکێشم کەدەیکێشم»[٦]
هۆ ڕێبواری ڕێگای کۆچی دۆست!
ئاورێک لە دۆستی دڵدۆڕاو بدەوە
مەنزڵی دۆست بۆ بەجێماوان دەست نیشان بکە
«هۆ وشترەوانی کەژاوەی دۆست!
تامەزرۆییم بۆ سوارەکانی تۆ درێژەی کێشا»[٧]
گیانم لە پێوانی ڕێگای دۆستدا، دەرچوو
لە هەوڵی ڕێگای دۆستدا دڵم شەیدا بوو
لە گەڕان بەدوای دۆستدا لەسەرخۆم چووم
«دەروونم لە دووریی دۆست بوو بە خوێن
نەمان بۆ ڕۆژانی جودایی»[٨]

---

١ . خواجە شەمسەددین محەمەد شیرازی، ناسناوی «حافز»ە.
٢ . شوانی الحب فی نار الفراق ← دوستی در آتش دوری مرا سوزاند.
٣ . وما ادری متی یوم التلاقی ← نمی‌دانم روز وصال چە هنگام است.
٤ . جری فی العین دم الاشتیاق ← در چشمم خون اشتیاق جاری است.
٥ . سلیمی منذ حلت بالعراق ← از زمانی کە (سُلیما) در عراق منزل کردە است.
٦ . ألاقی فی هواها ما ألاقی ← من از دوری او می‌کشم آنچە را می‌کشم!
٧ . الی رکبانکم طال اشتیاقی ← تمایل من بە سواران کاروان شما طولانی است.
* ترجمۀ فارسی و کردی اشعار عربی این مخمس بە عهدۀ شارح است. / وەرگێڕانی شیعرە عەرەبیەکانی ئەم پێنجخشتەکیە لە منەوەیە. (م، ع، س)
٨ . الا تعساً لایام الفراق ← مرگ و نابودی بر روزگار جدایی باد

نـــاو ونیشـانم لـه عیشـقی تـۆدا ون بـوو

گیـانم لـه سـەودای تـۆدا هاتـه سـەر لێـوم

بەزەییـت بـه حـاڵـی بـێ هێزمـدا بێـت

«وەره سـاقی! پەیمـانـەی قورسـم پـێ بـده

خوداوەنـد لـه جامـی سـەرڕێژ تێـر ئـاوت بـکا[1]

لـه زەوقـی عیشـق عەقڵـم لـه دەسـت دا

جـگـه لەسەرخۆشـی هیچـم له هەنـاودا نییه

بـه ئـاوازی موتریبی خـۆش له هجه دڵشـادم

«سـەمای چەنـگ و دەستڕاوەشـاندنی سـاقی

سـەردەمی لاویەتیـم وەبیـر دێنێتـەوە»

بـه ئـاوازی دڵـداری هەنیـه وەک زیـو

دەست بکه به شادی و به زەوق و شەوقەوە هاوار بکه

لـه زەوقـی عیشـق وەره هـەڵپەڕیـن و جۆش

«عەقڵ بخه [ڕووباری] «زنده رود» ەوە[2] ومەی بنۆشه

بـه ئـاوازی بـەرزی لاوانـی عێـراقـی"[3]

ئەی ساقی مانگ ڕوخساری لێو وەک پەڕەی گوڵ!

چیتـر تـاقـەتی گـەرمـای دووریم نەمـاوه

له جـامی یەک بەدوای یەکت بێ بەشـم مەکه

«شـەرابی باقیم پێبده تا سەرخۆش و دڵخۆش

پاشماوەی تەمەنی خۆم بکەمه شاباشـی یارانم "

---

١ . سقاک الله من کأس دهاق ← خداوند تو را از کاسهٔ لبریز بنوشاند!

٢ . ڕووباری زایەندەروود که لێرەدا به زندەرود هاتووه، ڕووبارێکه به ناو شاری ئیسفەهانی ئێراندا تێپەڕ دەبێت.

٣ . عێراق لێرەدا «عێراقی عەجەم» یان «جیبال»ە که بەشێکی زۆری ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژئاوای ئێرانی دەگرتەوه.

بەشـــی "خالــص" لــە عیشــقدا، ئازار کێشــانە[١]
بــۆ هــەر ئازارێکــی ســتەم پاداشــێکی هەیە[٢]
دەرمـــانی دەردی ئـازاری دووری، ســەبرە[٣]
"ڕۆژی پێک گەیشتن بەسەرچوو و [ڕۆژانی] دووری هاتن[٤]
[ئێســتاش] حـــــافز! غــەزەلــی جــودایی بـڵێ!»

١ . نصیب الخالص فی العشق زجر سهم خالص ازعشق آزاراست.
٢ . له فی کل جور الزجر، اجر اورا در تحمل هر آزار ی پاداشیاست.
٣ . دواء داء زجر الهجر صبر داروی درد دوری شکیباییاست.
٤ «مضی یوم الوصال جاء هجر» ← (ترجمۀ این بند از مترجم است./ کوردیەکانی ئەم بەشە لە وەرگێڕ بووە.)

## شرح مختصر زندگانی شاعر غزل
کورتەی ژیانی شاعیری غەزەلەکە

**حافظ شیرازی:**

خواجه شمس‌الدین محمد شیرازی متخلص و مشهور به حافظ از شعرای قرن هشتم هجری تاریخ تولدش به درستی مشخص نیست، اما در ۷۹۲ هجری قمری در شیراز وفات یافته است. حافظ در نزد دانشمندان عصر خود از جمله قوام الدین عبدالله به تحصیل علوم پرداخت و در تفسیر و حکمت و ادبیات عرب آگاهی یافت. قرآن را با چهارده روایت از بر داشت و به همین مناسبت حافظ تخلص می‌کرد.

دورهٔ زندگانی او معاصر بود با امرای اینجو (جلال‌الدین مسعود شاه، شاه شیخ ابواسحاق) و سلاطین آل مظفر (امیر مبارزالدین محمد، شاه شجاع، شاه محمود، شاه یحیی، سلطان زین‌العابدین، شاه منصور)، که در فارس حکومت داشتند و سلطان اویس و سلطان احمد از ملوک ایلخانی (ایلکانی) که در آذربایجان و بغداد حکومت می‌کردند و در اواخر عمر نیز با امیر تیمور معاصر بود.

استادی خواجه در غزل عارفانه است و درین باب تاکنون کسی به پایهٔ او نرسیده است. مدفن خواجه در حافظیهٔ شیراز است. دیوان او شامل غزلیات، چند قصیده، چند مثنوی، قطعات و رباعیات است.

غزلی که از حافظ، شاعر عارف "خالص طالبانی" تخمیس کرده است با اندکی تفاوت در دیوان حافظ به شمارهٔ غزل ٤٦٠ آمده است ← رک، (دیوان حافظ، نسخهٔ علامه محمد قزوینی، به خط کیخسرو خروش، ص ۳۵۷).

حـافز:

خواجه شەمسەدین محەمەدی شیرازی ناسراو بە حافز لە شاعیرانی سەدەی هەشتەمی کۆچی، ساڵی لە دایکبوونی نەزانراوە بەڵام لە ۷۹۲ی کۆچی مانگیدا لە شاری شیراز کۆچی دوایی کردووە. حافز لە قوتابخانەی زانایانی گەورەی سەردەمی خۆی وەک قەوامەدین عەبدوڵـلا کتێبە زانستیەکانی خوێندوە و لە تەفسیر و حیکمەت و ئەدەبیاتی عەرەبدا شارەزایی بەدەست هێناوە و قورئانی بە چواردە

ریوایەت لە بەر بووە و هەر بەم بۆنەیەوە "حافز"ی وەک نازناوی خۆی هەڵبژاردوە و بەو ناوەش بەناوبانگ بووە، سەردەمی ژیانی هاوکات لەگەڵ دەسەڵاتی سەلاتینی ئالی موزەفەر (ئەمیر موباریزەدین محەمەد، شا شوجاع، شا مەحموود، شا یەحیا، سوڵتان زەینولعابدین، شا مەنسوور) کە لە فارس حوکمیان دەکرد و سوڵتان ئووەیس و سوڵتان ئەحمەد لە مولووکی ئیلخانی (ئیلکانی) کە لە ئازەربایجان و بەغداد حاکم بوون، هاوچەرخ بوو. کۆتایی ژیانی سەردەمی ئەمیر تەیمووری لەنگ بووە، پسپۆڕی و بلیمەتیی خواجە حافز لە هۆنینەوەی غەزەلی عارفانەدا بووە و لەم بوارەدا تائێستا کەس بە پلە و پایەی ئەو نەگەیشتووە، گڵکۆی لە حافزیەی شیرازە، دیوانەکەی کە غەزەلیات و چەند قەسیدە و چەند مەسنەوی و قیتەعات و چوارینە لە خۆ دەگرێ بەملیۆنەها دانە لە چاپ دراوە. ئەو غەزەلەی حافز، کە حەزرەتی خالصی کردوویە بە پێنجخشتەکی بە جیاوازییەکی کەمەوە لە دیوانی حافزدا بە ژمارە غەزەلی ٤٦٠ هاتووە. (دیوان حافظ، نسخهٔ علامه محمد قزوینی، به خط کیخسرو خروش، ص ٣٥٧).

## شرح تخمیس غزل حافظ سرودهٔ حضرت خالص ۱

شەرحی پێنجخشتەکیی غەزەلی حافز هەڵبەستی حەزرەتی خالص۱

غزل تخمیس خالص در دیوان حافظ چنین آمده است:

غەزەلی حافز کە خالص کردوویە بە پێنجخشتەکی لە دیوانی حافزدا بەم شێوەیە هاتووە:

**سُلَیمی منذ حلّت بالعراق    ألاقی من نواها ما ألاقی**
**الا ای ساربان منزل دوست    الی رکبانکم طال اشتیاقی**
**خرد در زندەرود انداز و می‌نوش    به گلبانگ جوانان عراقی**
**ربیع العمر فی مرعی حِماکم    حَماک الله یا عهد التّلاقی**
**بیا ساقی بده رطل گرانم    سقاک الله من کأس دهاق**
**جوانی باز می‌آرد به یادم    سماع چنگ‌و دست‌افشان ساقی**
**می باقی بده تا مست و خوشدل    به یاران برفشانم عمر باقی**
**درونم خون شد از نادیدن دوست    الا تعساً لأیام الفراق**
**دموعی بعدکم لاتَحْقِروها    فَکَم بَحْرٍ عَمیقٍ مِنْ سواقی**
**دمی با نیکخواهان متفق باش    غنیمت دانً امور اتّفاقی**
**بسازای مطرب خوش‌خوان خوش‌گو    به شعر فارسی صوت عراقی**
**عروسی بس خوشی ای دختر رَز    ولی گه گه سزاوار طلاقی**
**مسیحای مجرد را بَرازد    که با خورشید سازد هم وثاقی**
**وصال دوستان روزی ما نیست    بخوان حافظ غزل‌های فراقی**

جناب خالص ابیاتی از غزل را برگزیده و تخمیس کرده است و چون ابیات تخمیس شده مورد نظر است که ترجمهٔ آن به کُردی آمده است، از برگردان سایر ابیات چشم می‌پوشیم.

حەزرەتی خالص چەند دێڕ لە غەزەلەکەی هەڵبژاردوە و کردوونیە پێنجخشتەکی و لەبەر ئەوە کە ئەو شیعرانەی بوون بە پێنجخشتەکی، ئامانجی ئەم شرۆڤەیەن لە وەرگێڕانی تەواوی غەزەلەکەی حافز بە کوردی خۆ دەبوێرین.

**سُلَیمی مُنْذُ حَلَّتْ بالعِراقِ        ألاقی مِن نواها ما ألاقی**

از وقتی که سُلَیمی در عراق منزل گزیده است، من از دوری او می‌کشم آنچه را که می‌کشم. به تعبیر فارسی چه‌ها که نمی‌بینم! چه رنج‌ها که نمی‌کشم! سُلَیمی و سَلمی از معاشیق عرب مانند لیلی در ادب فارسی، در اینجا مطلق معشوقه مراد است.

سُلَیمی مُنْذُ حَلَّتْ بالعِراقِ

لەو کاتەوە کە (سُلَیمی) لە عێراقدا نیشتەجێ بووە من لە دووریی ئەو ئەوە دەکێشم کە دەیکێشم [وشە و زوبان لە بەیانی ناتەوانن] بە تەعبیری فارسی چهاکێ نەمیبینەم! چێ رەنجها کە نەمی‌کەشەم! سولەیما و سەلما لە دڵداران و دولبەرانی عەرەبن وەک لەیلی لە ئەدەبی فارسیدا، لێرەدا موتلەق مراز مەعشووقە.

**الا ای ساربان منزل دوست،    ... اِلی رُکْبانِکُم طالَ اشْتیاقی**

ای ساربانی که به منزلگاه دوست می‌روی، اشتیاق من به سواران شما طولانی شد [یعنی اشتیاق من به دیدن سواران کجاوه‌های کاروان شما ـ زیبارویان کاروان ـ افزون شد؛ زیرا که معشوق من در میان کاروان است.]

**هو وشترەوانی کەژاوەی دوست!    ... اِلی رُکْبانِکُم طالَ اشْتیاقی**

ئەی وشترەوانێ، کە دەچیە مەنزڵگای دۆست، یم بۆ سوارەکانی ئێوە درێژ بۆتەوە [یانی لە مێژە تامەزرۆی دیتنی سوارەکانی کەژاوەی کاروانی ئێوە ـ دولبەرانی جوانی کاروان ـ م، لەبەر ئەوەی دولبەری من لە نێو کاروانی ئێوەدایە.]

**درونم خون شد از نادیدن دوست        الا تعساً لأیام الفراق**

از ندیدن دوست دلم خون شد، نابود باد روزگار جدایی [هان، مرگ و نابودی، بر روزگار جدایی باد]

دەروونم لە دووریی دۆست بوو بە خوێن، رۆژگاری جیایی نابوود بێ و نەمێنێ [هەی، مەرگ و نەمان، بۆ رۆژی جیایی]

**بیا ساقی بده رطل گرانم        سقاک اللهُ من کاسٍ دهاقِ**

ای ساقی، بیا و جام سنگین شراب را به من بده، خداوند تو را از جامی لبریز سیراب کند [بنوشاند].

وەرە ساقی! پەیمانەی قورسم پێ بدە، خوداوەند تینووەتیی تۆ بە جامی سەرڕێژ

تێرئاو بکا [پێت بنۆشێ]

**ز ذوق عشق، عقل از دست دادم     جز از مستی نباشد در دهانم**

قافیهٔ مصرع دوم (نهادم) صحیح است. به معنی بنیاد و خلقت و سرشت و طینت و دهانم اشتباه است و قافیه بیت را بر هم می‌زند.

مخمس بر پایهٔ مقابلهٔ عقل و عشق است.

ذوق: ذوق قوتی است منتشر در عصب مفروش بر جرم زبان که به واسطهٔ آن طعمها ادراک می‌شود و نزد صوفیه اول درجهٔ شهود را ذوق گویند. شهودی که در اثناء بوارق متوالیه باشد. ذوق را در مرتبت کامل‌تر شرب گویند. (شرح تعرف، ص ۱٦۰)

لــه زەوقـــــی عـیـشـق عـەقـڵـم لــە دەســـــت دا
جـگـە سـەرخـۆشـی هیچم لــە دەمـــــدا نییە

قافییەی بەشی دووەمی شیعرەکە (نەهادەم، دروستە بە مانای هەناو، خوڵقاو، سروشت، تینەت و وشەی (دەهانەم) هەڵەیە لەبەر ئەوەی کە، (دەهانەم) لە مانا و مەفهووم و لە پێکهاتەی شیعریشەوە، دێڕە شیعرەکە تێک دەدا.

ئەم پێنجخشتەکیە لەسەر ئەساسی بەربەرەکانیی عەقڵ و عیشقە.

زەوق: زەوق وزەیێکی بــڵاوە لە دەماری زماندا، کە بە یارمەتیی ئەو وزەیە تام و چێژی خواردنەکان دەزانرێ و سۆفیەکان بە یەکەم دەرەجەی شوهوود دەڵێن زەوق، شوهوودێ کە لە ناوەڕاستی تیشک و ڕووناکییە بەردەوامەکانی باتنیدا بێ، زەوقە، بەڵام لە مەرتەبە و پایەی کامیل‌تردا بێ، شوربی پێ دەڵێن.(شرح تعرف، ص ۱٦۰)

**خرد در زنده‌رود انداز و می‌نوش     به گلبانگ جوانان عراقی**

اصفهان مرکز عراق عجم شمرده می‌شد و در علوم عقلی نیز در دوره‌هایی پیش و پس از حافظ هر چند گاه نشیب و فرازی داشته است. چنان نماید که اشارهٔ خواجه به آن قضیه و کُلاً معارضهٔ عشق و عقل است. زاینده‌رود یا زنده‌رود در اصفهان جاری است. عراق در این بیت مقصود عراق عجم است. گلبانگ، علاوه بر آواز خوش و آوای بلبل، نام لحن و آهنگی در موسیقی قدیم نیز بوده است.

عەقڵ بخە [ڕووباری] «زندەرود» ەوە و مەی بنۆشە

به ئاوازی بەرزی لاوانی عێراقی

ئیسفەهان ناوەندی عێراقی عەجەم بووە و لە علوومی عەقڵیدا لە دەورانی پێش و پاش حافز لەم بوارەدا هەوراز و نشێوی هەبووە. علووومی عەقڵی لە قوتابخانەکانی ئیسفەهاندا گا درەوشاوەتەوە و گا کزبووە، وادیارە ئاماژەی حافز بەو هەواڵەیە و بنەمای پێنجخشتەکی و غەزەڵەکەی بەربەرەکانیی عەقڵ و عیشقە، / زایەندە روود یان، زیندەروود بە شاری ئیسفەهانی ئێراندا تێپەڕ دەبێت، / مەبەست لە عێراق، عێراقی عەجەمە، / گوڵبانگ جگە لەوەی بە ئاوازی خۆش و دەنگی بولبول دەڵێن، ناوی لەحن و ئاهەنگێکی مۆسیقای قەدیمە.

جام تسلسل: جام پی در پی
جامی تەسەلسول: جامی پەیتاپەیتا؛ یەک لەسەریەک، بێ وچان.

(۲)

### تخمیس غزل حافظ:

دلا! بهـار رسید و بساط دی شد طی
جمال لاله ز ژاله شد از فرح پر خوی[1]
ز شوق پیر مغـان و بهـــار فرخ پی،
به صوت بلبل و قمری اگر ننوشی می،
دواء کی کنمـــت؟ آخـــرالدواء الکـی

جهان پیر، که حسنش به دلبران ماند،
کسی ز بنـــد فریبش رهـــایی نتواند
هر آن که دامن جودش گرفت، درماند
«زمـــانه هیچ نبخشد که بـــاز نستاند
مجو ز سفله مروت، که شیئه لاشیء»

زمـان فتنه چـــو در قطـع ریشهٔ عمر است،
طمـــع مدار به یسرش، که منشأ عسر است
منه ذخیره ز گنجش، که حاصلش خسر است
«خـــزانه‌داری میـراث خوارگان، کفـر است
به قول مطرب و ساقی، به فتوای دف و نی»

به شرع عشق که از وی گرفته‌ام فتوا
نشان کفـــر بـــود میـــل جیفهٔ دنیـــا
که کـــاتبان قـــدر بـا رقـم‌زنان قضا
«نـــوشته‌اند بـــر ایـــوان جنت المأوی[2]
که هرکه عشوهٔ دنیا خرید، وای به وی»

---

۱ . خی بر وزن می
۲ . جنت المأوی

**سخی چیست؟ کریم است کرم نما حافظ!**
**که نیست شیوهٔ نیکوتر از سخـــا حــافظ!**
**سخی شود به خدا «خالص» خدا، حـــافظ!**
**بخیل بوی خدا نشنود، بیا «حــافظ»!**
**پیاله گیر و کرم ورز و الضمان علی»**

## (٢)

## تەخمیسی غەزەلی «حافز»:

ئەی دڵ! بەهار گەیشت وسفرەی مانگی «دەی»[1] پێچرایەوە
لە شادیـــدا، ڕوخساری گوڵاڵە بە شەونم پڕ لە فرمێسک بوو
لە شـــەوقـــی پـــیری موغـــان و بەهاری شـــادیهێنەر،
«ئـەگـــەر بە دەنـگی بـولبول و قومـــری مـــەی نـــەنۆشـــی،
کـــەی دەتوانم تیمارت بکـــەم؟ 'کە دوا دەرمـــان داخ کردنە'»[2]
جیهانی پیر، کە جوانییەکـــەی وەک هی دڵبەران وایە،
کـــەس نـــاتوانێ لـــە بـــەندی فریوی ئـــەو ڕزگـــار بێت
هـــەرکەس داوێـــنی دڵئاوایی ئەو بگـــرێ، دادەمێنێت
«زەمـــانـــە هیـــچ نابەخشـــێت کـــــە وەری نـــەگرێتـــەوە
لە مرۆڤی ســـپڵە خوازیاری هیچ مەبە، شـــتی ئەو شت نییە!»[3]
ئێســـتا کـە زەمانی فیتنە بەشـــوێن پســـاندنی هـــەودای تەمەنەوەیە،
ئاســـوودەیی لێ چاوەڕوان مەکە لەبەر ئەوەی ســـەرچاوەی تەنگانەیە
لە خەزێنەی ئەو هیچ پاشەکەوت مەکە، لەبەر ئەوەی ئەنجامەکەی هەرزیانە
«ئـــەوە کفـــرە بـــبی بـــە خـــەزێنـــەداری میـــراتگـــران
ئـــەوە قســـەی موتریـــب و ســـاقی و فەتـــوای دەف و نایەیە»
بـــە شـــەرعی عیشـــق، کـــە فەتـــوام لـــەو وەرگرتـــوە،
مـــەیلـــی منـــدارەوەبـــووی دنیـــا نیشـــانەی کفـــــرە
نـــووســـەرانی قـــەدەر و کاتبـــانی قـــەزا و قـــەدەر
«لەســـەر هـــەیـــوانی 'جنـــت المـــــاوی' نووســـیویانە:
ئەی قوڕ بەســـەری ئەوکەســـەی خەمزە و نازی دنیای کڕی!»

---

١ . مانگی «دەی»ی ئێرانی بەرانبەرە لەگەڵ **١٠** ڕۆژی کۆتایی مانگی دیسەمبر و **٢٠** ڕۆژی مانگی جانیوەری زایینی.
٢ . اخرالدواء الکی ← رک شرح تخمیس / بڕوانە بۆ شەرحی پینجخشتەکیەکان (م، ع، س)
٣ . شیئە لاشیء

دڵئاوا کێیە؟ کەسێکی بەخشندەیە؛ تۆش ئەی حافز، کەرەم بنوێنە!
لەبەر ئەوەی هیچ شێوەکارێک لە دڵئاوایی باشتر نییە ئەی حافز!
سوێندم بە خودا، کەسی دڵئاوا دەبێتە «خالص»ی خودا ئەی حافز!
کەسی بەخێڵ، هەرگیز بۆنی خودا ناکات، وەرە ئەی حافز!
پیاڵەی [شەراب] وەربگرە و کەرەمداری بکە و بۆخۆم زامن![1]

---

١ . والضمان علی

## شرح تخميس غزل حافظ سرودهٔ حضرت خالص ۲

شەرحی پێنجخشتەکیی غەزەلی حافز هەڵبەستی حەزرەتی خالص۲

غزل مورد تخمیس جناب خالص در دیوان حافظ این گونه آمده:

**به صـوت بلبل و قمری اگر ننوشی می**
**عـــلاج کی کنمـــت آخِـــرُ الـــدّواء الکی**
**ذخیرهٔ بنه از رنـــگ و بوی فصل بهـار**
**کـــه می‌رسند ز پـی رهزنان بهمن و دی**
**چو گل نقاب بر افکند و مرغ زد هو هو**
**منه ز دست پـیـــاله چه می‌کنی هی هی**
**شکوه سلطنت و حُسن کی ثباتی داد**
**ز تخت جم سـخنی مانده اسـت و افسر کی**
**خزینــه‌داری میـراث‌خـوارگان کفرسـت**
**به قول مطرب و ساقی به فتوی دف و نی**
**زمـــانه هیچ نبخشد که بـــازنستاند**
**مجـــو ز سفـــله مـــروّت که شیئه لاشی**
**نوشته‌اند بر ایـــوان جنـــت المأوی**
**کـه هر که عشوهٔ دنیی خرید وای به وی**
**سخا نماند سخن طی‌کنم شراب‌کجاست**
**بـــده به شـادی روح و روان حـاتم طی**
**بخیل بوی خـــدا نشنود بیا «حافظ»**
**پـیاله گیـــر و کـــرم ورز و الضّمان علی**

(رک، دیوان حافظ، نسخهٔ علامه قزوینی و دکتر قاسم غنی، ص ۲۹۸/۹۹)

برای برآورد و مقابله و آگاهی از تفاوت‌ها درج شد از برگردان به کُردی خودداری گردید، زیرا ابیات لازم در متن مخمس به کُردی آمده است.

ئەو غەزەلە ی حافز کە حەزرەتی (خالص) کردوویە بە پێنجخشتەکی لە دیوانی

حافزدا بەو شێوەیە کە لەسەرەوە هێناومە هاتووە، بۆ بەرئاورد و بەرابەرکردنەوەو ئاگاداری خۆینەران لە جیاوازیەکانی ئەو دوو نوسخە نووسراوەتەوە و لە وەرگێڕانی بە کوردی چاوپۆشی دەکەین.

دلا بهار رسید و بساط دی شد طی...

بهار؛ مقام وجد و حال را گویند. / دی؛ زمستان قبض و انجماد روحانی مقصود است. / لاله؛ نماد عشق و شهود. / ژاله؛ خوی = نتیجۀ شادی و جذبه / شوق؛ رک شرح‌های پیشین / پیرمغان؛ انسان کامل، راهنما، استاد / کی؛ داغ کردن، سوزاندن جراحات با آهن تافته به قصد معالجه در کتاب (عرایس الجواهر) آمده است «و اگر عضوی را به داغ حاجت باشد آن را به میل زر داغ کنند بهتر است و نافع‌تر و جراحت زودتر اصلاح پذیرد.» (رک کاشانی.. عرایس الجواهر... ص ٢١٧)

جملۀ «آخِرُ الدّواءِ الکی» از امثال عرب است به معنای آخرین علاج داغ کردن است؛ مراد آن که وسایل صعب آنگه به کار برند که چارۀ سهل بی‌اثر ماند.

نتیجۀ مخمس: اگر در فصل بهار با آواز بلبل و قمری شراب ننوشی، سخت بیماری. به نحو دیگری معالجه نخواهی شد جز این که تو را با آهن گداخته داغ کنند.

ئەی دڵ! بەهار گەییشت و سفرەی مانگی «دەی» پێچرایەوە... بەهار؛ بە پلەی وەجد و حاڵ دەڵێن / دەی = سەرەتای زستان مەبەست بەسراوەیی و زیقەتی ڕۆحییە / گوڵاڵە؛ سەمبولی عیشق و شوهوودە / ژاڵە = خۆی = ئارەقی سەر بەرگی گوڵ کە بەرهەمی شادی و جەزبەیە / شەوق؛ بڕوانە شەرحەکانی پێشوو / پیری موغان؛ ئینسانی کامیل؛ ڕێنوما، ئوستاد / کەی؛ داغ کردن، سووتاندنی زام و جەراحەت بە ئاسنی داخ بە مەبەستی عیلاج و سەلامەتی، لە کتێبی (عەرایسولجەواهیر) دا هاتووە؛ «ئەگەر ئەندامێ پێویستی بە داخ بێ، بە میلی زێڕ داخی کەن چاکترە و سوودمەندیی زۆرە و زام زووتر چاک دەبێتەوە (بڕوانە بۆ... کاشانی... عەرایسولجەواهیر... ل ٢١٧)

پەندی، «آخِرُ الدّواءِ الکی» لە ئەمسالی سائیرەی عەرەب بە مانای؛ دوایین دەرمان و عیلاج داخ کردنە. مەبەست لەم وتەیە ئەوەیە کە کار و ڕێگەی دژوار لە

کوتاییدا بە کار دێنن.

خولاسەی شیعرەکە؛ ئەگەر لە وەرزی بەهاردا بە دەنگی بولبول و قومری شەراب نەنۆشی، جا تۆ نەخۆشی و بە شێوەیەکیتر عیلاج نابی، چارەت ئەوەیە بە ئاسنی سوورەوەبوو داخت بکەن.

جهان پیر که حسنش به دلبران ماند...

جود؛ بخشش، بخشندگی، یکی از نشانه‌های سالک در عرفان و جهان ظاهر که زیباست، ماندن در زیبایی و لذت او چون دلبستگی به دلبران است که دیر نمی‌پاید و فانی است. آنچه باقی است برای سالک اساس سلوک است، زیرا زمانه آنچه از جوانی و زیبایی و علم و... به انسان دهد، بازپس می‌گیرد و این از صفات رذیله است، که کریم و بخشنده دادۀ خود را پس نمی‌گیرد. سفله و فرومایه، مروت و جوانمردی را که صفات دیگر سالک عارف است نمی‌شناسد و ارزشی پیش او ندارد.

شیئه لاشیء؛ چیز او چیز نیست، ارزشی ندارد.

جیهانی پیر، کە جوانییەکەی وەک هی دڵبەران وایە...

جوود؛ بەخشەندەیی، یەکێ لە نیشانەکانی سالیکە لە عیرفاندا / جیهانی زاهیر، کە جوانە، مانەوە و جوانی و لەزەت و چێژی ئەو وەک دڵبەستنە بە دولبەران، کە کاتێکی وای نییە و زوو تێدەپەڕێ و لە ناو دەچێ، ئەوەی کە دەمێنێتەوە بۆ سالیک ئەساسی سولووکە لەبەر ئەوەی زەمانە ئەوەی کە لە گەنجی و جوانی و زانست و... دەیدا بە ئینسان ، هەمووی لێ وەردەگرێتەوە و ئەیباتەوە، ئەمە لە سیفاتی رەزیلە و سپڵەیە، بەخشەندە دیاریی خۆی ناباتەوە، سپڵە و بێبنەما، مورووەت و جوانمێری، کە سیفاتێکی دیکەی سالیکی عارفە ناناسێ و بایەخێکی بۆی نییە.

شیئه لاشی؛ شتی ئەو شت نییە، بایەخی نییە.

زمان فتنه چو در قطع رشتۀ عمر است...

زمان در اندیشۀ عارفان از تیغ تیزتر، از مو باریک‌تر و از نور و صوت پرشتاب‌تر

است و عُمر انسان در معرض ضربهٔ او قرار دارد. طمع در شادی آن نباید داشت که ریشه در رنج دارد. هم اشاره به آیات قرآنی؛ (فَاِنَّ مَعَ الْعُسْرِ یسْراً (٩٤/٦) (ولَقَدْ خَلَقْنَا الانْسانَ فی کَبَد (٩٠/٤) است. نتیجهٔ گردآوری ثروت ظاهری خسران می‌باشد و جمع‌آوری سرمایه و ثروت برای آیندگان کفر است. این داشته را باید در معنی و عیش باقی صرف کرد.

ئێستا که زەمانی فیتنه به شوێن پساندنی هەودای تەمەنەوەیە...

زەمان له بیروڕای عارفاندا له تیغ تیژتر، له موو باریکتر و له نوور و دەنگ پڕتاف تره و تەمەنی مرۆڤ له بەر کاریگەریی ئەودایه و نابێ به تەمای شادمانیی ئەو بی که بنەمای له چەرمەسەره و ڕەنجدانه و ئاماژەیه بۆ ئایەتێ له قورئانی پیرۆز که دەفەرمووێ؛ (فَاِنَّ مَعَ الْعُسْرِ یسْراً (٩٤/٦) / (و لَقَدْ خَلَقْنَا الانْسانَ فی کَبَد (٩٠/٤) و کورتەی باسەکه ئەمەیه: کۆکردنەوەی سەروەت و سامان دەبێ به هۆی زیان و پەشیمانی و هەروەها کۆکردنەوەی سەروەت بۆ پاشەرۆژ و بەرەکانی داهاتوو کوفره، پێویسته ئەم سامانه له پێناوی مانا و ژیانی نەمری‌دا سەرف بکرێ.

بشرع عشق که از وی گرفته‌ام فتوا...

شرع عشق از شرع عقل و شرع علم جداست.

شرع عشق؛ عقل معاد را دارد نه عقل معاش، نشان کفر و ظلمت در تمایل به جیفهٔ دنیا و عقل معاش می‌باشد.

قلمزنان قضا و قدر و رقم‌زنان سرنوشت انسان بر ایوان (جنت المأوی) از بهشت‌های هشتگانه که در سورهٔ النجم (٥٣/١٥) در قرآن عِنْدَها جَنَّتُ الْمأوی، در سدرهٔالمنتهی که بهشت در کنار آن است. نوشته‌اند هر کس به دل فریبی دنیا = پستی‌ها فریفته شود، زیرا دنیا مؤنث ادنی است. اَدنی؛ صفت تفضیلی از دنو؛ نزدیک‌تر و صفت تفضیلی از دنی، پست‌تر، زبون‌تر، افتاده‌تر می‌باشد. وای: فرشتهٔ مرگ و نابودی.

این بند مخمس، سرنوشت محتوم انسان دنیوی است که مسیر رسالت خود را بالعکس پیموده است.

به شەرعی عیشق کە فەتوام لەو وەرگرتوە...
شەرعی عیشق؛ عەقڵی مەعادی هەیە نە عەقڵی مەعاش؛ نیشانەی کوفر و تاریکی لە مەیل بۆ جیفەی دنیا و عەقڵی مەعاشدایە.

نووسەرانی قەزا و قەدەر و چارەنووسی ئینسان لەسەر هەیوانی بەر تارمەی جەنەتولمەئوا کە یەکێ لە هەشت بەهەشتەکەیە کە لە سوورەی (النجم) ئاماژەی پێکراوە کە دەفەرمووێ؛ «عِنْدَها جَنَتُ الْمأوی» لە سدرەتولمونتەهادا کە بەهەشت لە پاڵی ئەودایە، نووسیویانە: هەر کەس دڵ بە دڵڕفێنیی دنیا بدات، فریشتەی مەرگی دێتە سەر.

دنیا واتە پیسی و کەوتەیی و بێبایەخی، لەبەرئەوە کە دنیا موئەنەسی ئەدنایە، ئەدنا سیفەتی تەفزیلییە لە وشەی دەنو، واتە نزیکتر و سیفەتی تەفزیلی لە دەنیە بە مانای پەستتر، زەبوونتر، کەوتەتر / وای؛ وشەی پەهلەویە ناوی فریشتەی مەرگ و مردنە.

ئەم بەشە لە پێنجخشتەکیەکە چارەنووسی مسۆگەری مرۆڤی دنیاییە کە ڕێگەی خۆی بە پێچەوانە داوەتە بەر.

سخی چیست؟ کریم است. کرم نما حافظ...

این مهر تأیید و نتیجه از بند اول مخمس است که سخاوت؛ بندگی، جوانمردی، مروت و فتوت که از جمله اخلاق عارف است به سالکان توصیه می‌شود و ضمانت هم می‌گردد.

والضمانُ علی؛ ضمانت بر عهدهٔ من.

دڵنیا کێیە؟ کەسێکی بەخشندەیە؛ تۆش ئەی (حافز) کەرەم کە!...

ئەم بەشە مۆری تەئیید و پشتڕاستکردنەوەیە بۆ بەرهەمی بەشی یەکەمی پێنجخشتەکیەکە کە دڵنیایی، بەخشەندەیی، جوامێری و.. لە ئەخلاق و سیفاتی عارفەو بە سالیکەکان ئەسپێردرێت و زەمانەتی ئەکرێ.

والضَمانُ عَلَی؛ کەفالەتی لە ئەستوێ من

(۱)

## تخمیس غزل نورعلی

سـرخوش از عشق جلوهٔ دیدار
می‌گذشتم چو مست در بـازار
دیـدم از بـام خـانهٔ خمار
«سـر بـر آورد آن بـت عیـار
بسـته از زلـف برمیـان، زنار»
زد علم شـاه عشـق در امکان
شـد هویدا بـه صورت انسـان
وحـدت او کمـا هی الآن
«می‌زنـد دم به دم به بام جهان
طبـل الله واحـد القهـار»
هسـت خود نور کائنات، چو نی
بُودِ عـالم جـز او بود لاشـیئ
بشـنو از نـی صـدای نغمهٔ وی
«خود شود نای و می‌دمد در نی
لیس فی الـدار غیـره دیـار»
خازن گنـج و مخـزن جبروت
دُر گنجـش نهـاد در ملکوت
از بـرای ظهـور در ناسـوت
«خود شـود گنج نامـهٔ لاهوت
تـا شـود کنـز مخزن اسـرار»

**شد فـــرو در لبــاس طیفوری[1]**
**زد دم «لیس فی» به مســتوری**
**شــد نهــان از لباس مشــهوری**
**«در پــس پرده‌هــای منصوری**
**خود انــا الحق نــوازد اندر دار»**
**خــود عیـــان در رخ بتـــان گـــردد**
**منظـــر چشــم عـــاشــقان گـــردد**
**خود بــه «خالص» فروشــد، آن گردد**
**«خود به "نورعلی" عیان گردد**
**تــا نماید بــه هر کســی دیدار»**

۱. طیفوریه شعبه‌ای از طریقت است که در آن مستی و بیخودی و بریدن از دنیا پسندیده است.

**(١)**

تەخمیسی غەزەلی (نوورعەلی):

سەرمەست لە عیشقی دەرکەوتنی دیـــدار
وەک سەرخۆشـــان لە بـــازاڕدا دەگـــەڕام
کە دیتم، لەسەربانی ماڵی سەرخۆشانەوە
«ئـــەو بتـــە بە مەکـــر و فێڵـــە، ســـەری دەرهێنا
بە زوڵفی خۆی زونناری لەنـــاوقەدی بەســـتبوو»
شای عیشـــق ئالای لە ئیمکاندا هەڵکرد و
لـــە بیچـــمـــی مـــرۆڤـــدا دەرکـــــەوت
یـــەکتایی ئەو دەتگوت هەر هی ئێســـتایە
«لەســـەر ســـەربانی جیهـــــان هـــەردەم
تەپڵی خـــودای تاقانە و تێکشکێن لێدەدا»
نـــــووری کـــائینـــات وەک نـــەی وایـــە
بـــوونی عالـــەم بەبـــێ ئـــەو هیـــچ نییـــە
لـــە نەیـــەوە دەنگی ئـــاوازی ئەو ببیســـە
«خۆی دەبێتـــە نەیژەن و تێی دەتووڕێنێ
غـــەیـــری ئـــەو، ماڵ کـــەســـی تێدا نییە»
ئەمبـــارداری گـــەنج و ئەمباری گەورەیی
دوڕڕی گەنجی خۆی خستە عالەمی باڵاوە
بـــۆ دەرکەوتـــن لـــە عالەمـــی مـــاددە دا،
«خۆی دەبێتـــە گەنجنامەی جیهـــانی لاهووتی
بۆئەوەی ببێت بە گەنجینەی کۆگای نهێنییەکان

چـــووه نـــاو بـەرگـــی تەیفووریيـــەوە[1]
بە داپۆشـــراوی باســـی «لیـــس فی» کرد
خـــــۆی لەبەرگی ناســـیاویدا شـــاردەوە
«لە پشـــت پـــەردەی «مەنســـوور» ییەوە
لەســـەر دار، هەوای «انا الحق» لێدەدات»
خۆی لە ڕوخســـاری بوتاندا دەردەخـــات
دەبێتە جێگەی ڕوانینی چـــاوی عـــاشقان
خۆی بە «خالص» دەفرۆشێت [و] دەبێتە ئەو
«خۆی لەلای «نووری عەلی» ئاشکرادەکات،
بۆ ئەوەی ڕوخسار پیشانی هەمووان بدات»

١. تەیفووریە لقێکی تەریقەتە، کە دەگەڕێتەوە سەر بایەزیدی بەستامی، لەودا مەستی و لە خۆچوون و دابڕان لە دنیای دەوروبەر، بە باش دەزانرن.

## شرح مختصر زندگانی شاعر غزل

کورتەی ژیانی شاعیری غەزەلەکە

**(نورعلیشاه اصفهانی):**

نام وی به مناسبت نام جدش «ملا محمدعلی امام جمعه»؛ میرزا محمدعلی، و والد امجدش میرزا عبدالحسین فیض علیشاه بود. جناب فیض فرزند مستعد خود را پس از بلوغ و اکمال فضایل صوری به خدمت سید معصوم علیشاه روانه نمود و وی به فرقهٔ نعمت‌اللهی مشرف شد و در سفر و حضر سال‌ها در خدمت حضرت معصوم علیشاه بود و به درجهٔ کمال و مقام وصال رسید و سید او را خلیفـۀالخلفاء خواند و ملقب به نورعلیشاه ساخت.

نورعلیشاه در اصفهان متولد شد و تحت تربیت و ارشاد والدش نشو و نما یافت. جناب سید معصوم علیشاه به سال ۱۱۹۰ هجری قمری از طریق دریا از هند به شیراز آمد. آوازهٔ شهرت او در اصفهان به گوش فیض رسید. به همراهی فرزندش به خدمت او شتافت. در شیراز ذهن حکومت را بر علیه سید و مریدانش مشوب کردند و حکمران امر به تبعید آنها داد. پس از نشیب و فراز فراوان و ایذاء و رنج بی‌پایان سید به هند بازگشت و نورعلیشاه به اتفاق مشتاق در ماهان کرمان اقامت گزید. مریدان بسیاری یافتند. بلوایی به پا شد و به دستور ملاعبدالله امام جمعهٔ کرمان، جناب مشتاق را شهید کردند. (۲۷ رمضان ۱۲۰٦)

نورعلیشاه به ناچار ترک آن دیار فرمود و به شیراز رفت. در شیراز به علت غوغای مریدان، لطفعلی خان زند او را نپذیرفت. نورعلیشاه از شیراز عزم عراق عرب کرد و در کربلای معلی اقامت گزید. احمد پاشا والی بغداد به او اظهار ارادت نمود و سقاخانه‌ای در کربلا برایش ترتیب داد و منصب سقایی بدو بخشید. نورعلیشاه مدت پنج سال در کربلا ماند.

چون اهالی کربلا از توقف جناب نورعلیشاه در آنجا راضی نبودند و از طریق شاه قاجار به والی آنجا سفارش کرده بودند که جناب نورعلیشاه را از آن دیار اخراج کند، به سعی و خواهش جناب سید بحرالعلوم و آقا میرسیدعلی صاحب ریاض، جناب نورعلیشاه به مقصد زیارت مکهٔ معظمه، از سلیمانیه به جانب موصل مسافرت

کرد. حسینعلی شاه را به خلافت و جانشینی برگزید. سپس به موصل عزیمت و هم در آنجا به سال ۱۲۱۲ هجری قمری وفات یافت و در جوار مرقد حضرت یونس نبی مدفون گردید.

**تألیفات نورعلیشاه:**

۱. کبرای منظوم در منطق ۲ـ رساله در علم کیمیا ۳. رسالهٔ جامع‌الاسرار ٤. رسالهٔ اصول و فروع ٥ ـ تفسیر منظوم خطبـهٔ‌البیان ٦ ـ جنات‌الوصال.

**دیوان اشعار نورعلیشاه**

جناب نورعلیشاه علاوه بر فضایل صوری و معنوی و کمالات ظاهری و باطنی در سرودن انواع شعر و نظم ید طولایی داشت و در قطعه و رباعی و دوبیتی و قصیده و ترجیع‌بند و مثنوی خامه‌ای رسا و قریحه‌ای وقاد داشت. از همه والاتر غزلیات اوست.

نورعلیشاه؛ نورعلی و نور عین و لام و یا و نور تخلص می‌کرد. چون همه جا مورد تعقیب بود و هواخواهان آقا محمدعلی کرمانشاهی زاهد شهر به دنبال او بودند، پنهانی در بین کُردها می‌زیست و در عراق عرب ناچار "نور" تخلص می‌کرد. دیوان اشعارش به‌اهتمام د. جواد نوربخش از اقطاب طریقهٔ نعمت‌اللهیه در سال ۱۳٤۹ به زیور طبع آراسته شد.

این غزل مورد تخمیس جناب شیخ عبدالرحمن طالبانی "خالص" در صفحهٔ ۹۱ دیوان به شرح زیر آمده است:

**بـر در دیـر آن بـت عیـار    بسته از زلـف بر میان زنـار**
**می‌زنـد دم به دم به بام جهان    کـوس لله واحـد القهـار**
**در پس پـرده‌های منصـوری    خـود انا الحق نوازد اندر تار**
**خـود سر خـود ببازد اندر ره    خود سرِ سروران شود سردار**
**خود شود نـایی و دمد در نی    لیس فـی‌الدار غیـره دیار**
**خود شـود گنـج‌نامهٔ لاهـوت    خود شود نقدِ مخزن الاسرار**
**خود به "نورعلی" عیـان گردد    تـا نمـاید به هر کسی دیدار**

نوورعەلی‌شای ئیسفەهانی:

ناوی ئەم شاعیرە محەمەد عەلی بووە، بە ناوی باپیرەیەوە مەلا محەمەد عەلی ئیمام جومعە، ناو نراوە، کوڕی میرزا عەبدولحوسێنە نازناوی تەریقەتی باوکی "فەیزعەلیشا" بوو. میرزاعەبدولحوسێنی فەیزعەلیشا لەگەڵ کوڕەکەیدا میرزا محەمەدعەلی، کە علوومی زاهیری تەواو کردبوو لە خزمەتی"مەعسووم عەلیشا"دا چووە نێو تەریقەتی نیعمەتوڵاییەوە، ساڵانێکی زۆر لە خزمەتی حەزرەتی مەعسووم عەلیشادا بوو تا بە پلەی کەمال گەیشت و سەید مەعسووم عەلیشا، محەمەد عەلیی کرد بە خەلیفەتولخولەفا و نازناوی نوورعەلیشای پێدا.

نوورعەلیشا لە شاری ئیسفەهان لە دایک بووە، لە ژێر سەرپەرشتیی باوکیدا بە پایە گەیشتووە، ئەو کاتە کە حەزرەتی سەید مەعسووم عەلیشا لە ساڵی ١١٩٠ ی ک، مدا لە ڕێگەی دەریاوە لە هیند هاتە شیراز و ناوبانگی لە ئیسفەهان بە گوێی فەیزعەلیشای باوکی نوورعەلیشا گەییشت، بە هاوڕێیی کوڕەکەی ڕۆییشتنە خزمەتی، لە شیراز لە لای حکوومەتی ئەو کات سیخوڕی و ناحەزی لەسەر مەعسووم عەلیشا کرا و بە ئاژاوەگێڕی تۆمەتباریان کرد. حوکوومەت فەرمانی دوورخستنەوی بۆ خۆی و موریدەکانی دەرکرد، لە دوای هەوراز و نشێو و چەرمەسەرەیێکی زۆر، سەید مەعسوومعەلیشا گەڕایەوە بۆ هیند و نوورعەلیشا بە هاوڕێیی موشتاقعەلیشا لە "ماهان"ی کرمان لە لای مەزاری شا نیعمەتولا نیشتەجێ بوون، موریدانی زۆریان پەیدا کرد. ئاڵۆزی و بەلوا هەڵسا و بە دەستووری مەلاعەبدوڵلای ئیمام جومعەی کرمان، نوورعەلیشا بە ناچار تەرکی ئەو شارەی کرد و ڕۆیشت بۆ شیراز، لە شیراز بە هۆی غەوغای موریدانەوە لوتفعەلی‌خانی زەند قەبووڵی نەکرد، نوورعەلیشا لە شیرازەوە رووی‌کردە عێراقی عەرەب و لە کەربەلا نیشتەجێ بوو. ئەحمەد پاشا والیی بەغدا ڕێزی لێنا و سەقاخانەیێکی بۆ تەرتیب دا و مەنسەبی سەقایی پێ بەخشی.

نورعەلیشا بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە کەربەلا مایەوە، لەبەر ئەوە، هاووڵاتیانی کەربەلا لە مانەوەی نوورعەلیشا رازی نەبوون و لە (لایەکی ترەوە پاشای قەجەر لە تارانەوە بەوالی راسپارد کە نوورعەلیشا دووربخاتەوە و دەری بکا بە هۆی سەییدی بەحرولعولووم و ئاغە میر سەیید عەلی ساحێبی کتێبی "ریاض" بۆ زیارتی مەککە لە ڕێگەی سلێمانی بەرەو موسڵ (خولان) بەڕێ کەوت. حوسین عەلیشای کرد بە

خەلیفە و جێنشینی خۆی، ڕۆییشت بۆ موسڵ "خولان"، هەر لە وێ لە ساڵی هەزار و دوسەد و دوانزە ١٢١٢ کوچی مانگیدا؛ ماڵئاوایی لە دنیا کرد و لە پاڵی مەرقەدی حەزرەتی یوونسی نەبی بە خاک سپێردرا.

نوسراوەکانی نوورعەلیشا:

١ـ کوبرای مەنزووم لە مەنتیقدا، ٢ـ ریسالەیێ لە کیمیادا، ٣ـ ریسالەی جامیعولئەسرار، ٤ـ ریسالەی ئوسوولوفوورووع، ٥ ـ تەفسیری مەنزوومی خوتبەتولبەیان، ٦ ـ جەنناتولویسال، ٧ـ دیوانی ئەشعار؛

دیوانی ئەشعار:

نوورعەلیشا زانا و بلیمەتێکی گەورە بوو، لە عولوومی زاهیر و باتندا ئاگاداریی تەواوی هەبوو لە هۆنینەوەی شیعردا شاعیرێکی پایەبەرز بوو، بە تایبەتی لە ئەنواعی شیعر، وەک قیتعە و چوارێنە و غەزەل و قەسیدە و تەرجیعبەند و مەسنوی بە تایبەت غەزل زۆر بە هێز بووە.

نوورعەلیشا؛ نازناوی نوورعەلی بووە، هەروەها نوورعەین و لام و یا و نووری لە شیعرەکانیدا ئەهێنا.

لەبەرئەوەی بەردەوام بە شوێنیەوە بوون و لە ژێر چاودێریی پیاوانی حوکومەت بووە، بە تایبەت راسپاردانی ئاغە محەمەد عەلی کرماشانی موجتەهید و زاهیدی شاری کرماشان، بە نهێنی لە ناو کوردەکاندا دەژیا و لە عێراقی عەرەبدا بە "نوور" تەخەللوسی دەکرد.

دیوانی شیعرەکانی بە تێکۆشانی د. جەوادی نووربەخش لە ئەقتابی تەریقەتی نیعمەتولایی سالی ١٣٤٩ لە تاران چاپ کراوە.

ئەم غەزەلەی کە حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمانی"خالص" تەخمیسی کردووە لە لاپەڕەی (٩١)ی دیوانەکەیدا هاتووە، کە لە بەشی فارسیی ئەم ناونیشانەدا لەسەرەوەیە.

**شرح تخمیس غزل نورعلیشاه سرودۀ حضرت خالص ۱**
شەرحی پێنجخشتەکیی غەزەلی نوور عەلیشا هەڵبەستی حەزرەتی خالص ۱

سرخوش: مست، جذبه و حال عارفانه
سەرخۆش: مەست، جەزبە و حاڵی عارفانە

عشق جلوۀ دلدار: عشق: رک شرح‌های پیشین
عیشقی دەرکەوتنی دڵدار: عیشق: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو

جلوه: رک شرح‌های پیشین
جیلوە: دەرکەوتنی نوورانی: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو

دلدار: ذات باریتعالی
دلدار: زاتی باری‌تەعالا

خانۀ خمّار: مقام بیرنگی و قطع تعلقات را گویند. (رک دیوان عراقی، دیوان حافظ)
خانەی خەممار: ماڵی مەیفرۆش: مەقامی بێڕەنگی و بڕان لە پێویستیەکان و پێوەندییە دنیاییەکان (بڕوانە دیوانی عەراقی، دیوانی حافز)

بت عیار: مطلوب و مقصود و معشوق را گویند. تجلیّات کثیر و متنوع خالق.
بوتی عەییار: بە مەتلووب و مەبەست و مەعشووق دەڵێن. تەجەلیياتی فرەیی و جۆراوجۆری خوداوەند.

زلف: زلف، در اصطلاح صوفیان کنایت است از مرتبت امکانیه از کلیات و جزئیات و معقولات و محسوسات و ارواح و اجسام و جواهر و اعراض.
در اصطلاحات صوفیه است که زلف کنایت از ظلمت کفر است.
عراقی گوید: زلف غیبت هویت را گویند که هیچ کس را بدان راه نیست.

(تذکرۀ ریاض‌العارفین، ص ۳۹؛ اصطلاحات فخرالدین عراقی)

زولف: زولف، له زاراوه‌ی سۆفیاندا کینایه له مه‌رته‌به‌ی ئیمکانیه له کولییات (گشتیه‌کان) و جوزئیات (تاکه‌کان) و ماقولات (عه‌قڵیه‌کان) و مه‌حسووسات (هه‌ست پێکراوه‌کان) و ئه‌رواح و ئه‌جسام و جه‌واهیر و ئه‌عراض.

له ئیستیلاحاتی سۆفیه‌تیدا هاتووه، که زولف کینایه له کوفره.

عێراقی ده‌ڵێ؛ زولف غه‌یبه‌تی هوویه‌ته، که هیچکه‌س به‌و پله و پایه‌یه ناگات. (تذکرۀ ریاض‌العارفین، ص ۳۹؛ اصطلاحات فخرالدین عراقی)

زنار: زنار علامت خاصی است که عیسویان راست و در اصطلاح زنار بستن؛ عقد خدمت است یعنی در زبان اهل حال اشارت به بستن بند خدمت و طاعت محبوب حقیقی است در هریک از مراتب که باشد. (شرح گلشن راز، ص ٦٣٩)

زوننار: نیشانه‌ی تایبه‌تی خاچپه‌رسته‌کانه و له زاراوه‌ی سۆفیه‌تیدا گرێبه‌ستی خزمه‌ته، یانی به زمانی ئه‌هلی حاڵ، ئاماژه‌یه بۆ به‌ستنی که‌مه‌ربه‌ندی خزمه‌ت و ئیتاعه‌ی مه‌حبووبی حه‌قیقی له هه‌ر مه‌رته‌به‌یه‌کدا که سالیک هه‌یبێ. (شرح گلشن راز، ص ٦٣٩)

عَلَم: پرچم، نشانۀ قدرت و تسلط و هویت.

عه‌له‌م: په‌رچه‌م، ئاڵا، نیشانه‌ی هێز و ده‌سه‌ڵات و ناسنامه‌یه.

شاه عشق: مقصود خداوند است.

شای عیشق: مه‌به‌ست خوداوه‌نده.

امکان: جهان مادی منظور است.

ئیمکان: مه‌به‌ست جیهانی ماددیه.

شد هویدا به صورت انسان: مقصود تجلی حقانی در وجود انسان کامل است.
له شێوەی مرۆڤدا دەرکەوت: مەبەست تەجەللیی حەققانیلە وجوودی ئینسانی کامیلدایە.

تار: در دیوان نورعلیشاه به صورت"تار"و "دار" نیز آمده است.
تار: ئەم وشەیە لە دیوانەکەی نوورعەلیشادا بە شێوەی "تار" و "دار"یش هاتووە.

وحدت او کما هی الآن: جناب شیخ عبدالرحمن (خالص) اشاره به خویش در مقام انسان کامل دارد.
... یەکتایی دەتگوت هی ئێستایە: بۆ ئینسانی پێگەیو(کامیل) ئەبەد و ئەزەل یەکسانە، حەزرەتی شێخ عەبدورەحمان (خالص) ئاماژە بە خۆی دەکا لە پێگەی ئینسانی پێگەیو دا.

هست خود نور کائنات چو نی: نی = انسان کامل. نورانیت جهان به واسطۀ وجود انسان کامل است.
نووری کائینات وەک نەی وایە: نەی = ئینسانی کامیل. نوورانیەتی جیهان بە بۆنەی ئینسانی پێگەیوەیە.

بودِ عالم جز او بود لاشیئ: هستی جهان جز هستی او عدماست.
بوونی عالەم بێجگە لەو، نەبوونە: هەبوونی جیهان جگە لە بوونی ئەو بوونی نییە.

خازن گنج و مخزن جبروت: صاحب ثروت معنوی و قدرت و عظمت بیپایان.
عەمبارداری گەنج و کانگای گەورەیی: ساحیبی سەروەتی مانەوی و هێز و گەورەیی بێسنوور و کۆتایی.

**از برای ظهور در ناسوت**
**خود شود گنج نامۀ لاهوت**

انسان کامل گنج نامۀ خداوندی است و لاهوتی است.

لاه به معنی اله بوده، "واو" و "تا" برای مبالغه به آن افزوده شده مانند "واو" و "تا"ی جبروت و ملکوت.

اشاره بدین نکته ضروری است که اله با الله متفاوت است. الله یکی است و "اله " متعدد است.

بـــۆ دەرکـــەوتن لـــە عالەمی مـــاددیدا
خۆی دەبێتە گەنجنامەی جیهانی لاهووتی

ئینسانی کامیل گەنجنامەی خوداوەندە و لاهووتییە.

لاە بە مانای اله، "واو" و "تا" بۆ موبالەغە و گەورەپیشاندان ئەدرێتە پاڵی ئەو وشەیە؛ وەک "واو" و "تا" لە جەبەرووت و مەلەکووت و...دا

ئاماژە بەم خاڵە پێویستە کە وشەی"اله" و "الله" جیاوازن ، "الله" تاقانەیە بەلاّم "اله" فرەیە.

**شـــد فـــــرو در لبـــاس طیفـــوری**
**زد دَم لیـــس فـــی بەمســـتوری**

مقصود از لباس طیفوری، ابویزید طیفور بن عیسی بن سروشان بسطامی مؤسس طریقۀ طیفوریه است که "لیس فی جبتی غیر الله" زد.

چـــووە نـــاو بـەرگی تەیفوورییەوە
بە داپۆشراوی باسی "لیس فی"ی کرد

مەبەست لە بەرگی تەیفووری؛ حیکایەتی ئەبویەزید تەیفوور کوڕی عیسی کوڕی سەروەشانی بەستامیە، کە دانەری تەریقەتی تەیفوورییە، کە لە بەزمی سەمای دەروێشاندا خەرقەی لەسەرکرد و گوتی؛ لیسَ فی جبتی غیر الله؛ لە جوببەی مندا جگە لە خودا هیچ نییە! و...

**شـــد نهـــان در لبـــاس مشـــهوری**
**در پـــس پـــردەهـــای منـــصـــوری**

مقصود تجلی حقّ در جامۀ حسین بن منصور حلاج است که شهرت تمام دارد.

خـــۆی لـــە بـەرگی ناســـیاوی شـــاردەوە
لە پشـــت پـــــەردەی مـــەنســـوورییەوە

مەبەست دەرکەوتنی حەق لە جامە و گیانی حوسێنی مەنسووری حەلاجدایە کە ئەو باسە مەشهوورە.

**خــود عیــان در رخ بتــان گــردد**
**مَنْظَــر چشــم عــاشــقان گــردد**

خداوند در چهره‌های زیبا جلوه می‌کند و عشق برای عاشقان پدید می‌آید که با نگاه پا به راه نهاده و عبادت عاشق نظر است، تا به مرحلۀ عشق روحانی می‌رسد و بدین سبب گفته‌اند؛

**نظر بر مَنْظَر خوبان حلال است      نَظَرْ بر صنع ذات ذوالجلال است**

خۆی لە ڕوخساری بوتاندا دەردەخات، دەبێتە جێگەی ڕوانینی چاوی عاشقان

خوداوەند لە ڕوخساری جواناندا دەردەکەوێ دەکا و عیشق بۆ عاشقان پێکدێنێ، کە بە نیگایێ پێ بنێنە ڕێگەی عاشقی و عیبادەتی عاشق نەزەر و نیگایە. تا بە پلەی عیشقی ڕووحانی دەگات، و هەر بۆیەش شاعیرانی عارف وتوویانە

تەماشای جــەمالی جــوانان حــەلالە      نەزەرکردنە بۆ سونعی زاتی زولجەلال

خود به "خالص" فرو شد آن گردد...

چون در وجود "خالص" وارد گردید، همانند او می‌گردد. آینۀ حق می‌شود.

خوی بە "خالص" نازڵ دەبێ، و ئاوێتەی دڵ دەبێ، دڵ و ڕۆح دەبێ بە ئاوینەی ئەو

هەڵبەت حەزرەتی کاک ئەنوەر "فروشد" ی بە فرۆتن و کڕین داناوە، کە لە عیرفاندا "بیع و شەرا" نییە، هەموو قاڵ و مەقاڵی عارفان لەسەر نەفی "مەکاسب"ە، جا ئەگەر بەم مانایە چاوی لێ بکەین، دەبێ بڵێین؛ "خۆی بە خالص دەگۆڕێتە وە..." کە ئەمە باسەکەی بەربــڵاوە، بەڵام مەبەستی شاعیر لێرەدا هاتنی سیفاتە و دەرکەوتنی ئەو سیفاتەیە کە عارف دەبێ بە ئاوێنەی حەق...

## (۲)
## تخمیس غزل نورعلی

ای چشـــم! ببیـــن پرتـــو انـــوار رخ یار
کرداه‌ست عیان جلوه به هر کوچه و بازار
بــــردار ز پیش نظـــــر این پــــردهٔ پندار
«ای دل! بگشا چشم و ببین جلوهٔ دلدار
کرده است تجلی همه‌جا بر در و دیوار»
ای طـــالب راز دل مســـتان ره عشق!
بی عشق مجـــو سرّ[1] حریفان ره عشق
رمزی است خفی در بر رندان ره عشق
«رازی است نهان در دل مردان ره عشق
کـــو را نتوان کرد بیان جز بـــه سرِ دار»
چون بــــادهٔ اســـرار مبرا ز چه و چون
در مشـــرب ارباب محبت شده مکنون
تــــــا راز نیفتد ز پس پرده به بیرون،
«از حلق حریفان بگشودند بسی خون
تا لب نکند تر کسی از بــــادهٔ اسرار»
تـــــا ذوق می عشق چشیدند رفیقـــان،
گشتند به هر کوچه و در واله و حیران
اســـرار عیان شد همه جا از لب ایشان
«رازی که پس پرده نهان بود حریفان
کردند عیان با دف و نی، بر سر بازار»

---

۱ . به کەسری (سین) و شەددی (راء)

ای آن که ز اســرار حقیقت به گمانی!
در راه فنا اســب خودی را چه دوانی؟
زاهـــد! تــو بـــرو، بار محبت نتوانی
«ای شیخ! ز اسرار حقیقت تو چه دانی؟
عمرت همه بگذشت پی جبه و دستار!»
«خــــالص»! چو شود مهر رخ یار درخشان،
ظلمت‌کـــدهٔ کفــــر شــود مطلــع ایمـــــان
فی‌الحال شــود مغرب و مشرق همه یکسان
«بــــالله که نمــاند اثر ظلمت امکــان
گر نــور علی ســر زند از مشرق انوار»

## (٢)
## تەخمیسی غەزەلی نوورعەلی

ئەی چـــاو! وەرە شەوقی نـــووری ڕووی دڵـــدار ببینە
لە هەموو کۆڵان و بازاڕێکدا جیلوەی خۆی دەرخستووە
ئـــەم پـــەردەی گومانـــە لەبـــەر چـــــاوت هەڵبگـــرە
«ئـــەی دڵ! چـاوت بکەوە و دەرکـــەوتـــنی دڵـــدار ببینە
کە هەموو شوێنێک لەسەر دەرک و دیواری خۆی دەرکەووتوە»
ئەی ئەوەی خوازیاری نهێنییەکانی دڵی سەرخۆشانی ڕێبازی عیشقی!
بە بێ عیشق، بەشوێن نهێنییەکانی خەنیمانی ڕێبازی عیشقدا مەگەڕێ
ڕەمـــزێکی شاراوە لە لای جوامێرانی ڕێبـــازی عیشق هـــەیە
«ڕازێـکـی شـــاراوە لە دڵـی پیاوانی ڕێبازی عیشقدایە،
کـــە لـــەســـەر دار نـــەبـێ نـــاکرێت دەریـــبـــڕن»
لەبەر ئەوەی بادەی بێبەری لە پرسی چییەتی و چۆنیەتی
لـــە ڕوانگەی ئەهلی خـــۆشەویســـتیدا شـــاردراوەتەوە
بۆ ئەوەی نهێنییە، کە لە پشـــت پەردەوە دەرنەکەوێت،
«خـــوێنی زۆریـــان لە گـــەرووی خـەنیمـان هێنـــا
بۆ ئەوەی کەس لێو بە شەرابی نهێنییەکان تەڕ نەکات»
هـــاوڕێیـــان هەرکـــە چێـژی شـــەرابـی عیشقیـــان چــــەشت،
لە هەموو کۆڵان و بەردەرگایەک سەرلێشـــێواو و حەیران بوون
نهێنییەکان لە لێوی ئەوانەوە بـــە هەموو لایەکدا بـــڵاو بوونەوە
«ئـــەو نهێنییەی لـــە پشت پـــــەردە شـــارا بـــــووەوە،
خـەنیمان بە دەف و نەیەوە لەسەر بـازاڕ لە قاویان دا»

ئـــەی ئـــەوکەســـەی لە نهێنییەکانی حـــەقیقەت بە گومانی!
بۆچـــی ئەســـپی خۆیـــەتی لـــە ڕێبـــازی فەنـــادا دەرەتێـــنی؟
زاهید، بڕۆ! تۆ ئەو کەسەنی کە بتوانێ باری خۆشەویستی هەڵبگرێ
«ئـەی مـەلا[1] تۆ لە نهێنییەکانی حەقیقەت چ دەزانی؟
تۆ هەموو تەمەنت بەشوێن کەوا و مێزەردا تێپەڕ بوو»
ئـــەی «خالـــص»! کاتێ کە هەتـــاوی ڕووی یار بدرەوشـــێتەوە
تاریکخانەی کفر دەبێتە شوێنی سەرهەڵدانی [هەتاوی] ئیمان
دەســـتبـــەجێ ڕۆژهـــەڵات و ڕۆژئـــاوا یـــەکســـان دەبـــن
«سوێندم بە خودا، کە هیچ نیشانەیەک لە تاریکایی ئیمکان نامێنێت
ئەگەر نووری عـەلی[2] لە ڕۆژهەڵاتی نوورەکان سەرهەڵبدات»

١ . لە دەقەکەدا «شێخ» هاتوە. ئێرانییەکان بە مەلا دەڵێن «شێخ».
٢ . نووری عەلی کینایەیە بۆ ئیمامی عەلی و ناسناوی شاعیری شیعرەکەشە.

## شرح تخمیس غزل نورعلیشاه سرودۀ حضرت خالص ٢
## شەرحی پێنجخشتەکیی غەزەلی نوورعەلیشا هەڵبەستی حەزرەتی خالص ٢

**نورعلی = نورعلیشاه**

برای آگاهی از احوال و آثار او ر.ک به اوّلین تخمیس از غزل نورعلیشاه آمده در دیوان حاضر. این غزل که جناب شیخ عبدالرحمن (خالص) تخمیس فرموده‌اند در صفحۀ (٩١) دیوان نورعلیشاه این گونه آمده است:

**ای دل بگشـــا چشـــم و ببیـــن جـلوۀ دلدار    کرده اســت تجلی همه جا بــر در و دیوار**
**ســرّی اســت نهان در دل مردان ره عشــق    کـــان را نتوان کرد عیــان جز به سرِ دار**
**از حــلق حریفان بگشــودند بســی خـــون    تا لب نکند تــــر کســی از بـــادۀ اســـرار**
**ای شــیخ ز اســرار حقیقت تــو چـــه دانی؟    عمرت همه بگذشــت پی جبه و دســتـار**
**خورشــید رخ دوســت عیان اســت و لیکن    کــی کســب کند نـــور از آن آیـنۀ تـــار**
**رازی کــه نهـــان بــود پس پرده حریفــان    کردنــد عیـــان بـا دف و نی بر ســر بازار**
**بـــالله کــه نمـــانــد اثر از ظلمــت امکـــان    گــر "نورِ علی" ســر زنــد از مطلع انـــوار**

(دیوان نورعلیشاه، به اهتمام د. جواد نوربخش، ص ٩١)

برای آگاهی از تفاوت‌های غزل در هر دو دیوان درج شد و چون نسخه "جذبۀ عشق" به کُردی ترجمه شده از برگردان آن خودداری شد.

**نوورعەلی = نوورعەلی‌شا**

بۆ ئاگاداری لە بە سەرهاتی نوورعەلی شا، بڕوانە سەرەتای یەکەمین پێنجخشتەکی لە غەزەلەکانی نوورعەلیشا لە م کتێبەدا.

ئەم غەزەلە کە حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمان (خالص) تەخمیسی کردووە، لە لاپەڕەی ٩١ی دیوانی نوورعەلیشادا بەوشێوەیە، کە لە بەشی فارسیدا لەسەرەوە ئاماژەم پێ کردووە، هاتووە، بۆ ئاگاداری لە جیاوازییەکانی غەزەلەکە لە هەر دوو دیوانەکەدا هێنام و لەبەر ئەوەی لە نوسخەی جەزبەی عیشقدا وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، لێرەدا وەریناگێڕینە سەر زمانی کوردی.

ای چشم ببین پرتو انوار رخ یار...

هم جناب نورعلیشاه و هم جناب خالص اشاره به سخن معروف هاتف اصفهانی داشته‌اند که فرمود؛

**جلوهٔ یار از در و دیوار     در تجلی است یا اولی‌الابصار**

ئەی چاو! وەرە شەوقی نووری ڕووی دڵدار ببینە...

هەم حەزرەتی نوورعەلیشا و هەم حەزرەتی خالص لە م بەشەدا ئاماژەیان بۆ ئەو شیعرە بەناوبانگەی هاتفی ئیسفەهانیە کە دەڵێ؛

جیـــلوەی یـار لە دەر و دیـــوار     لە دەرکەوتن‌دایە ئەی ئەوانەی چاوتان هەیە

ای طالب رازِ دلِ مستان ره عشق...؛

طالب: سالک مبتدی

راز دل مستان ره عشق: آنچه ناگشودنی است به قول حافظ، که کس نگشود و نگشاید به حکمت این معما را

ئەی ئەوەی خوازیاری نهێنییەکانی دڵی سەرخۆشانی ڕێبازی عیشقی... ،

تالیب، سالیکی سەرەتایی نهێنییەکانی دڵی سەرخۆشانی ڕێبازی عیشق؛ ئەوەی، کە ناکرێتەوە بە وتەی حافزی شیرازی، کە کەس بە حکیمەت ئەم موعەمایەی نەکردووەتەوە و نایکاتەوە.

چون بادهٔ اسرار مبرّا ز چه و چون...

در عرفان "سکوت" جایگاه والایی دارد. مولوی می‌فرماید:

**هر که را اسرار غیب آموختند     مُهر کردند و دهانش دوختند**

پس هر کس بادهٔ اسرار نوشید از گفت و شنود و مجادله و مباحثه به دور و مبرا می‌شود.

وەک شەرابی نهێنی وا لە پرسی چییەتی و چۆنیەتی، پاکن... لە عیرفاندا "بێدەنگی" پێگەیەکی بەرزی هەیە. مەولەوی دەڵێ؛ نهێنییە داپۆشراوەکانیان بە هەرکەس گوت، مۆریان کرد و دەمیان دووری، بەم هۆیەوە هەرکەس بادەی نهێنیی نۆش کرد، لە وتوویێژ و دەنگ و باس بە دوورە و پاکە.

تا ذوق می عشق چشیدند رفیقان...

ذوق: رک به شرح‌های پیشین     می (و) عشق: رک به شرح‌های پیشین

رفیقان؛ یاران طریقت، اشاره به حلقهٔ ذکر اهل طریق و بزم سماع و رمزها موسیقی عرفانی که از نهانی‌های درون سالک پرده برمی‌دارد.

هاوڕێیان که چێژی شەرابی عیشقیان چەشت...

زەوق: بڕوانە شرۆڤەکانی پێشوو.   مەی و عیشق: بڕوانە شرۆڤەکانی پێشوو.

رەفیقان، هاوڕییان؛ یارانی تەریقەت، ئاماژەیە بە ئاڵقەی زیکری ئەهلی تەریقەت و بەزمی سەما و رەمزی مۆسیقای عیرفانی، کە پەردە لەسەر نهێنیەکانی دەروونی سالیک لادەبا.

ای آن که ز اسرار حقیقت به‌گمانی...

به‌گمانی: تردید داری، بدبینی، سوءظن داری. مقصود قشریون سطحی‌نگر و اهل قال و مقال که تکیه بر ظواهر امر دارند.

ئەی ئەوکەسەی لە نهێنییەکانی حەقیقەت بەگومانی!... گومان؛ لە دوو و سێدابوون، ڕەشبینی، بیروڕای خراپ دەر حەق بەشتێ، مەبەست ئەهلی زاهیر و ڕواڵەتبین و ڕواڵەتی و ئەهلی قال و مەقالە کە پاڵیان بە زاهیری ئەمرەوە داوە.

"خالص" چو شود مهر رخ یار درخشان...

چو؛ هم قید زمان است و هم ادات تشبیه که به خالص بازمی‌گردد. در این بند از تخمیس خالص و نورعلی هر دو ایهام دارد و به تساوی هر دو اشاره به مظهر انسان کامل بودن است و...

ئەی "خالص" کاتێ هەتاوی ڕووی یار بدرەوشێتەوە...

وشەی "چو" لە فارسیدا هەم قەیدی زەمانە و هەم ئەداتی تەشبیهە، کە لەم دێڕەدا دەگەڕێتەوە بۆ "خالص"، لەم بەشەی تەخمیسەکەدا، نازناوی "خالص" و "نوورعەلی" هەر دوو ئیهامیان هەیە و بە یەکسانی هەر دوو ئاماژەیە بۆ مەزهەری ئینسانی کامیل و...

## (۳)
## تخمیس غزل نورعلی

مطربــــا! درکش نوا بـا چنگ و زیل
ذوق ده جـــان را به یـاد آن جمیل
چنگ و می هســتند بر عشقش دلیل
«ساقیـــا! کو بـــادهٔ چون سلسبیل؟
تا شــوم مســت و کنم جان را سبیل»
در ره آن شــیخ، قربـــانـم، کـه او
بـــر در آن پـیـر دربـــانـم، کـه او
مــن اسـیر غـــوث گیـــلانـم که او
«مـــن غـــــلام همـت آنـــم که او،
کـــار پـیغمبر کنـــد بی‌جبـرئیل»
نبـــود از علـــم و رســوم هنـدســه
جـز عنـــاد انـــدر عنـــاد هنبســه
دور شــو از ظلمـــــت ایـن وسوســه
«نیسـت انـــدر خـــانقاه و مدرســه
حـاصلـی جــز آه آه و قـال و قیــل»
چنـــد مغـــروری به خــوبــی، زاهدا!
زنــگ کبــر از دل نــروبـی، زاهـــدا
غـــــرق دریـــای ذنــوبـی، زاهـــدا
«طبل فرعونی چـه کـوبی زاهـــدا؟
غـافلـی، غـافل تـو از بانگ رحیل»
تـــا نبـاشـد جـــلوه‌گـر ســرّ ولی
می‌نگــــردد دل بـــه نــــورش منجلی
"خـالصـا" کی بینی جـانـان را جلی
«تـــا نتابـد در دلـــت نـــور علـــی
کی عیـــان بینـــی جمال آن جمیل»

## (٣)
## تەخمیسی غەزەلی «نوورعەلی»

ئەی موتریب! ئاوازت بە چەنگ و زیل‌ەوە هەڵبڕە
بە یــادی ئەو جــوانەوە زەوق بە گیــان ببەخشە
چــەنــگ و مــەی ڕێنوێــنی عیشــقی ئــەون
«ئەی ساقی! کوانێ ئەو مەیەی وەک سەلسەبیلی[بەهەشتە]؟
تــاکو پێی سەرخــۆش بم و گیانم لە ڕێگەیدا بکەمە خێری ئەو"
قوربــانی ڕێگــەی ئــەو شــێخەم کــە ئــەو،
دەرکــەوانی دەرگای ئــەو پــیرەم کــە ئــەو،
ئەســیری غــەوســی گەیـــلانم کــە ئــەو،
«من غولامی هیمەتی ئەو کەسەم کە ئەو،
بە بێ جیبرەئیل کاری پێغەمبەر دەکات»
لــە عیــــلم و ڕێ و ڕەسمـــی هــەنــدەســەدا
هیچ شتێک نییە جگە لەسەرپێچی لەنــاو سەرپێچیی هنبسەدا
خــۆت لــە تاریکایی ئــەم وەســوەســەیــە دوور بخــەوە
«لە خانەقا و مەدرەسەدا هیچ دەسکەوتێک
نییە جــگە لە ئاخ و ئۆف و قسەی بەتاڵ»
ئەی زاهید! چەندە شانازی بە چاکیی خۆتەوە دەکەیت؟
ئەی زاهید! تۆ ژەنگی لە خۆبایی بوون لە دڵت ناکەیەوە؟
ئــەی زاهیـــد! تــۆ غەرقــی دەریـــای گــوناهــانی
«ئەی زاهید! تاکەی تەپڵی فیرعەونی لێدەدەیت؟
تــۆ لە بــانگەوازی سەفەر غافڵی، غافڵ!»
هەتاکــو نهێنییەکانی مرۆڤــی «وەلی» دەرنەکەوتبێت
دڵ بـــە نـــووری ئـــەو ڕوونـــاک نـــابێتــەوە
ئــەی «خالص»! کــەی دڵدار بــە ڕووناکــی دەبینی؟
«تا ئەو دەمەی نووری عەلی لە دڵتدا نەدرەوشێتەوە
کەی دەتوانی بە ئاشکرا ڕوخساری ئەو جوانە ببینی؟»

## شرح تخمیس غزل نورعلیشاه سرودهٔ حضرت خالص ۳
شەرحی پێنجخشتەکیی غەزەلی نوورعەلیشا هەڵبەستی حەزرەتی خالص ۳

این غزل که توسط جناب (خالص) تخمیس شده است، در صفحهٔ ۱۱۵ دیوان نورعلیشاه این گونه آمده است:

**ساقیـــا کو بادهٔ چون سلسبیل　　تا شوم مست و کنم جان را سبیل**
**من غـــلام همـــت آنـم که او　　کـــار پیغمبـر کنـد بی‌جبـــرئیل**
**نیست بـــاکم زاتش نمرودیان　　گـر بسوزانندم از کین چون خلیل**
**طبـــل فرعونی چه کوبی زاهدا　　غـــافلی غافل تو از بـــانگ رحیل**
**جز کفن با خود نبرده زیر خاک　　آن که زد تخت شهی برپشت پیل**
**نیست انـدر خـانقاه و مدرسه　　حـــاصلی جز آه و واه و قال و قیل**
**تـــا نتـــابد در دلت"نور علی"　　کی به دل بینی جمـــال آن جمیل**

(رک دیوان نورعلیشاه، د. جواد نوربخش، ص ۱۱۵)

ئەم غەزەلە کە حەزرەتی "خالص" کردوویە بە پێنجخشتەکی لە لاپەڕەی (۱۱۵) دیوانی نوورعەلی شادا بەو جۆرەی لەسەرەوە هێناومە هاتووە.

مطربا در کش نوا با چنگ و ذیل...

ذیل: دل، ذوق: رک شرح‌های پیشین، یاد: رابطهٔ مرید و مرشد ، جمیل: زیبا (خداوند)، می: رک شرح‌های پیشین، دلیل: رهنما، به مقصد رساننده،ساقی: رک شرح‌های پیشین، مست: رک شرح‌های پیشین، سبیل: فدایی طریق

این بند مقدمهٔ نزول و غلبهٔ جذبهٔ عرفانی است.

ئەی موتریب! ئاوازت بە چەنگ و زیلە وە هەڵبڕە...

زیل: دڵ ئیهامی تێدایە وەک، چۆن بە کوردی خۆمان دەڵێین دەست و دڵت بەکاربێ، هەم چەنگ: دست، چەنگ: سازی چەنگ، زەوق: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو، یاد: پێوەندیی باتنیی مورید و مورشید، جەمیل: جوان، مەبەست خوداوەندە، مەی: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو ،دەلیل: ڕێنما، بەرەندەی بە مەبەست، ساقی: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو، مەست: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو، سەبیل: خۆبەخشی

ڕێگای تەریقەت، ئەم بەشە سەرەتای ڕووخانی غووروور و سەرکەوتنی جەزبەی عیرفانیە.

در ره آن شیخ قربانم که او...

شیخ: مرشد، قطب دستگیر، قربان: فدایی، تسلیم، پیر: مسندنشین طریقت، مربی باطنی، دربان: محافظ، مواظب ، اسیر: دربند، شکار، عاشق، غوث گیلان؛ محیی‌الدین عبدالقادر گیلانی مؤسس و قطب طریقهٔ قادریه، همت: نیروی باطنی، کار پیغمبر کند بی‌جبرئیل: صاحبان ولایت الهام از طریق دل می‌گیرند و بدون واسطه درمی‌یابند زیرا مأموریت جبرئیل با خاتمیت نبی اتمام یافته است.

قوربانی ڕێگە ی ئەو شێخە بم کە ئەو...

شێخ: مورشید، قوتبی دەسگیر، قوربان: تەسلیم، فیدایی، پیر: پۆستنشینی تەریقەت، ڕێنمای باتنی، دەربان؛ کێشکچی، ئەسیر: دەس‌بەسەر، شکار، عاشق، غەوسی گەیلانی: حەزرەتی محێدین عەبدولقادری گەیلانی بناغەدانەر و قوتبی تەریقەی قادری.

هیمەت: وزەی باتنی، کاری پێغەمبەر بەبێ جبرەئیل دەکا... ساحیبانی وەلایەتی گەورە ئیلهام لە ڕێگەی دڵەوە وەردەگرن، بێ ئەوەی واسیتەیێ هەبێ، ـ لەبەرئەوەی خزمەتی جبرەئیل لەگەڵ کۆتایی و خەتمی پێغەمبەرایەتیدا دوایی هاتووە.

نَبْوَد از علم و رسوم هندسه...

این بند ردیه بر عنوان و مکان و تشریفات به نام عرفان و تصوف است، که عارفان عمل و سلوک الی الله را ملاک می‌دانند نه ظواهر خانقاه و خرقه و مدرسه و کتاب را.

هیچ شتێک لە عیلم و نەریتی هەندەسەدا نییە...

ئەم بەشە ڕەتکردنەوەی عینوان و جێگە و تەشریفاتی سوفیەتیە بە ناوی عیرفان و تەسەوفەوە، وەک شێخ و سەدر و نەقیب و خانەقا و خەلیفە و مورید و...چونکە عارفان کردەوە و سولووک ئیلەلا بە بنەما دەزانن، نەک زەواهیری خانەقا و خەرقە و مەدرەسە و کتێب و...

چند مغروری به خوبی زاهدا...

زهدفروشی و خودنمایی که مقدمهٔ غرور است از گناهان نابخشودنی در نزد عارفان متصوف است و آن را با عمل فرعون برابر می‌دانند که بانگ رحیل و سفر آخرت را در نظر نداشت.

ئەی زاهید! چەندە شانازی بە چاکیی خۆتەوە دەکەیت؟...

زوهدفرۆشتن و خۆنواندن، کە سەرەتای غوروورە لە گوناهانێکە لە لای عارفانی موتەسەویف، کە نابەخشرێن و ئەو کردەوەیە لەگەڵ کردەوەی فیرعەون بە یەکسان دادەنێن، کە ئەو بانگەوازی مەرگ و سەفەری لە دنیادەرچوونی لە بیرنەبوو.

تا نباشد جلوه‌گر سرّ ولی...

تا راز ناگشودهٔ ولایت جلوه‌گر نشود و دل به نور الهی منجلی نگردد...

در مصرع سوم سکته‌ای وجود دارد و باید چنین باشد که؛ "خالصا" تو کرده‌ای جان را جلی... ـ تا زمانی که نور متجلی از آینهٔ سلطان اولیاء علی بن ابیطالب در دلت نتابد، به وصال حق نخواهی رسید. ـ (بحث آینه در آینه = بی‌نهایت، در عرفان مفصل است که در سه مصرع پایانی این بند به آن اشاره شده است.)

هەتاکو نهێنییەکانی مرۆڤی «وەلی» دەرنەکەوتبێت...

تا نهێنیی نەکراوەی وەلایەت جیلوەگەر نەبێ، دڵ بە نووری ئیلاهی ڕوون نابێتەوە / لە دێڕی سێیەمدا وەستانێک هەیە و دەبێ وا ڕاست بکرێتەوە کە؛ "خالصا، تو کرده‌ای جان را جلی"...ـ تا ئەو کاتە کە نووری دەرکەوتوو(موتەجەللی) لە ئاوێنەی سوڵتانی ئەولیا، عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە، (د) لە دڵی تۆدا تیشک نەدا، بە ویسالی حەق ناگەی ـ (باسی ئاوێنە لە ئاوێنەدا = واتە بێنیهایەت لە عیرفاندا بە فرەیی هاتووە) ـ کە لە سێ دێڕی کۆتایی ئەم بەشەدا ئاماژەی پێ کراوە.

(۱)

### تخمیس غزل (قصاب):

ای کــه جز یاد تــو در کون و مکان افســانه
روشــن از نـــور رخت میکده هم کاشــانه
همــه عـــالم ز تو مســتند و ز تــو، فــرزانه
«ای نگــه با نظـــرت هم می و هــم میخانه،
گردش چشــم تو هم ســاغر و هــم پیمانه»

ای کــه با دشــمن و با دوســت، نوالت ظاهر
بهـــره‌جــو از کرمت هم دنــی و هم طــاهر
کیســت آن کـــو نبود جــود تو بر وی دائر
«هم مســلمان ز تو حاجت طلبــد، هم کافر
طـــاق ابروی تو هــم کعبه و هــم بتخــانه»

ای کــه بیرنگــی عالــم ز تــو باشــد پررنگ
پرتــو روی تــو در کــون و مــکان در آهنگ
چشــم بیمار تــو هم فتنــه و هــم پرنیرنگ
«نرگســت با همه در آشــتی و هم در جنگ
نگهــت با همــه کس محــرم و هــم بیگانه»

جلــوهٔ روی تو داده اســت به خوبــان مظهر
عاشــق ســوخته‌دل را شــده زان رو[1] منظر
تو، که باشــی همــه خوبان جهــان را مصدر
«توکه هم شمعی و هم گل چه عجب باشد اگر
که دهــد دل به تو هم بلبــل و هم پــروانه»

عاشــق روی تو هم حال شــدم، هم در اصل
هم بــه وصل تو رضـــا داده‌ام و هم با فصل
ای که مژگان تو بر ســینهٔ عاشــق زده نصل!
«هــم به هجر تو به‌ســر می‌برم و هم با وصل
دل هــم آباد بــود از تـــو و هـــم ویــرانه»

---

۱ . زآن رو

ای فـــروغی ز رخت عــالم حســن ناسوت!
جــلوه‌گر زلف تو بــر کــافر و بر مؤمن روت
ســرّ[1] ایمان ز رخت خیزد و کفر از گیســوت
«لعل جانبخش تو هــم قوت بود، هم یاقوت
خـــال گیســوی تو هم دام بود، هم دانــه»
من همـــاندم که شــدم از می عشقت ذایق
مست و شــیدا و سراسیمه شدم چون وامق
در ره عشــق تو، هم «خالص»م و هم صادق
«گفت «قصاب»: تو دیوانه شــدی یا عاشق؟
ای بــه قربان تو هم عــاشــق و هم دیوانه!»

۱ . با کسر (سین) و شد (راء)

## (١)
## تەخمیسی غەزەلێکی «قەسساب»

ئەی ئەوەی واجگە لە یادی تۆ، هەمووشتێکی کەون و مەکان ئەفسانەیە
هەم مەیکەدە و هەم ماڵ لە نووری ڕوخسارت ڕووناکن
هەموو عالەم لە تۆوە سەرخۆشن و لە تۆوە عاقڵن
«ئەی نیگا و نەزەرت هەم مەیە و هەم مەیخانە!
چەرخی چاوانت هەم دەفری شەراب و هەم پەیمانەیە»
ئەی ئەوەی بەخشینت بە دوژمن و دۆست ئاشکرایە
هەم پاک و هەم ناپاک لە کەرەمی تۆ بەهرە وەردەگرن
کێیە ئەو کەسەی بەخشندەیی تۆ نایگرێتەوە؟
«هەم مسوڵمان داوای پێداویستیت لێ‌دەکات و هەم کافر
تاقی بڕۆت هەم کەعبەیە و هەم بتخانە»
ئەی ئەوەی بێڕەنگیی عالەم لە تۆوە پڕڕەنگە
شەوقی ڕووی تۆ لە کەون و مەکاندا ڕەنگ دەداتەوە
چاوی بیمارت هەم فیتنەیە و هەم پڕ شەڕ و شۆرە
«نەرگس[ی چاو]ت لەگەڵ هەمووکەس هەم لەئاشتیدایە وهەم لەشەڕدا
نیگات بۆ هەمووکەس هەم مەحرەمە و هەم بێگانە»
دەرکەوتنی ڕوخساری تۆیە جوانیی بە جوانان داوە
هەر لە و ڕۆژەوەش بۆتە ڕوانگەی عاشقانی دڵسووتاو
تۆ کە باڵانشینی سەرووی هەموو خاسانی جیهانی،
«تۆ، کە هەم شەم و هەم گوڵی، سەیر نییە ئەگەر
بولبولیش و پەپوولەش دڵیان بە تۆ دابێت»
هەم ئێستا عاشقی جوانی تۆم و هەم لە بنەڕەتدا بووم
هەم بە وەسڵت ڕەزامەندم و هەم بە جودایيت
ئەی ئەوەی کە برژانگت تیری لە سینگی عاشق داوە،
«من لە دووریی تۆشدا ژیان دەبەمە سەر و لە وەسڵیشتدا
دڵ، بە تۆ هەم ئاوەدانە و هەم وێران»

ئەی ئەوەی شەوقێکی ڕوخسارت هەموو جوانییەکانی عالەمی ماددەیە
زوڵفت لەبەرچــاوی کــافرو ڕوخسارت لەبەرچــاوی ئیمـاندار دیارە
نهێنیی ئیمان لە دەموچاوت دەردەکەوێت و کفر لە زوڵفت

«لـەعـلـی گیانبەخشت هــەم قــووتــە و هــەم یـاقــووت
خــــــاڵــی زوڵــفـــــت هــــەم داوە و هـــەم دانـــــە»

مـن هــەر ئــەودەمــە کـە تامی بـــادەی عیشقی تــۆم کـرد،
وەک «وامــیــق» ســەرخــۆش و شــەیـدا و ئـاڵـۆزکـاو بـووم
لە ڕێگەی عیشقی تــۆدا، هـەم «خـالـص»م و هـەم ڕاستگۆ

«لێی پرسیم و گوتی ئەی «قەسساب»! تۆ شێت بووی، یان عاشقی؟
ئـەی عاشق و شێت هەردووکیــان بـە قــوربانت بـن!»

## شرح مختصر زندگانی شاعر غزل

کورتەی ژیانی شاعیری غەزەلەکە

**قصاب کاشانی:**

سعید قصاب کاشانی[1] از شاعران اواسط سدهٔ دوازدهم هجری است. ایام زندگانی او مقارن با سقوط و انقراض سلسلهٔ صفویه، تاخت و تاز افغانان در ایران و بالاخره ظهور نادرشاه افشار بوده است.

سعید قصاب کاشانی چون شاعران معاصر خود پیرو سبک هندی است و از شاگردان مکتب صائب تبریزی بوده است. سعید قصاب کاشانی خطّ و سواد نداشته است. آنچه در تذکره‌ها بویژه تذکرهٔ حزین لاهیجی دربارهٔ وی آمده است: دیوان اشعارش بیست هزار بیت باشد، هرگز در قوافی و استعمال لفظ بموقع خود غلط نکردی و سلیقه‌اش با عدم بضاعت از عهدهٔ ربط کلام و روانی سخن برآمدی. در مراتب دیگر خود فوق موزونان صاحب سواد است و در آخر عمر ترک پیشهٔ قصابی کرده، ساکن مشهد مقدس شده، در کهنسالی وفات یافته در مشهد مقدس دفن شده است.

درتاریخ ادبیات ایران از شعرا و عارفان، بزرگانی باعنوان "قصاب" داشته‌ایم. ازجمله؛ ابوالعباس قصاب آملی از عارفان سدهٔ چهارم که شرح حالش در کشف‌المحجوب هجویری، تذکرهٔ الاولیاء عطار، نفحات‌الانس جامی آمده است. یغمای جندقی شاعر نامدار سدهٔ سیزدهم هجری، غزلیات و اشعاری با تخلص "قصاب" دارد که موسوم به قصابیه است و در کلیات آثارش به چاپ رسیده است. سوم امیربیگ قصاب اصفهانی از تلامذهٔ حکیم شفایی که معاصر شاه عباس دوم صفوی زندگی را بدرود گفته است. (رک تذکرهٔ نصرآبادی) چهارم قصاب گیلانی یا "مازندرانی" که تا سال ۱۲۵۰ هجری قمری حیات داشته است. (رک فهرست نسخهٔ مجلس شورا، ابن یوسف شیرازی) چنان می‌نماید که قصاب به معنی "قصب فروش" (نی فروش) علاوه بر «گوشت‌فروش» شغل تعدادی از بزرگان نامبرده بوده است.

---

۱ . در تاریخ ادبیات ایران دو شهر معروف به نام کاشان وجود دارد؛ یکی «کاشان» یا «کاسان» در شمال خراسان حدود فرغانه که مردم آن به زیبایی مشهورند و دوم کاشان در مرکز ایران جنب اصفهان که علما و شعرای بزرگی از آنجا برخاسته‌اند، ازجمله سعید قصاب کاشانی.

گویا قصاب کاشانی سفری به هند داشته. مؤلف تذکرۀ صبح گلشن، مجموعۀ دیوان قصاب را در کتابخانۀ احمد شاه پادشاه دهلی دیده است و تعداد ابیات آن را سه هزار و پانصد بیت می‌گوید. دیوان قصاب کاشانی به اهتمام محمد محمد لوی عباسی در تهران چاپ و منتشر شده است. غزلی که جناب شیخ عبدالرحمن طالبانی "خالص" تخمیس کرده‌اند در صفحۀ (۱۵۹) دیوان قصاب کاشانی این گونه آمده است:

| | |
|---|---|
| **ای نگــه با نظرت هم می و هم میخــانه** | **گردش چشــم تو هم ســاقیِ‌و هم پیمانه** |
| **هم مسلمان ز تو حــاجت طلبد هم کافر** | **طــاق ابروی تو هم مســجد و هــم بتخانه** |
| **نرگست با همه در آشتی و هم در جنگ** | **نگهــت با همه هــم محرم و هــم بیگــانه** |
| **لب شیرین تو هم قوت بود هم یــاقوت** | **خــــال گیرای تو هم دام بــود هم دانــه** |
| **گاه با وصل به سر می‌بـَرَد و گه با هجر** | **گـــاه آبـــاد بــود دل ز تـــو گــه ویرانه** |
| **تو گهی شمعیِ‌و گهی گل چه عجب باشد اگر** | **که دهــد دل به تو هم بلبــل و هم پروانه** |
| **گفت"قصاب" تو دیوانه شدی یا عاشق** | **ای بــه قربان تو هم عاشــق و هــم دیوانه** |

(رک دیوان قصاب کاشانی، ص ۱۵۹)

که برای مقابله با غزل تخمیس شده و تفاوت‌های آن دو عیناً نقل شد.

قەسابی کاشانی:

سەعیدی قەسابی کاشانی[1] لە شاعیرانی نێوەڕاستی سەدەی دەوازدەمی کوچییە، سەردەمی ژیانی ئەو هاوکاتە لەگەڵ بڕانەوە و ڕووخانی سەفەوییەکان و کێشە و پەلاماری ئەفغانەکان بۆ سەر ئیران تا دەرکەوتن و دەسەلاتی نادرشای ئەفشار "هەوشار".

سەعیدی قەسابی کاشانی هەر وەک شاعیرانی هاوچەرخی خۆی پەیڕەوی شێوازی هیندی بووە و لە قوتابیانی مەکتبی "سائیبی تەورێزی"یە. سەعیدی قەسسابی کاشانی خەت و سەوادی نەبووە. ئەوەی لە "ژیاننامەکان" تەزکەرەکاندا بە تایبەت تەزکەرەی حەزینی لاهیجی لەبارەی ئەو هاتووە، ئەوەیە کە دەنووسێ: دیوانی شیعرەکانی بیست هەزار بەیتە، هیچ کاتێ لە قەوافی و بەکاربردنی لەفز لە شوێنی خۆیدا هەڵەی نەکردووە و سەلیقەی لەگەڵ نەبوونی توانا، بۆ پێوەندیی کەلام و پاراویی شیعرەکانی سەرکەوتوو بووە و بەڕاستی لە مەراتبی دیکەدا لەسەرەوەی کەسانی زانا و ویژەوان بووە لە کۆتایی ژیانیدا پیشەی قەسسابی جێ هیشتوە و لە شاری مەشهەد نیشتەجێ بووە، لە تەمەنی پیریدا هەر لەو شارە کۆچی دوایی کردووە.

لە مێژووی ئەدەبیاتی ئیراندا شاعیران و عارفانێ، بە نازناوی «قەساب» بە ناوبانگن بۆ نموونە؛ "ئەبولعەبباسی قەسابی ئامولی"، لە عارفانی سەدەی چوارەم، بە سەرهاتی ژیانی لەسەرچاوەکان وەک (کەشفولمەحجووب، تەزکەرەتولئەولیای عەتتار، نەفەحاتولئونسی جامی و...)دا هاتووە. یەغمای جەندەقی شاعیری بە ناوبانگی سەدەی سێزدەمی کۆچی، غەزەلیات و ئەشعارێک بە نازناوی "قەساب" هەیە کە "قەسابیە"یان پێ دەڵێن و لە دیوانی شیعرەکانیاندا هاتووە، سێیەم کەس ئەمیر بەگی قەسابی ئیسفەهانییەلە شاگردانی "حەکیم شەفایی" کە لەسەردەمی شاعەباسی دووەم (سەفەوی)دا کوچی دوایی کردووە. (بڕوانە تەزکەرەی نەسرئابادی)

چوارەم؛ "قەسابی گێلانی" یان "مازەندەرانی" کە تا سالێ ١٢٥٠ ژیاوە. (بڕوانە پێڕستی نوسخەی مەجلسی شوورا؛ ئیبنی یوسفی شیرازی). وادیارە قەساب بە مانا

---

[1] . لە ئیران دوو شار بە ناوی کاشان هەیە، یەکێ لە باکووری خوراسان و نزیکی فەرغانە کە خەلکەکەی بە جوانیی ڕوخسار بەناوبانگن و ئەویتر کاشان لە ناوەندی ئێران لە لای ئیسفەهان کە عولە ما و شاعیرانی گەورەی هەبوون ویەکێ لە وان قەسابی کاشانیە.

"قەمیش فرۆش" جگە لە "گۆشتفرۆش" پیشەی برێ لەو کەسایەتییانەی ناوبراو بووە.

قەسابی کاشانی لەوەدەچێ سەفەرێکی هیندی کردبێ؛ نووسەری کتێبی "تەزکەرەی سوبحی رەوشەن"، کۆکراوەی دیوانی قەسابی کاشانی لە کتێبخانەی ئەحمەد شا، پادشای دهلی دیوە. ژمارەی دێڕە شیعرەکانی ئەو دیوانە سێ هەزار و پێنجسەد (٣٥٠٠) دێڕ بووە.

دیوانی قەسابی کاشانی بە تێکۆشانی "محەمەد محەمەدلوی عەباسی" لە تاران لە چاپ دراوە و بـڵاو کراوەتەوە...

ئەم غەزەلە کە حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی "خالص" تەخمیسی کردووە لە (لاپەڕەی ١٥٩) دیوانی قەسابی کاشانیدا بەو شێوەیە هاتووە، کە لە بەشە فارسییەکەدا لەسەرەوە هێناومە و مەبەستم بەراورد و لێکدانەوەیە بۆ تێگەییشتن لە جیاوازییەکانی ئەو دوو نوسخەیە و ئاماژەیە وەک بەڵگەیێکی باوەڕپێکراو بۆ لێکدانەوە لەسەر ئەو بڕیارە.

**شرح تخمیس غزل قصاب کاشانی سرودهٔ حضرت خالص**

شەرحی پێنجخشتەکیی غەزەلی قەسابی کاشانی هەڵبەستی حەزرەتی خالص

یاد: در اصطلاح اهل سلوک پیوند ارگانیسم وجود با مرشد و پیر استاد و گره‌زدن فکر و حس و عقل و عشق خود با او.

یاد: لە ئیستیلاحی ئەهلی سلووکدا پێوندی ئورگانیزمی وجوودە لەگەڵ مورشید و پیر و ئوستاد و گرێدانی فیکر و هەست و عەقڵ و عیشقیساڵیکە لەگەڵ ئەو ڕێبەرەدا.

کون و مکان:

کون؛ مصدر عربی است به معنی بودن و پدید آمدن و نیز به معنی هستی و عالم وجود. اما در اصطلاح عرفان کون تمام موجودات را گویند. (لمع، ص ٣٥٦) و کونِ جامع انسان کامل است که مظهر تمام‌نمای حق است.

شاه نعمت‌الله گوید:

**کونِ جامع مظهر ذات و صفات سایهٔ حق آفتاب کائنات**

مکان: منزلی است که ارفع منازل عندالله باشد و آن مکان اهل کمال است و موقعی که عبد به مرتبت کمال رسید، متمکن شود برای او مکانی و بالاخره کسی که عبور کند از مقامات و احوال، متمکن شود در مکان و صاحب مکان خواهد بود. (اصطلاحات شاه نعمت‌الله، ص ٣٠؛ لمع، ص ٣٣٥)

کەون و مەکان:

کەون؛ چاوگی عەرەبییە بە مانای بوون و پێکهاتن و هەم بە مانای هەستی و عالەمی وجوودە. بەڵام لە ئیستیلاحی عیرفانیدا کەون بە هەموو مەوجوودات دەڵێن. (لمع، ص ٣٥٦) و کەونی جامیع ئینسانی کامیلە کە نوێنەر(مەزهەر)ی هەموولایەنەی حەقە.

شانیعمەتوڵڵا دەڵێ:

کەونی جامیع مەزهەری زات و سیفات

سێبەری حەق ئافتابی کاینات

مەکان؛ مەنزڵێکە کە بەرزترین مەنزڵ لای خودایە و ئەوە مەکانی ئەهلی کەمالە، کاتێ کە عەبد بە مەرتەبەتی کەمال دەگا، جێگیر دەبێ لە مەکانێ، هەروەها کەسێ کە تێدەپەڕێ لە مەقامات و ئەحواڵ، دەبێ بە خاوەنی هێزوتوانا و دەسەڵات لە مەکاندا و ئەوەی پێدەدرێ و دەبێ بە ساحیبی مەکان.

میکده: محل مناجات بنده با حق را گویند به طریق محبت.
مەیکەدە: بەجێگەی موناجاتی بەندە لەگەڵ خودا دەڵێن بە ڕێگەی عیشق و مەحەببەت.

کاشانه: محل آسایش و آرامش جسم در جهان طبیعت.
کاشانە: جێگەی ئاسایش و هێمنیی جەستە لە جیهانی سروشتیدا.

مست: مستی فروگرفتن عشق است جمیع صفات درونی را و آن عبارت از سُکر است که عارفان کامل از بادهٔ هستی مطلق سرمست شده و محوالموهوم گشته از خود بیخود می‌شوند.
مەست: مەستی دەستگرتنی عیشقە بە سەر هەموو سیفاتی دەروونیدا، ئەوە عیبارەتە لە سوکر کە عارفانی کامیل لە بادەی هەستی موتڵەق سەرمەست ئەبن و بە ئیستیلاح مەحولمەوهووم ئەبن و لە خۆ بێخەبەر دەبن.
فرزانه: اهل عقل و عقلانیت
فەرزانە: ئەهلی عەقڵ و عەقـڵانیەت. ئەم وشەیە لەگەڵ «فرەزان» لە زمانی کوردیدا، یەکسانە و هەردووکیان لە زمانی پەهلەوییەوە وەرگیراون.

نگه: سیر باطنی مرید به سوی مرشد
نیگە واتە، نیگا: ڕۆیشتنی باتنیی مورید بەرەو مورشید.

نظر: توجه استادومرشدبه مرید
نەزەر: نواڕینی ئوستاد و مورشید بۆ مورید لە باتنەوە.

می: می غلبات عشق را گویند.
مەی: مەی بە سەرکەوتنی عیشق دەڵێن.

میخانه: باطن عارف کامل باشد که در آن شوق و ذوق و عوارف الهیه بسیار باشد و به معنی عالم لاهوت نیز آمده است. (کشاف، ص ١٥٦٣)
مەیخانە: باتنی عارفی کامیلە کە لەودا شەوق و زەوق و عەوارفی ئیلاهیە زۆر بێ و بە مانای عالەمی لاهووتیش هاتووە.(کشاف، ص ١٥٦٣)

ساغر: مراد از ساغر دل عارف است که آن را خمخانه و میخانه و میکده هم گویند و گفته شده که ساغر چیزی است که در وی مشاهدهٔ انوار غیبی شود و سکر و شوق را هم اراده کرده‌اند. (کشاف، ص ١٥٥٧؛ ریاض‌العارفین، ص ٤٠)
ساغەر: مراز لە ساغەر، دڵە کە خومخانە و مەیخانە و مەیکەدەیشی پێدەڵێن. وتراوە ساغەر ئەوەیە کە لە نێویدا ئەنواری غەیبی ببینرێت و لەم مانایە سوکر و شەوقیش کراوە. (کشاف، ص١٥٥٧؛ریاض‌العارفین، ص٤٠)
پیمانه: پیمانه، بادهٔ حقیقت را گویند و چیزی را گویند که در وی مشاهدهٔ انوار غیبی کنند و ادراک معانی نمایند که دل عارف باشد. (کشاف، ص ٥٥٤)
پەیمانە: پەیمانە، بە بادەی حەقیقی دەڵێن و بەوەی لە نێویدا ئەنواری غەیبی ببینرێت و دەرکی مەعانی بکرێ و ئەوەش دڵی عارفە. (کشاف،ص ٥٥٤)

ای که با دشمن و با دوست نوالت ظاهر...
اشاره به سخن سعدی که گوید:

**ای کریمی که از خزانهٔ غیب	گبر و ترسا وظیفه‌خور داری**
**دوستان را کجا کنی محروم	تو که با دشمنان نظر داری**

واتە، "ئەی ئەوەی وا بەخشینت بۆ دوژمن و دۆست ئاشکرایە..."
ئاماژەیە بۆ شیعرەکەی شێخی سەعدی کە دەڵێ:

”ئەی ئەو کەریمە کە لە خەزانەی غەیبەوە
گـــاور و تـــەرســا مووچـەخــۆرت هەیە
دۆستـــانی خـــۆت چون بێبەش دەکـەی
تۆ کە لەگـــەڵ دوژمنـــان لوتفـت هەیە.“

ای که بیرنگی عالم ز تو باشد پررنگ...

مقصود اضداد و طرح پارادوکس که پررنگی حق موجب نمایش عالم بیرنگ شده است، در حالی که حق رنگی ندارد و نور محض است و عالم پررنگ می‌باشد.

”... ئەی ئەوەی بێڕەنگیی عالەم لە تۆوە پڕڕەنگە...“

مەبەست دژەکان و پلانی پارادوکسیکاڵە کە پڕڕەنگیی حەق دەبێ بە هۆی نواندنی عالەمی بێڕەنگ، کەچی حەق بێڕەنگە و نووری مەحزە و جیهان پڕڕەنگە.

”جلوۀ روی تو داده است به خوبان مظهر...“

اقتباس هنر و جلوۀ حقانی در چهرۀ زیبا در مکتب عارفان، به صورتی که پیروان حُلمان دمشقی که به حلمانیه مشهور بودند، هر جا زیبارویی می‌دیدند سجده می‌کردند و این در عرفان بحثی گسترده دارد.

دەرکەوتنی ڕوخساری تۆیە جوانیی بە جوانان داوە...

وەرگرتنی هونەر و جیلوەی حەقانی لە ڕوخساری جوان لە مەکتەبی عیرفاندا، بەو شێوەیە کە شوێنکەوتووانی حولمانی دەمشقی، کە بە حولمانییە بەناوبانگن، لە هەر جێگایێ روومەتی جوانێکیان ببینیایە، سوجدەیان بۆ دەبرد و ئەم باسە لە عیرفاندا بەربـڵاوە.

عاشق روی تو هم حال شدم...

حال، مقصود جذبۀ عارفانه و درک شهود حق است و به زمان نیز ایهام دارد...

ئیستاش عاشقی جوانیی تۆم...

(حال) واتە جەزبەی عارفانە و بینینی شوهوودی حەق، و ئیهامی بە کات و زەمانیش هەیە.

ای فروغی ز رخت عالم حسن ناسوت...
عارف، جهان ناسوتی و مادی را یک فروغ از زیبایی‌های حق می‌داند.
ئەی ئەوەی کە شەوقێکی ڕوخسارت هەموو جوانییەکانی عالەمی ماددەیە...
عارف جیهانی ماددی بە یەک تیشکی درەوشاوە لە جوانییەکانی حەق دەزانێ.
من هماندم که شدم از می عشقت ذایق...
هماندم مراد زمان بی‌آغاز ازل است و من مقصود انسان است. از غلبات عشق ازلی چشیده است تا ابد هم ادامه خواهد داشت.
من هەر ئەودەمەی کە تامی بادەی عیشقی تۆم کرد...
ئەو دەمە مراز زەمانی بێسەرەتای ئەزەلە و من، مەبەست ئینسانە، کە عیشقی ئەزەلیی چەشتووە و تا ئەبەدیش بەردەوامە.

**(۱)**

## تخمیس غزل قاسم

ای جان! به جمالت دل و جان عاشق و رسواست
با شوق لبت در دو جهان واله و شیداست
وز عشق تو جانم همه دم طالب صهباست
«ای دوست! دلم را هوس بادهٔ حمراست
زان بادهٔ حمرا که در او[1] نور تجلی است»

ماییم ز سودای تو رسوای جهانیم
در میکدهٔ عشق، به جان باده کشانیم
مستان لقائیم و قلندر صفتانیم
«حیران و خرابیم و سر از پای ندانیم
این حیرت دهشت همه از شورش صهباست»

عشق است کز او عالم و آدم شده پیدا
عشق است دل مرده‌دلان را کند احیا
این جلوهٔ عشق است به هر جاست هویدا،
«خواهی لقب از خضر کن و خواه مسیحا،
عشق است به هر شیوه که او محیی موتی است»

تا کی به پس پردهٔ پندار نهانی؟
وز کثرت تفریق، ز غافل شدگانی
بالله ز خودی گر گذری دو ننمایی
«تا کی به لب جوی ز حیرت زدگانی
از جوی گذر کن که در آن سوی، تماشاست»

---

۱. درو

در مستی تو، عالم و آدم همه مستند
با یاد تو مستان همه از عار برستند
عشاق ز سودای تو زنار ببستند
«وز عشق جهانگیر تو، جان‌ها همه مستند
از عشق سلامت‌طلبی مایهٔ سَوداست»
ای حسن تو در کعبه و در بتکده مستور!
رندان خرابات ز عشقت همه مخمور
«خالص» ندهد لذت عشق تو به صد حور
«قاسم» ز سر کوی تو هرگز نشود دور،
چون نور رخت در همه جا ظاهر و پیداست»

## (١)
## تەخمیسی غەزەلی «قاسم»

ئەی گیان! سوێندم بە جەمالت کە دڵ و گیان عاشق و ناوزڕاون
بە شەوقی لێوی تۆوە لە هەردوو جیهاندا سەرلێشێواو و شەیدان
هەروەهـــا، لە عیشــقی تـۆدا دڵم خـوازیاری شـــەرابی ترێیە
«ئەی دۆســت! دڵم هەوەســی شــەرابی ســووری کــردووە
لــەو شــەرابە ســوورەکە نــووری دەرکــەوتــنی تێدایــە»
ئــەوە ئێمەیــن، کە لــە ســەودای تــۆدا نــاوزڕاوی جیهانین
لــە مەیخـانــەی عیشــقدا بەگیــان [ودڵ] بــادە دەنۆشــین
سەرخۆشــی دیداریــن و ســیفەتی قەلــە ندەرانمــان هەیــە
«حــەیــران و لــە کارکەوتوویــن و ســەر لــە پــێ ناناســینەوە
ئــەم سەرلێشــێواوی [و] ترســە هەمووی لە جۆشــی شــەرابەوەیە»
ئــەوە، عیشــقە کــە عالــەم و ئادەمــی لێــوە پەیــدا بــوون
عیشــقە، کــە دڵــی دڵمــــردووان زینــدوو دەکــاتــەوە
ئــەوە دەرکەوتــنی عیشــقە لــە هەمــوو لایــەک بەرچــاوە
«جا پێت خۆشە ناسناوی خدری پێ بدە، یان مەسیحای پێ بڵێ
عیشقە کە لە هەمــوو شێوازێکدا زیندووکــەرەوەی مردووانە»
تــا کــەی لــە پشــت پــەردەی خەیاڵاتــدا خــۆت شــاردۆتەوە؟ و
لەبــەر زۆریــی جیــــاوازی دانــان، لەگــەڵ غافــڵان کەوتــووی
سوێند بە خودا ئەگەر لە «خۆبوون» ی خۆت تێپەڕ بکەیت، دوویی نانوێنی،
«تاکەی لە لێواری جۆگە دانیشتووی و سەرلێشێواو دەمێنیەوە؟
لە جــۆگە بـپەڕەوە! ئــەوبەر جـۆگـەکـە سەیــرانگــەیە»
لەسەرخــۆشــیی تــــۆدا عالەم و ئادەم هـــەموو سەرخۆشـــن
بە یادی تۆوە هەموو سەرخۆشان لە عەیب و عار ڕزگاریان بووە
عاشــقان بـــەهۆی ســـەودای تۆوە زوننـــاریان بـــەســـتوە و
«لــە عیشــقی جیهــانگــری تــۆوە هـــەموو یــاران، سەرخـــۆشـــن
ســـەلامەتی خواســـتن لـــە عیشـــق دەبێتـــە هـــۆی شـــێتی»

ئەی ئـــەوەی جوانیی تۆ لەماڵی کەعبە و بتخانەدا شـــاراوەیە!
ڕینـــدانی خـــەرابات هـــەموو لە عیشقـــی تۆدا سەرخـــۆشن
«خـــالـص» عیشـــقی تۆ بـــە ســـەد حــــۆری نـــاگـۆڕێتەوە
«قـــاســـم» هەرگیـــز لەســـەرکۆڵانت دوورنـــاکەوێتـــەوە
لەبەر ئـــەوەی نووری ڕوخســـارت لە هەموو شـــوێنێک دیارە»

## شرح مختصر زندگانی شاعر غزل

کورتەی ژیانی شاعیری غەزەلەکە

**قاسم:**

معین‌الدین علی بن نصیر بن هارون بن ابوالقاسم حسینی قاسمی معروف به قاسم انوار از مشایخ اهل تصوف و از شاعران پارسی‌گوی نیمهٔ دوم قرن هشتم و نیمهٔ اول قرن نهم هجری بود. خاندانش از سادات حسینی تبریز و او خود از پیروان خاندان شیخ صفی‌الدین اردبیلی بوده و در مشرب تصوف مقامات بلند داشته است. معاصرانش در آثار خود از وی با احترام بسیار نام برده‌اند.

تخلص او در اشعارش "قاسمی" و "قاسم" است. گویا "قاسمی" نسبت اوست به جدش ابوالقاسم و قاسم شاید اختصاری باشد از لقب قاسم انوار که بنابر اشارهٔ مکرر در غالب مراجع صدرالدین موسی بن شیخ صفی‌الدین اردبیل بدو داد. [بنابراین قاسم از بزرگان سلسلهٔ "شَبَک" شمرده می‌شود]. دربارهٔ لقب قاسم انوار در طرائق آمده است: «... نظر به رؤیای صالحه‌ای که شیخ صدرالدین دیده بود که معین‌الدین علی تقسیم انوار می‌کند، او را قاسم انوار نام کرده». (طرائق‌الحقایق، حاج معصومعلی شاه، ج ۲، ص ١٤٤)

سید بعد از آن که مدتی در آذربایجان از پیشگاه بزرگان طریقهٔ صفویه کسب فیض نمود، هم در جوانی به گیلان رفت. آنجا که جایگاه جانشینان شیخ زاهد گیلانی بود. سپس به خراسان سفر کرد و مدت‌ها در هرات مستقر و صاحب خانقاه و تکیه و کوس و بیرق ارشاد در طریقهٔ صفویه بود تا اتفاقاً در سال ۸۳۰ هجری قمری واقعهٔ کاردخوردن شاهرخ تیموری به دست احمد لر پیش آمد و قاسم انواررا به همدستی با احمد لُر متهم کردند. بایسنغر میرزا حکم به اخراج وی داد. قاسم انوار به سمرقند رفت. این ماجرا را تواریخ عصر تیموری با احترام تمام در القاب و مقام قاسم انوار آورده‌اند. (رک؛ مطلع اسعدین، ج ۲، ص ٣١٦؛ حبیب السیر، ج ٤، ص ۱۱-۱۰)

در سمرقند با الغ بیگ ملاقات کرد و میرزا الغ بیگ حلقهٔ ارادت وی در گوش نمود. بعضی تبعید وی را از شدت ارادت اهالی و کثرت مریدان می‌دانند و ارتباط

وی را با حروفیگری رد می‌کنند. این تبعید در ۸۳۰ هجری قمری اتفاق افتاد، مدتی در سمرقند ساکن بود و سپس به خراسان بازگشت و در خرجردجام، در باغی که برایش خریده بودند، سکونت گزید و لنگری "خانقاهی" در آنجا ترتیب داد و همانجا بود تا درگذشت. تاریخ وفاتش را در مآخذ معتبر سال ۸۳۷ هجری قمری نوشته‌اند. در زمان مرگ هشتاد سال داشت و او را در باغی از خرجردجام که لنگر "خانقاه" او در آن قرار داشت و آخرین اقامتگاه او بود، دفن کردند.

**پیروان قاسم انوار:**

آنچه عبدالرحمن جامی که از بزرگان ذیصلاح دربارهٔ این امر است، آورده قابل توجه است. چون هم به زمان وی نزدیک بوده و هم با مریدان مستقیم او صحبت داشته، جامی گوید: دسته‌ای از مریدان که مردان عرصهٔ علم و عرفان و راه پیموده و جهاندیده بوده در صراط مستقیم بر اعتقاد راسخ شاخص بودند و گروهی که از ربقهٔ اسلام خارج و در دایرهٔ اباحت و تهاون به شرع و سنت داخل.

**آثار قاسم انوار**

مهم‌ترین بخش کلیات قاسم انوار غزلیات اوست که متضمن معانی عرفانی و بیشتر چاشنی‌گیر غزل‌های مولانا جلال‌الدین رومی است. غیر از آن مقطعات و ملمعات گیلکی و ترکی و رباعیات و چند مثنوی است که از آن میان «صد مقام» در بیان اصطلاحات صوفیه و مثنوی «انیس‌العارفین» در بحر رَمل مسدس مهم‌تر است. «رساله سؤال و جواب» و «رساله در بیان علم» او به نثر فارسی ساده تحریر شده است.

کلیات آثار او به همت شادروان استاد سعید نفیسی در تهران به سال ۱۳۳۷ هجری شمسی چاپ شده است. (تاریخ ادبیات ایران، د. ذبیح‌الله صفا، ج ٤، صص ٢٦٤ـ٢٥٢)

غزلی که جناب شیخ عبدالرحمن خالص، تخمیس فرمود در صفحهٔ /۳۱/ دیوان قاسم انوار این گونه آمده است:

**ای دوســت، دلــم را هوس بادۀ حمــراســت**
**زان بـــادۀ حمـــرا که درو نـــور تجــلاست**
**مستــان خـــرابیم، ســر از پـــای نــدانیم**
**این حیرت و دهشت همه از جودت صهباست**
**خواهــی لقب از خضــر کن و خواه مســیحا**
**عشق است به هر حال که او محیی موتاست**
**ای خواجــه، اگر معرفتی نیســت محالســت**
**گـــــر معرفتـــی هست، نصیب دل داناست**
**تـــــا کی به لــب جوی ز حیـــرت زدگانی؟**
**از جــوی گــذر کن که درین سوی تماشاست**
**از عشــق جهانگیر، که عــالم همه مســتند**
**گــر عشق و ســلامت طلبی مایۀ سَوْداست**
**"قــاســم" ز ســر کوی تو هــرگز نشود دور**
**چـــون نـــور تجلی ز جبین تــو هویداست**

(کلیــات قاسم انوار، با تصحیح و مقابله و مقدمۀ سعید نفیسی، ص ۳۱)

قاسمی ئەنوار:

موعینەدین عەلی کوڕی نەسیر کوڕی هاروون کوڕی ئەبولقاسم حوسێنی قاسمی بەناوبانگ بە «قاسمی ئەنوار» لە مەشایخی ئەهلی تەسەوف و لە شاعیرانی فارسیبێژی نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەم و نیوەی یەکەمی سەدەی نۆیەمی کۆچی بووە. بنەماڵەی ئەو لە ساداتی حوسێنی تەورێزە و ئەو خۆی لە شوێنکەوتووانی (شێخ سەفیەدینی هەردەوێڵی)ە لە مەشرەبی تەسەوفدا پێگەیێکی بەرزی هەبووە، هاوچەرخانی ئەو لە کتێبەکانیاندا بەو پەڕی ڕێزو ئیحتیرامەوە ناویان بردوە.

نازناوی ئەو لە شیعرەکانیدا «قاسمی» و «قاسم» ـە، وادەردەکەوێ «قاسمی» نیسبەتی ئەوە بە باپیرەیەوە و «قاسم» دەبێ کورتکراوەی ناوبانگی «قاسمی ئەنوار» بێ، کە بە پێی ئاماژەی یەک لەسەریەکی سەرچاوەکان، سەدرەدینمووسا کوڕی شێخ سەفیەدینی هەردەوێڵی بەوی داوە. [کەوابێ «قاسم» لە گەورە پیاوانی زنجیرەی

«شەبەک» ــە]، سەبارەت بە نازناوی «قاسمی ئەنوار» لە کتێبی (تەرائقولحەقایق) دا هاتووە:

«... لەسەر خەونێکی پاک و راست کە شێخ سەدرەدین دیبووی، کە موعینەدین عەلی خەریکی دابەش‌کردن، واتە تەقسیمی نوورە، نازناوی «قاسمی ئەنوار»، واتە «دابەش‌کەری نوورەکان»ی پێ دا...»، (طرائق الحقایق، حاج معصومعلی شاه، ج ۲، ص ١٤٤)

سەید لە دوای ئەوە، سەردەمێ لە ئازەربایجان لە حوزووری کەسایەتیە گەورەکانی تەریقەتی سەفەوییە بەهرەمەند بوو، لە لاوێتیدا رۆیشتە گێلان؛ ئەو مەڵبەندە، کە جێگای جێنشینانی شێخ زاهیدی گەیلانی بوو، دوای ئەوە سەفەری خوراسانی کرد و بۆ ماوەیێکی درێژ لە شاری هەرات نیشتەجێ بوو، و خانەقا و تەکیە و تەپڵ و بەیرەقی لە تەریقەتی سەفەویەدا دامەزراند. تا لە ساڵی (۸۳۰ ی هـ. ق) شارۆخی تەیمووری لە لایەن ئەحمەدی لوڕەوە ـ کە خەڵکی لوڕستان بوو ـ تیرۆرکرا و قاسمی ئەنوار بە هاوکاریی لەگەڵ ئەحمەدی لوڕ تۆمەتبارکرا. بایسونغور میرزا حوکمی دوورخرانەوەی قاسمی ئەنواری دەرکرد. قاسمی ئەنوار بۆ شاری سەمەرقەند دوورخرایەوە، ئەم بارودۆخە لەسەرچاوە مێژووییەکانی سەردەمی تەیموورییدا بە رێز و ئیحترامی زۆرەوە بەرانبەر بە قاسمی ئەنوار هاتووە. (بڕوانە مطلع‌السعدین، ج ۲، ص ۳۱٦؛ حبیب‌السیر، ج ٤، ص ۱۱-۱۰)

قاسمی ئەنوار لە شاری سەمەرقەند چاوی بە ئولوغ بەگ کەوت. ئەو شازادەیە پێشوازیی لێکرد و بوو بە موریدی، بڕێ لەسەرچاوەکان، دوور خستنەوەی ئەنوار لەبەر زۆریی موریدان و رێز و باوەڕی دانیشتووانی شاری هەرات دەزانن و پێوەندیی ئەو لەگەڵ بزووتنەوەی حورووفیە رەت دەکەنەوە، ئەم دوورخرانەوەیە لە /۸۳۰/ی کۆچی مانگیدا رووی‌دا. قاسمی ئەنوار لە دوای ماوەیێک گەڕایەوە بۆ خوراسان و لە «خەرەجردی جام» لە باخێکدا، کە بۆیان کڕیبوو، نیشتەجێ بوو و لەنگەر و خانەقای دامەزراند و هەر لە وێ کۆچی دوایی کرد. مێژووی کۆچی دوایی لەسەرچاوە باوەوڕپێکراوەکاندا ۸۳۷ی کۆچی مانگی نووسراوە، لەسەرە مەرگدا تەمەنی هەشتا ساڵ بووە و هەر لە باخەکەی خۆیدا لە (خەرەجردی جام) کە لەنگەر و خانەقا و دوایین جێگەی بوو، نێژرا.

شوێن کەوتووانی قاسمی ئەنوار:

ئەوەی عەبدوڕەحمانی جامی لە گەورەپیاوانی پسپۆڕ و خاوەن بیروڕا لەو بارەیەوە هێناویە جێی سەرنجە، چونکە هەم لەسەردەمی ئەنوارەوە نزیک بووە و هەم پێوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ موریدەکانی ئەودا هەبووە و وتووێژی لەگەڵ کردوون، جامی دەڵێ؛ بەشێ لە وانە پیاوانی ڕێگای عیلم و عیرفان و سالیک و جیهاندیدە، و لە ڕێگای ڕاست ناسراو و هەڵکەتوو بوون، بەڵام بەشێکیان لە بازنەی ئیسلام دوور و لە ئیباحەت و کەمتەرخەمی سەبارەت بە شەرع و سوننەت نزیک بوون!

نووسراوەکانی قاسمی ئەنوار:

گرنگترین بەشی دیوانی قاسمی ئەنوار غەزەلیاتی ئەوە، کە بە مەعنویات و عیرفان ئاوێتەیە و کاریگەریی غەزەلەکانی مەولانا جەلالەددینی رۆمی بەسەرەوە بووە، جگە لە (موقەتتەعات) و (مولەممەعات) بە گیلەکی و تورکی و چوارینەکان و چەند مەسنەوییە، لە وانە ریسالەی «سەدمەقام» لە دەربڕینی ئیستیلاحاتی سۆفیە و مەسنەوی ئەنیسولعارفین لە بەحری رەمەلی موسەددەسدا گرنگ و پڕبایەخە، ریسالەی سوئال و جەواب، «ریسالەیەک لە دەربڕینی عیلم»دا کە بە پەخشانی فارسی نووسیویە.

دیوانی قاسمی ئەنوار بەهەوڵی ئوستاد سەعیدی نەفیسی لەساڵی ١٣٣٧ی کۆچی مانگی لە تاران چاپکراوە و بڵاوبووەتەوە.(تاریخ ادبیات ایران، د. ذبیح الله صفا، ج ٤، صص ٢٦٤_ ٢٥٢)

ئەم غەزەلە کە حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمانی "خالص" تەخمیسی کردووە، لە لاپەڕەی (٣١) سی‌ویەکی دیوانەکەی قاسمی ئەنواردا بەو شێوەیە کە لە بەشی فارسی‌دا هێناومە، هاتووە:

**شرح تخمیس غزل قاسم انوار سرودهٔ حضرت خالص:**
شەرحی پێنجخشتەکیی غەزلی قاسمی ئەنوار هەڵبەستی حەزرەتی خالص

ای جان، به جمالت دل و جان عاشق و رسواست...
لب: کلام را گویند و اشاره به نَفَس رحمانی که افاضهٔ وجود می‌کند بر اعیان. این بند با آرزوی استمرار ذکر و پیوند روحی رهرو با مبدأ کُل آغاز و در جستجوی نور تجلی در دل است که بادهٔ حمرا باشد.
ئەی گیان! سوێندم بە جەمالت کە دڵ و گیان عاشق و ناوزڕاون...
لەب؛ بە کەلام و وتە دەڵێن و ئاماژەیە بەنەفەسی ڕەحمانی کە ئیفازەی وجوود دەکات بۆ جیهانی ماددی. ئەم بەندە بە هیوای بەردەوامیی زیکر و پێوەندی رۆحیی سالیک سەرەتا لەگەڵ مەبدەئی کولل دەست پێدەکا و بەشوێن پشکنینی نووری تەجەللی لە دڵدایە کە بادەی حەمرایە.

ماییم ز سودای تو رسوای جهانیم...
میکده: رک شرح‌های پیشین، مست: رک شرح‌های پیشین
قلندر: مراد از قلندری تجرید از کونین است و تفرید از دارین. در ریاض‌العارفین است که: قلندر کنایت از صاحب مقام اطلاق است حتی از قیود اطلاقیه.
و فرق میان قلندر و ملامتی و صوفی آن که قلندر تفرید و تجرید به کمال دارد و در تخریب عادات کوشد و ملامتی در کتم عبادات کوشد و صوفی دل او اصلا به خلق مشغول نشود. (ریاض‌العارفین، ص ٤١)
حیران: رک شرح‌های پیشین ، حیرت: رک ← حیران
ئەوە ئێمەین کە لە سەودای تۆدا ناوزڕاوی جیهانین...
مەیکەدە: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو ، مەست: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو
قەلەندەر: مراز لە قەلەندەر تەجریدە لە کەونەین و تەفرید لە دارەین لە کتێبی ریازولعارفیندا هاتووە: قەلەندەر کینایە لە ساحیبی مەقامی ئیتلاقە تەنانەت لە قیوودی ئیتلاقیە
جیاوازیی نێوان قەلەندەر و مەلامەتی و سۆفی ئەوەیە، کە قەلەندەر تەفرید و

تەجریدی بە کەمال هەیە و لە ڕووخاندنی عاداتدا تێدەکۆشێ و مەلامەتی لە کیتمان و پۆشاندنی عیبادەتدا تێدەکۆشێ و سۆفی دڵی بە هیچ شێوەیەک لە خەڵک نزیک نییە. (ریاض‌العارفین،ص٤١)

شور، یا شورش حالت خاص را گویند که به عارف سالک دست می‌دهد به واسطهٔ شنیدن کلام حق و سخنان عبرت‌آمیز یا در حال رقص.

شۆڕ، یان شۆڕش بە حاڵەتێکی تایبەت دەڵێن کە تووشی عارفی سالیک دەبێ بە هۆی بیستنی کەلامی حەق و وتاری عیبرەت ئامێزەوە، یان لە حاڵی هەڵپەڕیندا.

عشق است کزو عالم و آدم شده پیدا...

سعدی فرماید؛ هرگز نمیرد آن که دلش زنده شد به عشق...

و به واقع این بند از مخمس هم حاصل این سخن است، بویژه در دو مصرع قاسم انوار و جناب خالص در تکمیل این بیت عشق را هم منشأ اصلی آفرینش عالم و آدم می‌داند و جهان را جلوهٔ عشق می‌داند. در اندیشهٔ عارفان، عقل و علم هم ثمرهٔ عشق است، زیرا عقل و علم نتیجهٔ ظهور انبیاء است در حالی که انبیاء هیچ کدام عالم به معنی دینی آن نبوده‌اند. همچنین یاران آنها و گرایش به انبیاء بر پایهٔ عشق بوده است و انبیاء همه عاشق بوده‌اند تا عالم...

ئەوە، عیشقە کە عالەم و ئادەمی لێوە پەیدا بوون...

شێخی سەعدی دەفەرمووێ، هەرگیز نامرێ ئەوەی وا دڵی بە عیشق زیندووە،

لە ڕاستیدا ئەم بەشە لە پێنجخشتەکییەکە بەرهەمی ئەم شیعرەیە بە تایبەت دوو دێڕەکەی قاسمی ئەنوار و حەزرەتی خالص تەواوکەری مانای شیعرەکەن و عیشق بە بنەمای ڕاستەقینەی ئەفراندنی عالەم و ئادەم دەزانن و جیهان بە جیلوەی عیشق دادەنێن. لە بیروڕای عارفاندا، عەقڵ و عیلم سەمەر و بەرهەمی عیشقن ، چونکە عیلم و عەقڵ دەرەنجام و بەرهەمی هاتنی پێغەمبەرانن لە کاتێکدا هیچ‌کام لە ئەنبیاء عالم بە مانا دینیەکەی نەبوون، هەروەها هیچ‌کام لە یاران و هاوڕێکانیان عیلمیان نەبووە، پێوەندیی هیچ ئوممەتێ بە پێغەمبەرانەوە بە بۆنەی عیلمەوە نەبووە، بەڵکو بەهۆی عیشقەوە پێوەندیان کردووە، عیشق بە خوداوەند، عیشق بە راستی و

دروستی و پێغەمبەران هەموو عاشق بوون نەک عالم و...

تا کی به پسِ پردۀ پندار نهانی...

حافظ فرماید: تو خود حجاب خودی حافظ، از میان برخیز!

جناب قاسم انوار عبور از خود را سفارش می‌کند و جناب شیخ عبدالرحمن خالص دراندن پردۀ پندار و گذشتن از کثرت تفریق جدایی‌انداز را که انسان با خدای خود یکی می‌شود و به کمال می‌رسد.

تا کەی لە پشت پەردەی خەیالاتدا خۆت شاردۆتەوە؟...

حافز دەفەرمووێ؛ ئەی حافز، تۆ خۆت پەردەی، لە م بەینە هەڵسە و لاچۆ!

راسپاردەی حەزرەتی قاسمی ئەنوار پەڕینەوە لە خۆیە و حەزرەتی خالص دڕاندنی پەردەی خەیاڵ و بەزاندنی سنووری کەسرەت و تەفرەقەی جیایی پێکهینەر و ئەوە بە ئەستۆی ئینسانی سالیک دادەنێ، تا ئینسان لەگەڵ خودای خۆی یەک بگرێ و ڕێگەی کەمال بپێوێ.

در مستی تو عالم و آدم همه مستند...

مست: رک شرح‌های پیشین، عشاق: رک ← عشق، شرح‌های پیشین، زنار: رک شرح‌های پیشین

در سیر و سلوک عارفان رنج و درد را مایۀ وصول می‌دانند، زیرا سلامت‌طلبی شیوۀ اهل عشق نیست، همان طور که هیچ پیامبری جز استثناء و حکمت الهی، در سلامت نبود و عاشق چون مست شد تمام جهان با او هماهنگ می‌شوند.

لەسەر خۆشیی تۆدا عالەم و ئادەم هەموو سەرخۆشن...

مەست: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو، عوششاق: بڕوانە عیشق لە شەرحەکانی پێشوو، زونار: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو.

لە سەیر و سولووکدا عارفان ڕەنج و دەرد بە بنەمای گەیشتن بە ئاسایش و ویسالی حەق دەزانن، چونکە سەلامەتخوازی شێوەی ئەهلی عیشق نییە، هەروها کە هیچ‌کام لە پێغەمبەران مەگەر بە دەگمەن و حیکمەتی ئیلاهی، دەنا لە سەلامەتدا نەبووون، عاشق کاتێ کە مەست بوو هەموو جیهان لەگەڵی ئەو هاوئاهەنگ دەبن.

ای عشق تو در کعبه و در بتکده مستور...

عارفان تمام مکان‌های مقدس مذهبی را از هر دین و آیین و مکتب و مسلک محترم می‌دارند و با عبور از ظواهر امر و امور سختگیری تعبُد، خدارا می‌خواهند و می‌جویند و به سخن شیخ شبستری:

اگـــر مـــؤمن بـدانستی که بت چیست

یقین کردی که دین در بُت‌پرستی است

کعبه و بتکده و خرابات در نزد عارف یکی است و فرمودهٔ سعدی: به جهان خرّم از آنم که جهان خرّم از اوست.

ئەی ئەوەی کە جوانیی تۆ لە ماڵی کەعبە و بتخانەدا شاراوەیە!...

عارفان ڕێزیان بۆ هەموو جێگا پیرۆزەکانی هەر دین و ئایین و ئاییـنـزا و مەکتەب و مەسلەکێک هەیە و بە پەڕینەوە لە زەواهیر و سەختگیری و تەعەبودی کوێرانە، تەنیا خوداوەندیان دەوێ و بۆ ڕەزایەت و ویسالی ئەو دەگەڕێن. بە قەولی شێخی شەبستەری؛

ئـــەگـــەر ئیماندار دەیزانی کـــە بـــوت چیە

یەقینی دەکرد کە دین لە بوت پەرستی دایە

کەعبە و بتکەدە و خەرابات و... لە لای عارف هیچ جیاوازییان تێدا نییە. خودا لە هەمو جێگەیێک هەیە، فَاَینما تُوَلـُوا فَثَمَ وَجْهَ اللهِ (۲/۱۱۵) شێخی سەعدی دەڵێ؛ بەوە لە جیهاندا سەرخۆشم کە جیهان لە خوداوەندەوە خوڕڕەم و خۆشە.

(۱)

## تخمیس غزل کمال

ای کـه بـا روی چـو مـه، روشـنی آفـاقی!
قبلـۀ عـالمـی و پـادشـه عشـاقی
تـو کـه از وصـف برونـی و به خوبـی تاقی
«سـال‌هـا گـر بنویسـم صفت مشـتاقی
مانـد از شـوق دوصدسـاله حکایـت باقی»
بـر جفـا و سـتم یـار، دلا صابـر باش!
بـه هدف بـودن تیـر مـژه‌اش شـاکر باش
مکـن اندیشـه ز ابـروش، بیـا ناظـر بـاش
«غایب است ابرویش از دیده، دلا حاضر باش
نشکند شیشه‌ات ایـن بار چو دور از طاقی»
ای که چشـمت به نگـاهی دل عالم فکند،
غمزۀ صف شـکنت بس صف جان‌ها شکند
نـاوکت جـز ره عشـاق به تیـری نزند
«غمـزه‌ات هیـچ فرودسـت ز تیـری نکند
تـا بـه آن زخم تـو در ره زدن عشـاقی»
ای خوش آن دم که نشینند به هم باده‌کشان
سـاقی و بادۀ باقـی[1] ز در آیـد به میـان
باقی بـادۀ بـاقی دهـدم از مستـان
«ای خوش آن مجلس خالی شده از مجلسیان
مانده از می قدری بـاقی و بـاقی سـاقی»
عـاشق حسن تـو ای پـادشه حـورسرشت!
حاصل هر دو جهان نیست به چشمش یک خشت
بـی‌تـو، جنـت همه آتش بـود و کعبه، کنشـت
«به دو چشـم تو اگر بی‌تو برندم به بهشت،
نکنم میـل به غلمـان و نظـر بر سـاقی»

---

۱ . ساقی با بادۀ باقی

کیست زخم مژه‌ات خورد و به آن[1] سالم زیست
آنکه از فتنـۀ چشمت نشود مفتـون، کیست؟
وضع آن نقطه بر آن کنج دهن دانـی چیست؟
«خال، بر گوشۀ ابرو ز تو بی‌مکری نیست
نبـود گـوشه‌نشین بی‌حیـل و زراقی»
ای ز خوبان جهان برتری از حُسن و جمـال
نقش خطت نه به خط ماند وخالت نه به خال
«خالص» از عشق ندارد به جز آن خال خیال
«همه نقش و خط و خال است به دیوان «کمال»
لیس الا رقـم العشق عـلی اوراقـی»

---

۱ . خورد به آن

## (١)
## تەخمیسی غەزەلی (کەمال)[1]

ئـەی ئەوەی وا بـە ڕوخسـاری وەک مانگـەوە، ڕووناکایـی ئافاقی!
قیبـلـەی عالـەم و شـای عـاشـقانی
تـۆ، کـە لـە وەسـف بـەدەری و لـە جوانیـدا تاقانـەی،
«ئەگەر سالانی ساڵ سیفەتی شەوق و زەوقـمت بۆ بنووسم
هێشتا بەشی دووسەد ساڵ حیکایەتی شەوقم هەر دەمێنێت»
ئـەی دڵ! لەبەرانبـەر زوڵـم و جـەفـای یـارا خۆڕاگـر بـە!
شـوکرانە بژێـری ئەوە بـە کە تـیری برژانگی لـە ئامانـج دەدرێت
بیـــر لـە بـــرۆی ئـــەو مـەکـــەوە، وەرە و بـڕوانـە
«ئەی دڵ! ئەبرۆی لەبەر چـاو ونە، تـۆش ئامادە بە
شووشەت لێ ناشکێت، چونکە لە تاق[ی برۆی] دووری»
ئـەی ئـەوەی وا چـاوت بـە نیگایـەک دڵـی عالـەم بەردەداتەوە!
خەمـزەی سـەف شـکێنت زۆرجـار سـەفی گیانـان دەشـکێنێ
برژانگـت بـە تـیر، سـەرە ڕێـگا بـە عاشـقان نەبـێ، نـاگرێـت
«خـەمزەکەت لە تیژی و بەبڕشتی هیچی کەم نییە
تا تۆ سەرەڕێ بە عاشقان دەگری و برینداریان دەکەیت»
چەنـد خۆشـە ئـەو کاتە کـە مەینۆشـان پێکەوە دابنیشـن
سـاقیش بـە پاشمـاوەی بـادەوە لـە دەرگا وەژوور کەوێت
بەرمـاوی بـادەی بەجێمـاوی مـەسـتانم پـێ بـدات
«چەندە خۆشە ئەو مەجلیسەی دانیشتووانی تێدا نەمابن،
هـەندێک مـەی مـابێتەوە و ساقیش نـەڕۆیشتبێـت»

[1] . لە دەقە چاپییەکەدا ئاماژە بە ناوی شاعیر نەکراوە، بەڵام من بە گوێرەی وشەی «کەماڵی لە کۆتایی شیعرەکە چوومە سۆراغی دیوانی کەماڵی خوجەندی، کە مرۆڤێکی عارف بووە (لە کۆتاییەکانی سەدەی هەشتەمی کۆچیدا لە تەوریز مردووە).

ئەی شای بە سروشت وەک حـۆری! ئاکامی هەردوو جیهـــان
لەبەرچـــاوی عاشـــقی ڕووی تۆ، کەمتر لە [نرخی] تاقە خشـــتێکە
بەبێ تۆ، بەهەشت بە تەواوەتی ئاگرە و کـــەعبەش کەنیسەیـە

«سوێندم بە چاوەکانت ئەگەر بێ تۆ بمبەنە بەهەشت،
مەیلی غیلمـــــانم نابێت و چـــاویش لە ساقی ناکەم»

کێیە ئەو کەسەی برژانگت برینداری کردبێت و بە سەلامەتی ژیابێت؟
کێیـــە فیتنـــەی چـاوەکانـــت ســـەری لـــێ نەشـــێواندبێت؟
ئایـــا دەزانی ئــەو خاڵــە لــە پەنــای دەم بۆچـــی دانـــراوە؟

«خـــاڵی گۆشەی برۆت بەبێ فێڵ دانـەنراوە
هیچ گۆشەنشینێک بێ فێڵ و فەرەج نییە!"

ئەی ئەوەی لە چاکی و جوانیدا لە هەموو خاسانی جیهان بەرزتری!
نـــە نـــەقشی خـــەتت لە خـــەت دەچێت و نە خـــاڵت لە خـــاڵ
«خالص» لە عیشقدا جگـە لەو خـــاڵە، خـــەیاڵێکی دیکەی نییە

«لە دیوانی «کەمال» دا، هەموو هەر نەقشی خەت و خاڵە
لە ئەوراقی منـدا جگە لە نووسراوەی عیشق چی‌تر نییە»[1]

١ . لیس الا رقم العشق علی اوراقی

## شرح مختصر زندگانی شاعر غزل

کورتەی ژیانی شاعیری غەزەلەکە

**(کمال خجندی):**

شیخ کمال‌الدین مسعود خجندی معروف به «شیخ کمال»، از مشاهیر عارفان و شعرای قرن هشتم هجری است. ولادت او در اوایل قرن هشتم در خُجند ماوراءالنهر اتفاق افتاد. در جوانی به حج رفت. به هنگام بازگشت در تبریز رحل اقامت افکند و در ظل حمایت سلطان حسین جلایر قرار گرفت و به فرمان او باغ و خانقاهی در «ولیانکوه» تبریز برایش ترتیب یافت که در آن سکونت گُزید و چون در تصوّف کامل عیار و در ارشاد نافذالکلمه و در زهد و تقوی مشارٌبالبنان و در شعر و ادب استاد بود، بزودی مورد اقبال خلق قرار گرفت و پیروان بسیار و مریدان وفادار از خواص و عوام حاصل کرد و به تبریز دل بست و به باغ و خانقاهی که سلطان جلایر برای او ساخته بود، تعلق خاطر یافت و پس از نشیب و فراز فراوان در اوضاع سیاسی و اجتماعی قرن هشتم و سفری اجباری به "سرای" پایتخت قبچاق به تبریز بازگشت و در همان باغ ولیانکوه بدرود حیات گفت.

مأخذ معتبر مانند نفحات‌الانس جامی و حبیب‌السیر و به پیروی از آنها در بعض مآخذ مانند طرائق‌الحقایق و ریاض‌العارفین، سال وفاتش را ۸۰۳ هجری قمری نوشته‌اند.

گویند بعد از مرگ به جستجوی ماتَرَکَش پرداختند و جز بوریایی که بر آن خفته و خشتی که بر بالین نهاده بود، چیزی نیافتند.

بعضی عارفان که به صحبت شیخ کمال و حافظ هر دو رسیده بودند، چنین فرموده‌اند که: «صحبت شیخ به از شعر وی و شعر حافظ به از صحبت او.»

اشعار اصلی او غزل‌های وی است که دیوان مفصلی را همراه چند رباعی و قطعه در حدود هشت هزار بیت تشکیل می‌دهد. (تاریخ ادبیات ایران، د. ذبیح‌الله صفا، ج ۲، صص۱۱۳۱ـ۳۷)

متن انتقادی دیوان کمال‌الدین مسعود خجندی به اهتمام؛ ک. شیدفر در آکادمی علوم اتحاد شوروی، انستیتوی خاورشناسی، ادارهٔ انتشارات دانش، شعبهٔ

ادبیات خاور در مسکو به سال ۱۹۷۵ در سه مجلد به چاپ رسیده است.

غزلی را که جناب شیخ عبدالرحمن خالص تخمیس کرده‌اند، در مجلد سوم (۲ـ۲) صفحهٔ ۹٤۰ این گونه درج شده است:

**سـال‌ها گـر بنویسـم صفـت مشـتاقی**
**مـــانَدْ از شـوق تو صد سـاله حکایت باقی**
**غایب است ابرویش از دیده، دلا حاضر باش**
**ترسمت بشــکنی از شیشه که دور از طاقی**
**غمـــزه‌ات هیچ فـــرو داشت ز تیــزی نکند**
**تـــا به آن زخمه تـــو در ره زدن عشـاقی**
**ای خوش آن مجلس خالی شــده از مدعیان**
**مـــانـده از مَی قَدَری باقی و آن لب سـاقی**
**عمر باقی بجز این نیســت که درخلوت اُنس**
**دســت در گـــردن یـــار افکنی و البـــاقی**
**خـــال در گوشـهٔ ابرو ز تو بی‌مکری نیست**
**نبـــود گـــوشه‌نشین بـــی‌حِیَل زِراقـــی**
**همه نقش خط و خالســت به دیوان کمـــال**
**لیس الا رقـــم العشــق علـــی اوراقـــی**

جای دقت است که جناب شیخ عبدالرحمن خالص به دایره‌ای از شاعران عارف و عارفان شاعر قرن هشتم توجه نشان داده است که پیوستگی فکری و ادبی ویژه و قابل تأمل با هم داشته‌اند. از جمله قاسم انوار و کمال خجندی که خرقهٔ تبرک از شیخ سیسی گرفته‌اند و بدین واسطه به سهروردی می‌پیوندند و شیخ اسماعیل سیسی سمنانی مرشد و استاد بلاواسطهٔ شمس مغربی بوده، همان طور که دیدیم "خالص"غزلی از شمس مغربی را نیز تخمیس کرده است و دیگر خواجه حافظ که در عرش شعر فارسی و معاصر شاعران یاد شده بوده است.

کەمالی خوجەندی:

شێخ کەمالەددین مەسعوودی خوجەندی بەناوبانگ بە «شێخ کەمال»، لە مەشاهیری عارفان و شاعیرانی سەدەی هەشتەمی کۆچییە. لەسەرەتای سەدەی هەشتەمدا لە شاری خوجەندی ماوەرائولنەهر لە دایک بووە، لە لاوەتیدا سەفەری حەجی کردووە، کاتی گەڕانەوەی حەج لە شاری تەورێز ماوەتەوە، هەر لە وێ نیشتەجێ بووە و لە ژێرحیمایە و چاودێری سوڵتان حوسێنی جەلایردا ژیانی بە سەر بردوە و بە فەرمانی ئەو دەسەڵاتە، باخ و خانەقایەک لە «وەلیانکوهـ »ی تەورێز بۆ ئەو دروستکراو لەوێدا نیشتەجێ بوو. چون لە تەسەووفدا کامیل عەیار و لە ئیرشاددا نافیزولکەلیمە و لە زوهد و تەقوادا ناودار و لە شیعر و ئەدەبدا ئوستاد بوو، بە زوویی خەڵک ڕوویان تێ کرد و شوێن کەوتووانی زۆر و موریدانی وەفاداری لە خاس و عام بە دەست هێنا، عەلاقەی بە تەورێز پەیدا کرد و بەو باخ و خانەقایە کە سولتان جەلایر بۆ ئەوی دروستکردبوو، وابەستە بوو و لە دوای هەوراز و نشێوێکی زۆر لە بارودۆخی ڕامیاری و کۆمەڵایەتیی سەدەی هەشتەم و کۆچێکی نەخوازراو بۆ "سەرای" پاتەختی قەبچاق، گەڕایەوە بۆ تەورێز و لە هەمان باخ و خانەقای (وەلیانکوهـ) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان، وەک نەفەحاتولئونسی جامی و حەبیبولسیەر و بە پەیڕەوی لە مانە بڕێ سەرچاوەی دیکە وەک تەرائقولحەقایق و ریازولعارفین، ساڵی کۆچی دوایی کەمالی خوجەندی (٨٣٠ ک. م) هەشتسەدوسی کۆچی مانگی نووسراوە، دەڵێن؛ لە دوای مردنی بۆ میراتەکانی گەڕان، جگە لە حەسیرێ، کە لەسەری دەخەوت و خشتێ، کە لە ژێر سەری دەنا، چی تریان نەدۆزیەوە.

بڕێ لە عارفان، کە بە سوحبەت و دیداری شێخ کەمال و حافزی شیرازی هەر دوو گەیشتبوون، فەرموویانە، کە «سوحبەتی شێخ لە شیعری چاکتر و شیعری حافز لە سوحبەتی چاکتر بوو».

شیعرە ئەسڵیەکانی ئەو غەزەلەکانینی کە دیوانێکی چڕوپڕ و هاوڕێ لەگەڵ چەند چوارینە و قیتعەن. نزیکەی هەشت هەزار دێڕ شیعری لێ بەجێ ماوە، (تاریخ ادبیات ایران، د. ذبیح‌الله صفا، ج ٢، صص ٣٧ـ١١٣١).

دەقی بەرئاوردکراوی دیوانی کەمالەدین مەسعوود خوجەندی بە تێکۆشانی

ک. شیدفر له ئاکادیمیای عولوومی یەکیەتیی سۆڤیەت، ئەنستیتوی رۆژهەلاتناسی، ئیدارەی ئینتشاراتی دانش، لقی ئەدەبیاتی رۆژهەلات له مۆسکو، سالّی ۱۹۷۵ی زایینی له سێ بەرگدا له چاپ دراوه و بـلاو کراوەتەوه.

ئەو غەزەلەی کەمالی خوجەندی که حەزرەتی خالص تەخمیسی کردووه، له بەرگی سێیەمی (۲.۲) دیوانەکەی، لاپەره۹٤۰ دا بەو شێوەیه که له بەشه فارسیەکەدا هێناومه، هاتووه.

جێی تێڕوانینه، که حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمان "خالص" پێوەندیی فیکری و ئەدەبی به بازنەیەک له شاعیرانی عارف و عارفانی شاعیری سەدەی هەشتەمەوه هەبووه، که نیسبەتی بیرو بۆچوون و هاوڕێیی تەریقەتی تایبەتیان پێکەوه بووه. بۆ نموونه قاسمی ئەنوار و کەمالی خوجەندی خەرقەی تەبەڕوک له شێخی سیسی وەردەگرن و بەم هۆیەوه به شێخی سوهرەوەردی دەگەن و شێخ ئیسماعیلی سیسی سمنانی مورشید و ئوستادی ڕاستەوخۆی شەمسی مەغریبی بووه. هەروەها که بینیمان، خالص، غەزەلی شەمسی مەغریبی تەخمیس کردووه و ئەویتر خواجه حافز که له عەرشی شیعری فارسیدا خوداوەنده و هاوچەرخی شاعیرانی ناوبراوه، دوو غەزەلی له لایەن خالصەوه کراون به پێنجخشتەکی.

## شرح تخمیس غزل کمال خجندی سرودهٔ حضرت خالص

شەرحی پێنجخشتەکیی غەزلی کەمالی خوجەندی هەڵبەستی حەزرەتی خالص

ای که با روی چو مه روشنی آفاقی...

انسان سالک زمان را طی می‌کند و زمان برای وی گم می‌شود. جسم در طی زمان فرسوده می‌شود و روح زمان را می‌پیماید و از دایرهٔ زمان خارج می‌شود و همچنان إلی‌الابد در گردش روحانی است و مقصود این بند این است.

ئەی ئەوەی وا بە ڕوخساری وەک مانگەوە، ڕووناکایی ئافاقی...

مەبەستی ئەم بە شەی پێنجخشتەکیەکە ئەوەیە کە ئینسانی سالیک زەمان تێدەپەڕێنێ و زەمانی لێ ون دەبێ، لەش بە درێژایی زەمان دەڕووخێ و ڕۆح زەمان درێژە پێ دەدا و لە بازنەی زەمان دەرواتە دەر، هەروەها تا ئەبەد و زەمانی بێ‌کۆتایی لە گەڕانی ڕۆحانی‌دایە.

بر جفا و ستم یار دلا صابر باش...

صبر موجب گشایش است و صبر دستور قرآن و از صفات سلوک است.

ابرو: تعبیر از صفات است که حاجب ذات است و عالم وجود از آن جمال می‌گیرد.

مژه: موی پلک چشم را گویند و در اصطلاح صوفیان حجاب سالک است. (کشاف، ص**١٥٦٢**) مژه در دایرهٔ ولایت به قصور در کردار و کوتاهی اعمال اشاره دارد.

شکر و شاکر از صفات سالک است. ناظر نتیجهٔ صبر و شکر است.

چون ابرو = حجاب، غایب شود، حضور میسر می‌گردد.

به نظر من در مصرع پنجم بند دوم نسخهٔ دیوان کمال صحیح باشد که "دور از طاقی" یعنی به مقصد نرسیده‌ای.

طاق: زائده‌ای بر دیوار که لوازم را بر روی آن می‌گذارند. "دور از ساقی" اشتباه است.

ئەی دڵ! لە بەرانبەر زوڵم و جەفای یاردا خۆڕاگر بە!...

خۆڕاگری دەبێ بەهۆی کرانەوی بەند و بەسراوەکانی ژیان، خۆڕاگری فەرمانی قورئانی پیرۆزە و لە سیفاتی سلووکە.

برۆ، ئەبرۆ: شرۆڤەیە لە سیفاتێ کە پەردەی زاتە و عالەمی وجوود لەو زاتە جوانی

وەردەگرێ.

موژە: ئەو مووە کە لەسەر پێڵووی چاوە، لە ئیستیلاحی سۆفیاندا پەردەی بەر چاوی سالیکە. (کشاف،ص ١٥٦٢) موژە لە بازنەی وەلایەتدا ئاماژەیە بە کوتایی لە کردار و کردەوەدا

شوکر و شاکر واتە سپاس و سپاسداری لە سیفاتی سالیکە.

نازیر واتە بینەری باتنی ئەم پێگەیە بەرهەمی خۆراگری و سپاسە، چونکە ئەبرۆ؛ پەردەیە و کەون دەبێ، حوزوور دێتەئارا.

ئەو کاتەی ئەبرۆ واتە حیجاب ون بوو، حوزوور پێک دێ

بە بیرورِای من لە میسرەعی پێنجەمی بەشی دووەمدا دەقی نوسخەی دیوانی کەمال راستە، کە "دور از طاقی" واتە بە مەقسەد نەگەیشتووی.

تاق، زیيادە دیوارێ کە پێویستیەکانی لەسەر دادەنێن.

ای که چشمت به نگاهی دل عالم فکَند...

چشم؛ اشارت است به شهود حق مراعیان و استعدادات ایشان را و آن شهود معبر به صفت بصر می‌گردد و در اصطلاحات صوفیه است که چشم جمال‌را گویند و نیز صفت بصر الهی را گویند. (شرح گلشن راز، ص ٥٥١)

غمزه: رک شرح‌های پیشین

همان طور که در شرح‌های پیشن آمد یکی از معانی غمزه اشارت به استغناء و عدم التفات است. پس برابر نسخهٔ دیوان کمال "ز تیزی نکند" صحیح است و "ز تیری نکند" اشتباه است. همچنین در مصرع پایانی این بند برابر نسخهٔ دیوان کمال "زخمه" صحیح و "زخم" اشتباه است. و این بند شرح وادی «فنا» است.

ئەی ئەوەی واچاوت بە نیگایەک دڵی عالەم بەردەداتەوە!...

چاو؛ ئاماژەیە بە شوهوودی حەق بۆ عالەمی ماددی بە نیسبەتی ئیستیعدادی ئەوەی کە لە عالەمدا هەیە، هەروا کە دەزانین شوهوودی سیفەتی بەسەر، واتە چاوە و لە ئیستیلاحی سۆفیەتیدا چاو بە جوانی و رواڵەتی جوان دەڵێن و سیفەتی بینا تایبەتی خوداوەندە، کە وابو و چاو بۆ بینایی ئیلاهی دەگەرِێتەوە. (شرح گلشن راز، ص٥٥١)

غەمزە: بڕوانە شرۆڤەکانی پێشوو

هەر وەک لە شەرحەکانی پێشوودا هاتووە، یەکێ لە ماناکانی غەمزە ئاماژە بە بێنیازی و بایەخ نەدانە، کەوابوو، بەپێی نوسخەی دیوانی کەمال "ز تیزی نکند" ڕاستە و "ز تیری نکند" هەڵەیە، هەروەها لە دێڕی کۆتایی ئەم بەشەدا بەپێی نوسخەی دیوانی کەمال "زخمە" ڕاستە و "زخم" هەڵەیە، ئەم پێنجخشتەکیە شەرحی وادی «فنا» یە.

**ای خوش آن دم که نشـــینند به هم بادەکشـــان...**
**بادەکشـــان ســـالکان اهل ســـماع و ذکر را گویند.**

ساقی: شراب‌دار را گویند و آن که شراب دهد و کنایت از فیاض مطلق است و در بعضی موارد اطلاق بر ساقی کوثر شده است و به طریق استعارت بر مرشد کامل نیز اطلاق شده است و گفته شده است، مراد از ساقی ذات به اعتبار حب ظهور و اظهار است. (ریاض‌العارفین، ص ٤٠؛ اصطلاحات فخرالدین عراقی؛ شرح گلشن راز، ص ٦١٩)

باقی: حق مقصود است. بادۀ باقی: عشقی که جاودانگی دارد و به بقای بالله رساند.

برابر نسخۀ دیوان کمال، مصرعِ «ای خوش آن مجلس خالی شده از مدعیان» صحیح است و «مجلسیان» اشتباه اَست. قَدَر، ایهام دارد به سرنوشت سالک...

خۆزگە بەو کاتەی کە مەینۆشان پێکەوە دابنیشن...

مەینۆشان، یا بادەکەشان بە سالیکانی ئەهلی سەما و زیکر دەڵێن.

ساقی؛ بە شەرابدار دەڵێن و ئەوەی وا شەراب دەگێڕێ، کە کینایە لە فەیازی موتلەقە لە بڕێ کاتدا ئیتلاق بە ساقی کەوسەرە و بە ڕێگەی ئیستیعارە بە مورشیدی کامیل ئیتلاق بووە و وتراوە: مراز لە ساقی زات بە ئیعتیباری (حوب) واتە خۆشەویستی ئاشکرایە و ڕاگەیاندنی ئەو خۆشەویستیە مەبەستە. (ریاض‌العارفین،ص٤٠؛ اصطلاحات فخرالدین عراقی؛ شرح گلشن راز، ص ٦١٩)

باقی: مەبەست حەقە، بادەی باقی: ئەو عیشقە کە نەمری دێنێ و بە بقاء بالله واتە نەمریی خودایی دەگەیێنێ.

بەپێی نوسخەی دیوانی کەمال لە دێڕی؛ «ای خوش آن مجلس خالی شده از

مدعیان» راسته و «مجلسیان» هەڵەیە. قەدەر، ئیهامی هەیە بۆ چارەنووسی سالیک.

عاشق حسن تو ای پادشه حورسرشت...
پادشاه: فرمانروای نگهبان، چشم: رک به شرح بندهای پیشین
مقصود از این بند که عارف چون به مقام بقاء رسد، غیر از جمال حق نه به بهشت می‌اندیشد و نه به تنعم آن و بی‌شهود جمال، بهشت آتش و کعبه کنشت است. یعنی آسایش، زحمت و وحدت، کثرت است.
عاشقی رووی تۆ ئەی پاشای بە سروشت وەک حۆری...
پاشا: فەرمانڕەوای نیگایان، چاو: بڕوانە شرۆڤەی بەشەکانی پێشوو
مەبەست لەم بەشە ئەوەیە کە عارف کاتێ بە مەقامی بەقا واتە نەمریی رۆحی دەگا، جگە لە جەمال و جوانیی حەق، نە لە بەهەشت و نیعمەتەکانی بیر ئەکاتەوە، نە لە پاداش و رێزلێنان، بێ دیتنی جوانی و جەمال، بەهەشت ئاورە و کەعبە کەنیشتە؛ یانی هەسانەوە چەوسانەوەیە و یەکدانەیی کەسرەتە.

کیست زخم مژەات خورد به آن سالم زیست
اتکاء این بند بر واژۀ «نقطه» است. خال در اصطلاح صوفیان اشاره به نقطۀ وحدت است. در ریاض‌العارفین است که: خال کنایه از وحدت ذات مطلق است. (تذکرۀ ریاض‌العارفین، ص ۳۸)
گرچه خال را مترادف نقطه آوردند، اما نقطه خود بحثی مفصل دارد که شارح این دیوان [محمدعلی سلطانی] را رساله ای مستقل دربارۀ «نقطه» است.
مصرع پایانی هشداری است برای عارف که حتی در مرتبۀ «بقا» نیز نباید از مکرها ایمن بود.
کێیە ئەو کەسە وا برژانگت بریندارى کردبێت و بە سەلامەتی ژیابێت؟...
بنەما و پاڵپشتی ئەم بەشە پێنجخشتەکیە لەسەر وشەی «نقطە» واتە خاڵ دامەزراوە. خاڵ لە ئیستیلاحی سۆفیاندا ئاماژە بە «نقطە» = خاڵی وەحدەت، واتە یەکدانەیی، لە کتێبی ریازولعارفین‌دا هاتووە کە:خاڵ کینایە لە وەحدەتی زاتی موتلەقە. (تذکرۀ ریاض‌العارفین، ص ۳۸)

هەرچەند خاڵ بە هاومانای نوقتە دەهێنن بەڵام نوقتە باسێکی بەربڵاوی هەیە کە شارحی ئەم دیوانە [محەمەدعەلی سوڵتانی] ریسالەیێکی سەربەخۆیْ لەو بارەیەوە، یانی سەبارەت بە «نوقتە» بە فارسی هەیە.

دێڕی کۆتایی، ئاگاداریيەکە بۆ عارف، کە تەنانەت لە پێگەی بەقا واتە نەمریدا نابیْ لە مەکری هەمە جۆرە ئەمین بیْ!

ای ز خوبان جهان برتری از حسن و جمال...

عارف از نقطه به خطّ می‌رسد که خطّ؛ اشارت است به تعینات عالم ارواح که اقرب مراتب وجود است؛ و گفته شده که مراد از خطّ، عالم کبریایی است که عالم ارواح مجرده است که اقرب مراتب وجود است با مرتبت غیب هویت.

"خالص" به نقطهٔ وحدت و بقاء می‌اندیشد. "کمال" ایهام دارد که یکی کمال الهی است که دیوان خداوندی او همه نقش و خط و خال است و دیگر دیوان شیخ کمال خجندی که بر اوراق او جز عشق نیست.

ئەی ئەوەی وا لە چاکی و جوانیدا لە هەموو خاسانی جیهان بەرزتری!...

عارف لە نوقتە بە خەت دەگا کە خەت، ئاماژە بە تەعەییوناتی عالەمی ئەڕواحە کە نزیکترین پێگە و پایەی وجوودە و وتوویانە کە مراز لە خەت عالەمی کیبریاییە، کە عالەمی ئەڕواحی موجەڕەدە، کە نزیکترین مەراتبی وجوودە لەگەڵ مەرتەبەتی غەیبی هوویەت.

«خالص» بیر لە نوقتەی وەحدەت و بەقا ئەکاتەوە، «کەمال» ئیهامی تێدایە: یەکیْ مەبەست کەمالی ئیلاهیە، کە لە دیوان و بارەگای خوداوەند ئەو هەموو نەقش و خەت و خاڵەی هەیە و ئەویتر دیوانی شێخ کەمالی خوجەندییە، کە لەسەر لاپەڕەی ئەو دیوانە جگە لە عیشق چیتر نییە.

(۱)

## تخمیس غزل حضرت مولانا خالد

به شــمع طلعتت کردم منــور خانهٔ خــود را
گشــادم درگه عیــش و فرح پروانــهٔ خود را
بــه غواص خیالــت یافتم دردانـــهٔ خــود را
«بــه معمــار غمت نو ســاختم ویرانهٔ خود را
به یادت کعبه کــردم عاقبت بتخانهٔ خود را»

ز شوق عشقِ شورانگیز، گشتم واله و حیران
سراسر هر دو عـــالم را نهادم در ره جــانان
به خاک و خون تپیدم بر در میخانهٔ مستــان
«انیس من جلیس من شود در حلقهٔ جــانان
به گوشش گر رســانم نعرهٔ مستانهٔ خود را»

چو بلبل بر گل رویت ز بس نالیدم ای طنـــاز
روان شد خون دل از چشم و افتــادیم از آواز
چو پروانه،به بی پروا،به عیشت گشته ام دمساز
«به گرد شمع رویت بســکه گشتم، ماندم از پرواز
ســرت گــــردم، چه زیبــا سوختی پروانهٔ خود را»

نشد کس همچو من شیدا، میان عالم و آدم
ز عشــقت هر دم از دیوانگی می گریم و نالم
به رســوایی ز مجنون بر شده طغرای احوالم
«ز سودایت چنان بدنــام گشتم در همه عــالم،
به گوش خود شنیدم هر طرف افسانهٔ خود را»

نگنجـــد در ره فقر و فنا، هستی و مغروری
بر ارباب عزلت خوش بود از خلق مســتوری
در آفــاق مودت شــرک باشد میل مشهوری
«در اقلیم محبت از خـــرابی‌هاست معموری
به سیل اشک باید کند اساس خانهٔ خود را»
چو حمـــد حـــامد نعمت همه ساری است از واحــد،
نشاید ممکنی ممکن شــود بی‌واجــب واجـــــد
وجودت چیست «خالص»! تا بر انعامش شوی حامد؟
«سراپــا نعمتم با این همه درماندگی، «خالد»!
نمی‌دانم چه سان آرم به جا شکرانهٔ خود را»

## (١)
## تەخمیسی غەزەلی حەزرەتی «مەولانا خالید» قُدِسَ سرُّه[1]

بــە شەمی ڕوخساری تۆ مــاڵی خــۆم ڕوونــاک کــردەوە
دەرگـــای عەیش و شـــادیم لــە پــەپــوولــەی خــۆم کــردەوە
بــە غــەوواســی خەیاڵت دانــەی مــرواری خــۆم دۆزیــیــەوە
«بــە میعمــــاری خــەمــت ویرانــەی خــۆم نــوێ کـــــردەوە
ســەرئەنجام، بــە یــادی تــۆوە بتخانــەی خــۆم کــردە کەعبــە»
بە شەوقی عیشقێکی بزوێنەرەوە، شەیدا و سەرلێشێواو مامەوە
سەرانسەری هـــەردوو عالەمم لە ڕێگەی گیانانی خۆم دانــا
لەبەر دەرگـــای سەرخۆشـان لە خــاک و خـــوێندا تـلامەوە
«هـاودەمــی مــن لــە ئاڵقــەی ڕیندانــدا دەبێتــە هــاونشــینم،
ئەگــەر نەعرەتــەی سەرخۆشــانەی خۆمــی بگەیێنمــە گــوێ»
ئەی شۆخی بەناز! ئەوەندە وەک بولبول بۆ گوڵی ڕووت ناڵاندم،
خوێنی دڵم لە چاومەوە سەری کرد و لە ئاواز گـوتن کــــەوتم
توغرای[2] ئـەحـواڵم لە ڕیسواییدا لە هی مەجنوون هەورازتر بووە
«بــەهـــــۆی عیشــقی تــــۆوە وەهــا نــــاوم لــە عالەمـــدا زڕا،
کە بەگوێی خۆم ئەفســانە و باسی خۆم لە هەموو لایەک دەژمێرم»
کەس وەک من لە نێو عالەم و ئادەمدا شێت و شەیدا نەبوو
لــە عیشقی تــۆدا دێـوانە بـــووم و دەگـــریم و دەنـاڵینم
بانگەوازی ڕیسوایی و شێتبوونی من لە هی مەجنوون پترە
«لــە ســەودای تــو ئەوەنــدە لــە هــەمــوو عالەمــدا بەدنــاو بووم
لەهــەر لایێــک حیکایــەتی خۆمــم بــە گوێی خــۆم بیســـتەوە»

---

١ . مەزاری ئەو خاوێن بێ (م، ع،س)

٢. توغرا بە مانای ئیمزا یان مۆرە. لێرەدا مەبەست هەر ناوبانگە. ع.ح

بـــوون و غـــروور لـەسـەرەڕێـی هــەژاری و فـــەنادا ناگونجێت
لـە لای گـۆشـەگـیران، خـۆشـاردنـەوە لـە خەڵک شتێکی خۆشە
لە ئاسۆی دۆستیدا، خـواستی نـــاوەدەرکردن وەک شەریکدانان بۆ خـــودا وایە

«لەنـــاوچەی خۆشەویســـتیدا ئاوەدان بوون یەک لــە وێرانییەکانە
دەبێ بــە لافاوی فـــرمێســـک بنـــاغەی مـاڵی خــۆت هەڵکەنی»

کاتێک ستایشی ستایشکەری نیعمەت هەمووی بەدەست یەکتاوەیە،
بەبێ بـــڕیـــاری یــــەکتـــا، هیچ گونجاوییەک گونجـــاو نابێت
ئیتر تۆ ئەی «خالص»! چ بوونێکت هــــەیە کە سپاسی نیعمەتی بکـــەیت؟

«بــــەو هـەموو دامـــاوییـــەوە کە هەمە، ســـەرتاپام نیعمەتە، جـــا
ئەی «خالیـــد»! ا نازانم چۆن شـــوکرانەبژێریی خـــۆم بەجێ بێنم»

## شرح مختصر زندگانی شاعر غزل

کورتەی ژیانی شاعیری غەزەلەکە

**مولانا خالد نقشبندی:**

ذوجناحین ابوالبهاء ضیاءالدین خالد بن احمد بن حسین العثمانی، که نسبش به حضرت عثمان بن عفان ذوالنورین خلیفهٔ سوم رضی‌الله عنه می‌رسد، از نوادگان پیر میکائیل معروف به شش انگشت است که از اولیاء نام‌آور عصر خویش بوده است.

مولانا خالد به قول اکثر نویسندگان در سال ۱۱۹۳ هجری قمری = ۱۷۷۹ میلادی یا نزدیک به همین تاریخ در قصبهٔ قره داغ چشم به جهان گشود.

در نوجوانی مقدمات را نزد پدر آموخت و سپس راهی سلیمانیه شد و پس از طی مراحل تحصیل عالیه از محضر شیخ محمد قسیم سنندجی متوفی به ۱۲۳٦ هجری قمری اجازهٔ اجتهاد گرفت.

مولانا در همهٔ علوم عقلی و نقلی آن عهد چون صرف و نحو، معانی و بیان و بدیع، منطق و آداب بحث و مناظره، حکمت، هیئت، حساب و هندسه، عروض و قافیه، اصول فقه و اصول دین به سرحد کمال رسیده و در میان علما و دانشمندان عصر خویش نظیر و همتایی نداشته است.

سفری به مکهٔ مکرمه می‌نماید. از مکه درویش محمد عظیم‌آبادی، دلیل او شده پس از بازگشت به سلیمانیه به همراه او عازم هند می‌شود و در دهلی با شیخ المشایخ سرزمین هند، شاه عبدالله دهلوی ملاقات و در پنج ماه مقام قرب حضور و مشاهده را دریافت می‌نماید.

سینه‌اش طور تجلی انوار حق می‌گردد و در طریقت و عرفان به مقام «فنا» و «بقا» ارتقاء پیدا می‌کند و شاه عبدالله با اشاره‌ای روحانی از اولیاء کرام و بزرگوار نقشبندی قدس‌الله اسرارهم ضمن اجازهٔ ارشاد هر پنج طریقهٔ معروف از: نقشبندی، قادری، سهروردی، کبروی و چشتی اجازهٔ تدریس حدیث و تفسیر و تصوف، اوراد و ادعیه را به او می‌دهد و پس از یک سال به فرمان وی به حضور عالم و مدرس بزرگوار، واعظ و صوفی کهنسال مولانا عبدالعزیز حنفی بار می‌یابد و اجازهٔ تدریس همهٔ علوم [انسانی] آن روزگار و روایت کتب صحاح و غیره را هم از وی دریافت

می‌نماید.

در مراقبه‌ای روحانیت سلطان اولیاء حضرت علی‌بن ابیطالب علیه‌السلام را می‌بیند و اجازهٔ ارشاد در تمام بلاد اسلامی را از استاد خود دریافت کرده، عازم دیار خود می‌شود. مولانا خالد بنیانگذار رشتهٔ خالدی مجددی نقشبندی "مجددیهٔ مظهریه" در جهان اسلام بود که هنوز هم ادامه دارد و تمام کشورهای اسلامی را دربرگرفته است.

وی در شب جمعه سیزدهم ذی‌القعدهٔ سال ۱۲٤۲ هجری قمری در طاعون شام چشم از جهان فرو بست و در همانجا به خاک سپرده شد. مزارش مطاف اهل دل است.

**آثار مولانا خالد:**

هیجده عنوان کتاب در زمینه‌های مختلف علوم اسلامی از آثار قلمی او را یاد کرده‌اند و بیش از بیست عنوان کتاب دربارهٔ او نوشته شده است و در قریب سی منبع و مأخذ (عربی، فارسی، کردی، ترکی) شرح احوال و آثارش آمده است. اروپاییان نیز در مقالات خود مطالب ارزشمندی به زبان‌های غربی (انگلیسی، فرانسه، آلمانی و...) دربارهٔ او نوشته‌اند.

مکاتبات فارسی و دیوان اشعارش از نمونه‌های زیبای عرفانی است که در رسالهٔ پایان‌نامهٔ د. مهیندخت معتمدی با عنوان؛ «مولانا خالد نقشبندی و پیروان طریقت او» به سال ۱۳٦۸ در تهران چاپ و منتشر شده است." الانوار القدسیه / الشیخ معروف النودهی / یادی مه‌ردان و..." (مولانا خالد نقشبندی و پیروان طریقت او، د. مهیندخت معتمدی، تهران، ۱۳٦۸)

جناب شیخ عبدالرحمن خالص با جانشینان جناب مولانا خالد، دوستی و همدلی داشته تا آنجا که در کردستان بار دیگر ائتلاف دو طریقهٔ نقشبندیه و قادریه از پیوند این دو نحله تجدید گردید.

غزلی که جناب خالص تخمیس کرده‌اند از معروف‌ترین غزل‌های فارسی مولانا خالد است و بسیاری از شاعران آن را تخمیس کرده‌اند اما مخمس جناب خالص لطافت خاص خود را دارد.

غزل یادشده در صفحهٔ (۲۴۱/۲) دیوان مولانا خالد چنین آمده است:

**بــه معمـــار غمت نـــو ســاختم ویــرانهٔ خــود را**
**بـــه یــادت کعبه کــردم عــاقبت بتخانــهٔ خود را**
**فـــرو ماندند اطبـــــای جهـــان از چاره‌ام آخــر**
**بـــه دردی یافتــم درمــان، دل دیوانــهٔ خــود را**
**ز ســودایت چنــان بدنــام گشــتم در همه عـــالم**
**بــه گوش خود شــنیدم هــر طرف افســانهٔ خود را**
**به‌گرد شــمع رویت بس‌که گشــتم مانــدم از پرواز**
**ســرت گردم چه زیبــا ســوختی پروانــهٔ خــود را**
**ادیب مـــــن جلیس مـــن شــود در حلقهٔ رندان**
**به گوشــش گر رســانم نـــالــهٔ مســتانهٔ خــود را**
**در اقلیــم محبــت از خـــرابی‌هاســت معمـــوری**
**به ســیل اشــک باید کَند اســاس خـــانهٔ خود را**
**ســراپـــا نعمتم بـــا این همــه درماندگی «خالد»**
**نمی‌دانم چســان آرم بــه جـــا شــکرانهٔ خــود را**

غزل را به منظور مقابله و تفاوت‌های دو نسخه می‌آوریم و از برگردان کُردی که در تخمیس آمده است، خودداری می‌کنیم.

مەولانا خالدی نەقشبەندی:

زوجەناحەین، ئەبولبەها زیائەدین خالید کوڕی ئەحمەد کوڕی حوسێنی عوسمانی، کە بە نەسەب دەگاتەوە سەر حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەففانی زوننوورەین خەلیفەی سێیەم، خوای‌لێ‌رازی بێ. خالید لە نەوەکانی پیر میکایلی بەناوبانگ، بە شەش قامکە، کە لە ئەولیای ناوداری سەردەمی خۆی بووە.

مەولانا خالید بە قەولی زۆر لە نووسەران، سالی ۱۱۹۳ی کۆچیی مانگی، بەرانبەر بە ۱۷۷۹ی زایینی، یان نزیک بەم سالە لە ناوچەی قەرەداخ لە دایک بووە، لە لاوێتیدا عولوومی سەرەتایی لە لای باوکی خوێندوە و دوای ئەوە چووەتە سلێمانی، لە دوای

تێپەڕاندنی قۆناغی باڵا و نیهایی لە حوزووری شێخ محەمەد قەسیمی سنەیی (ک. ١٣٢٦ ک، م) ئیجازەی ئیجیتهادی وەرگرتوە.

مەولانا لە هەموو عولوومی عەقڵی و نەقلیی سەردەمی خۆیدا وەک؛ سەرف و نەحو، مەعانی و بەیان، مەنتیق و ئادابی بەحس و مونازەرە، حیکمەت، هەیئەت، حیساب و هەندەسە، عەرووز و قافیە، ئوسوولی فیقهـ و ئوسوولی دین بە سنووری کەمالی عیلمی و ئەخلاقی گەیشتووە، و لە ناو عولەما و زانایانی سەردەمی خۆیدا هاوتای نەبووە.

سەفەرێک بۆ مەککە دەکات. لە مەککە دەروێش محەمەدی عەزیم ئابادی، دەبێ بە چاوساغی، دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و بە هاوڕێیی ئەو پیاوە دەڕوا بۆ هیندوستان و لە دەهلی دیدارێ لەگەڵ شێخولمەشایخی سەرزەمینی هیند شاعەبدوڵڵای دەهلەوی ئەکا و لە ماوەی پێنج مانگدا بە پلەی قوربی حوزوور و موشاهەدە دەگا، سینگی دەبێ بە تووری تەجەللیی ئەنواری حەق و لە تەریقەت و عیرفاندا بۆ پلەی فەنا و بەقا بەرز دەبێتەوە. شاعەبدولا بە ئیشارەی ڕووحانی لە ئەولیای گەورە و باڵانشینی نەقشبەندی ـ کە خوداوەند مەزاریان پاک و خاوێن کات لە خەمی خۆفی گوناهـ ـ لە پاڵ ئیجازەی ئیرشادی هەر پێنج تەریقەی بەناوبانگ کە بریتیین لە؛ نەقشبەندی، قادری، سوهرەوەردی، کوبرەوی، چەشتی ـ ئیجازەی وانەوتنەوەی حەدیس و تەفسیر و تەسەووف و ئەنجامی ئەوراد و ئەدعیە بەو دەدا. لە دوای ساڵێک بە فەرمانی شاعەبدولا دەڕوا بۆ حوزووری عالم و مودەڕیسی گەورە، واعیز و سۆفیی تەمەندرێژ مەولانا عەبدولعەزیزی حەنەفی و ئیجازەی وانەوتنەوەی هەموو عولوومی ئەو سەردەمە و ڕەوایەتی کتێبی سەحاحی ستە و... وەردەگرێ.

لە کاتی موراقەبەی ڕووحانیدا سوڵتانی ئەولیا حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبوتالیب ـ درووودی خودای لەسەربێ ـ دەبینێ و ئیجازەی ئیرشاد لە هەموو بیلادی ئیسلامی لە ئوستادی خۆی وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان.

مەولانا خالید بناغەدانەری مەشرەبی خالیدی موجەددەدی نەقشبەندی (موجەددەدی مەزهەریە) لە هەموو جیهانی ئیسلامدایە.

مەولانا لە شەوی هەینی سێزدەمی مانگی زیقەعدەی سالی **١٢٤٢** کۆچی مانگی لە تاعونی شام «سووریای ئەمڕۆ» کۆچی دوایی کرد و هەر لەوێش نیژرا، مەزاری زیارەتگای ئەهلی دڵە.

نووسراوەکانی مەولانا خالید:

هەژدە کتێب لە بوارە جۆراوجۆرەکانی عولوومی ئیسلامیدا لە نووسراوەکانی ئەو بلیمەتە ناسراون و پتر لە بیست کتێب سەبارەت بە مەولانا نووسراوە. نزیک بە سی سەرچاوەی باوەڕپێکراوی ئاکادیمی بە زمانەکانی عەرەبی، فارسی، کوردی و تورکی؛ لەسەر چۆنیەتیی ژیان و نووسراوەکانی مەولانا وتار و لێکۆڵینەوەیان تەرخان کردووە، ئورووپییەکان لە وتارەکانی خۆیاندا مەعلووماتی پربایەخیان بە زمانە رۆژئاواییەکان (ئینگلیزی و فەرانسەیی و ئەڵمانی و...) خستۆتە بەردەست.

نامە فارسیەکان و دیوانی ئەشعاری ئەو لە نموونە جوانەکانی عیرفانین، کە بوونە بابەتی ریسالەی دکتورای خاتوو د. مەهیندوختی موعتەمەدی، بە ناوی «مەولانا خالیدی نەقشبەندی و شوێنکەوتووانی تەریقەتەکەی ئەو» ساڵی ١٣٦٨ی کۆچیی هەتاوی لە تاران چاپ کراوە."الانوارالقدسیه/ الشیخ معروف النودهی / یادی مەردان و..." ← (مولانا خالد نقشبندی و پیروان طریقت او، د. مهیندخت معتمدی، تهران، ١٣٦٨)

حەزرەتی شێخ عەبدوڕەحمان "خالص" لەگەڵ جێنشینانی حەزرەتی مەولانا خالید، دۆستایەتی و هاودڵی و برایەتیی هەبووە تا ئەو رادەیە کە بەم بۆنەیەوە لە کوردستاندا دوو تەریقەتی نەقشبەندی و قادری لە پێوەند و یەکبوونی تاڵەبانی و موجەددەدی پێکهات.

ئەو غەزەلە کە حەزرەتی خالص لە هەڵبەستەکانی مەولانا کردوویە بە پێنجخشتەکی، بەناوبانگترین غەزەلی فارسیی مەولانایە و زۆر لە شاعیران کردوویانەتە پێنجخشتەکی. پێنجخشتەکیەکەی حەزرەتی خالص ناسکیی تایبەتی خۆی هەیە.

ئەم غەزەلە، لە لاپەڕەی (٢٤/٢)ی دیوانەکەی مەولانا خالیدا بەم شێوەیەکە لە بەشە فارسیەکەدا هێناومە، هاتووە.

وەک نموونەکانی پێشوو، بە مەبەستی بەراورد و جیاوازییەکانی دوو نوسخەکە هێناومە و وەرم نەگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

**شرح تخمیس غزل حضرت مولانا خالد سرودۀ حضرت خالص**

شەرحی پێنجخشتەکیی غەزەلی حەزرەتی مەولانا خالید هەڵبەستی حەزرەتی خالص

به شمع طلعتت کردم منور خانۀ خود را...

شمع: نزد صوفیان، نور الهی را گویند و باز گفته‌اند که شمع اشارت به پرتو نور الهی است که می‌سوزد دل سالک را و نیز اشارت به نور عرفان است که در دلِ صاحب شهود افروخته می‌گردد و آن دل را منور کند و شمع الهی قرآن مجید را گویند. (کشاف، ص ٧٦٤؛ شرح گلشن راز، ص ٣٤)

خانه: خودی خود که غیب وجود است. پروانه: روح مجرد را گویند.

غواص: سلوک کردن سالک را گویند که به معاونت مرشد کامل باشد و آن سلوک آفاقی و انفسی و کشف آفاق و انفس و جمیع موجودات است.

خیال: مرتبه و رای آگاهی و توهم است. غم: بند، اهتمام طلب معشوق را گویند.

ویرانه: عالم ماده و مادیات را گویند.

کعبه: توجه دل است به سوی خداوند و مقام وصل را نیز گویند و توجه دل است به محبوب و معشوق و مطلوب که در آن مقام، عاشق باید محرم شود تا به وصال معشوق نائل گردد.

این بند مخمس با رمز و اصطلاح می‌نماید که جناب خالص با تخمیس غزل بیانگر این معناست که مراحل سلوک را از آغاز تا انجام به همان شیوۀ حضرت مولانا طی کرده است.

بەشەمی ڕوخساری تۆ ماڵی خۆم ڕووناک کردەوە...

شەم: لە لای سۆفیان بە نووری ئیلاهی دەڵێن و وتوویانە کە شەم ئاماژەیە بە شەوقی نووری ئیلاهی، کە دڵی سالیک دەسووتێنێ و ئیشارەیە بە نووری عیرفان، کە لە دڵی ساحیبی شوهووددا دەگەڕێ و ڕووناکی دەکاتەوە و شەمی ئیلاهی مەبەست قورئانی پیرۆزە. (کشاف، ص ٧٦٤؛ شرح گلشن راز، ص ٣٤)

خانە: واتە ژوور و ماڵ، (خانوو)؛ مەبەست خۆبوونی خۆیە، کە نهێنیی وجوودە.

پەروانە: ڕۆحی موجەڕەدە.

غەواس: بە سولووک‌کردنی سالیک دەڵێن کە بە یارمەتیی مورشیدی کامیل ئەکرێ و ئەوە سلووکی ئافاقی و ئەنفوسیە و ئاشکرا کردنی ئافاق و ئەنفوس و هەموو مەوجووداتە لە ڕوانگەی سالیکەوە.
خەیاڵ: پلەی پەڕینەوە لە مەرتەبەی ئاگایی و تەوەهومە.
خەم: بەنە، بانگەوازی تێکۆشانی مەعشووقە بۆ دەرچوون لە کەمەندی عیشق و چالاکیی عاشق.
وێرانە: عالەمی ماددی.
کەعبە: سەرنجی ڕاستەوخۆی دڵ بەرەولای خوداوەندەوە، کە پلەی وەسڵ و پێوەندیشی پێ دەڵێن، هەروەها سەرنجی دڵ بە مەحبووب و مەعشووق و مەتلووب، کە لەو پلەیەدا عاشق دەبێ مەحرەم بێ، تا ویسالی مەعشووقی بۆ دەست بدا.

ئەم بەشەی پێنجخشتەکیەکە بەرەمز و سەمبول وا دەنوێنێ، کە حەزرەتی خالص بە پێنجخشتەکی‌کردنەوەی غەزەلە، کە ئەم مانایە دەردەخا کە پلە و قۆناغەکانی سولووکی لە سەرەتا تا کۆتایی بە هەمان شێوەی حەزرەتی مەولانا تێپەڕاندووە.

ز شوق عشق شورانگیز گشتم واله و حیران...
شوق: رک شرح‌های پیشین. عشق: رک شرح‌های پیشین.
حیران: رک شرح‌های پیشین. جانان: رک شرح‌های پیشین.
میخانه: رک شرح‌های پیشین
رند: کلمهٔ رند در اصطلاح متصوفان و عارفان به معنی کسی است که جمیع کثرات و تعینات وجوبی ظاهری و امکانی و صفات و اعیان را از خود دور کرده و سرفراز عالم و آدم است که مرتبت هیچ مخلوقی به مرتبت رفیع او نمی‌رسد. (شرح گلشن راز، ص ٦٢٠)

در مصرع چهارم "ادیب" صحیح و "انیس" اشتباه است. ادیب به معنی ادب‌کننده در امور اجتماعی و اخلاق ظاهری.
نعرهٔ مستانه: فریاد عبور از عالم جسم و امکان و ظواهر، این بند مخمس گذشتن از جهان ناسوتی و ورود به عالم لاهوت است.

به شەوقی عیشقێکی بزوێنەرەوە، شەیدا و سەرلێ شێواو مامەوە...
شەوق: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو. عیشق: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو.
حەیران: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو. گیانان: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو.
مەیخانە: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو.
رند: وشەی رند بە مانای جوامێر لە ئیستیلاحی موتەسەوفان و عارفاندا بە مانای ئەو کەسەیە کە هەموو کەسەرات و تەعەیوناتی پێویستی ئاشکرایی و ماددی و سیفاتی لە خۆ دوور خستووەتەوە و سەربەرزی عالەم و ئادەمە کە مەرتەبەی هیچ مەخلووقێ بە پلە و مەرتەبەی بەرزی ئەو ناگا. (شرح گلشن راز، ص ٦٢٠)

لە دێڕی چوارەمدا "ادیب" راستە و "انیس" هەڵەیە، ادیب؛ ئەدیب واتە فێرکاری ئەدەب لە ئادابی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقدا.
نەعرەتەی مەستانە: هاواری خۆشی بە بۆنەی پەڕینەوە لە عالەمی ماددی، جیسم و ئیمکان و ئاشکرایی، مەبەستی ئەم بەشە لە پێنجخشتەکی پەڕینەوە لە جیهانی ماددی و گەیشتن بە جیهانی ئیلاهی و لاهووتە.
چو بلبل بر گل رویت ز بس نالیدم ای طنّاز...
بلبل: عاشق. گل: معشوق ظاهری. گل‌رو: زیبایی‌های آشکار.
طنّاز: مایهٔ رنج و راحت، شوخ و پُرناز، اهل مکر و مسخره.
چشم: رک شرح‌های پیشین. پروانه: رک شرح‌های پیشین.
شمع: رک شرح‌های پیشین. پرواز: ادامهٔ سلوک.
این بند پایان عالم فانی و ترک تعلقات جسمانی را منظور است.
ئەی شۆخی بەناز! ئەوەندە وەک بولبول بۆ گوڵی ڕووت ناڵاندم...
بولبول: عاشق. گوڵ: مەعشووقی زاهیری و ئاشکرا.
گوڵی روو: جوانییەکانی ڕوومەت، لە لای عارف جوانیی جیهان پەرتەوی ڕوخساری خوداوەندە.
تەنناز: مایەی ڕەنج و ئاسایش، گەنجی شۆخ و پڕناز، ئەهلی مەکر و گاڵتە
چاو: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو. پەروانە: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو.

شەم:بڕوانە شەرحەکانی پێشوو. پەرواز: بەردەوامیی سولووک.
مەبەستی ئەم بەشە کۆتایی عالەمی فانی و تەرکی تەعەللوقاتی جیسمانیە.

نشد کس همچو من شیدا میان عالم و آدم...
شیدا: شدت غلبات عشق و عاشقی را گویند که در این مقام عاشق خود را فراموش کند و اهل جذبات را گویند.
عالم: ظل دوم که اعیان خارجیه باشد و صور علمیه.
آدم: جامع جمیع اسماء و صفات الهی است.
دیوانه: مغلوبی عاشق را دیوانگی گویند. (اصطلاحات فخرالدین عراقی)
سودایی: آن که جان بر سر معشوق نهد.
در مصرع پنجم"شنیدم' صحیح و "شمارم" اشتباه است.
کەس وەک من لە نێو عالەم و ئادەمدا شێت و شەیدا نەبوو...
شەیدا: سەرکەوتنی هەموو لایەنی عیشق و عاشقی بە سەر مرۆڤدا، لەم پلەیەدا عاشق خۆی لە بیر دەباتەوە، بە ئەهلی جەزبەیش دەڵێن.
عالەم: سێبەری دووەم کە ئاشکرایە و لە دەرەوەیە و وێنەی زانستیە.
ئادەم: کۆکراوەی هەموو ئەسماء و سیفاتی ئیلاهی.
دێوانە: بە عاشقی مەغلووب دەڵێن دێوانە ، (ئیستیلاحاتی فەخرەدینی عێراقی)
سەودایی: ئەوەی وا گیان لە پێناوی مەعشووق دادەنێ.
لە دێڕی پێنجەمی ئەم بەشەدا "شنیدم" ڕاستە و "شمارم" هەڵەیە.

نگنجد در ره فقر و فنا هستی و مغروری...
مغروری: از آفات سلوک و ویژۀ شیطان است. مستوری: پنهان ماندن.
این بند هشدار و یادآوری به اهل بقاست که در جهان جسمانی حاضرند.
بوون و غوروور لە ڕێگەی هەژاری و فەنادا ناگونجێت...
غوروور: لە ئافەتی سولووکە و تایبەتی شێتانە.
مەستووری: بەنهێنی مانەوە، ئەم بەشە ئاگاداری و خەبەرکردنەوەی سالیکانی ئەهلی بەقایە کە لە جیهانی ماددیدا دەژین و بە لەش زیندوون.

چو حمد حامد نعمت همه ساری است از واحد...

در این بند «تواضع» و «افتادگی» موج می‌زند. جناب «خالص» خویش را شایستۀ ستایش نمی‌داند زیرا وجودی در خود نمی‌بیند و در برابر، حضرت مولانا از نعمت بیکرانی در کنار درماندگی‌ها دم می‌زند و شیوۀ شکر را جستجو می‌کند و چه پایان زیبایی.

حمد حامد نعمت... ستایش نیز از زبان حق جاری می‌شود. او خود را ثنا گفته است.

ممکن: جایز، روا، ضد محال.

واجب: لازم، ضروری، آنچه به جاآوردنش لازم و ترک آن گناه و عقاب داشته باشد.

واجد: یابنده، دارنده، توانا، توانگر (خداوند).

کاتێ که ستایشی ستایشکەری نیعمەت هەمووی لە یەکتاوەیە...

لەم بەشەدا خۆبەکەمزانین و کەوتەیی شەپۆلی داوەتەوە. حەزرەتی "خالص" خۆی بە شیاوی سوپاس و ستایش نازانێ، چونکە وجوودێ لە بەرانبەری خوداوەندەوە بۆ خۆی نابینێ، هەروەها لە کۆتاییدا حەزرەتی مەولانا لە نیعمەتی هەمەلایەنە لە پاڵی کفتەکاریەوە دەم لێدەدا و بەدوای زانینی شێوەی سوپاسکردنەوەیە و چ کۆتاییەکی جوانە ئەم کۆتاییە...

ستایشی ستایشکەری نیعمەت: سپاسیش هەر لە زمانی حەقەوە دێت و ئەو خۆی ستایشی خۆی کردووە.

مومکین: جایز، ڕەوا، پێچەوانەی مەحاڵ.

واجیب: لازم؛ ئەوەی وا بەجێ هینانی پێویستە و تەرکی گوناهە.

واجید: تەوانا، دارا (خوداوەند).

## رباعیات

(۱)

**ای آن کـه بـه هـــر تفــرقـه‌ای رو آری**
**چشــم دل خـود بـه سـوی هـر کـس داری**
**آن بـــه کـــه دلـت ز تفـرقـه بـاز آری**
**دلـــدار یکــی جـــوی، کــه یـک دل داری!**

ئــه‌ی ئه‌وکه‌ســه‌ی ڕووو لــه هــه‌ر پــه‌رش و بڵاوییــه‌ک ده‌که‌یــت!
چـــــاوی دڵـــت لـــه هـــه‌مووکـــه‌س ده‌کـــه‌یـت
بــاشــتره دڵـــت لــه پــه‌رش و بــڵاوی بــگه‌ڕێنیـــه‌وه دواوه
به‌شــوێن یــه‌ک دڵــداردا وێــڵ بــه، چونکــه یــه‌ک دڵــت هه‌یــه!

(۲)

**ای عمـر عزیـزت دو ز پنجـاه گذشــت**
**سـرمـــایهٔ وقتــت ز غــم جـــاه گذشــت**
**تـا کــی نشـوی ز خـــواب غفلـت بیـدار؟**
**آگاه شــو آخـــــر تــو دمــی، گاه گذشــت**

ئــه‌ی ئــه‌وه‌ی ته‌مــه‌نی خۆشه‌ویســـتت دوو لــه په‌نجــا تێپــه‌ڕ بوو
ده‌سمـــــایــه‌ی کــاتــت لــه خه‌می پلــه و پایه‌دا له ده‌ســت چـــوو
تــاکــه‌نگــێ لــه خـــه‌وی غـــه‌فڵــه‌ت هــه‌ڵنـاسـتــی؟
هیـــچ نــه‌بــێ ده‌مێـــک وشـیـــار بـــــه‌ره‌وه، کــــات تێپه‌ڕی

(٣)

**ای پـــادشــها! منــزهـــــا! ســتارا!**
**در وصــف تــو دم زدن چــه یــارا؟ مــا را**
**ایــن قطـــرهٔ ناچیــز بدیــن محــدودی،**
**کــی حـــد بنهـد بیحـــدی دریـــا را؟**

ئەی پادشا، ئەی تاک و بێخەوش، ئەی داپۆشەری [عەیب]!
ئێمــە چـــۆن دەوێـریـن لە وەسفی تـــۆدا بـــدوێین؟
ئــەم دڵۆپە بێنـــرخە، بــەو بــەرتـەسکییەوە کە هـەیەتی،
چـــۆن دەتــوانێ سنوور بۆ بێسنووریی دەریـــا دیـــاری بکات؟

(٤)

**یــارب! بــه جــز از حضــرت تــو، راهــی نیســت**
**جـــــز تکیــه بــه درگــــاه تــو درگاهــی نیســت**
**هــر چنــد گنـــــاه مــن چــو کــوه قـــاف اســت**
**در پیـــش عطـــــای رحمتــت، کاهــی نیســت**

یـــاڕەببی! جگــە لەبەردەمی تۆ، هیچ ڕێگـــایــەک نییە
جگە لە پاڵدانەوە بە دەرگـــای تــۆوە، هیچ دەرگـــایــەک نییە
هــــەرچەندە تــــاوانەکـــانی مـــن بــەقــەدەر کێوی قـــافن،
ئەوە لە لای دەهەندەیی ڕەحمەتی تۆ، پووشکەکایەکیش نییە

## شرح رباعیات

شەرحی چوارینەکان

۱ـ موضوع این رباعی که گوید: ای آن که به هر تفرقه‌ای رو آری... تفرقه است؛ لفظ تفرقه اشارت است به وجود مباینت و اثبات عبودیت و ربوبیت و فرق خلق از حق، بی‌تفرقه عین زندقه بود و تفرقه بی‌جمع محض تعطیل حق بود و اگر در طاعت به کسب خود بنگرد در مقام تفرقه باشد و اگر به فضل حق بنگرد در مقام جمع بود و هر که از خود و اعمال خود به کلی فانی شود در مقام جمع الجمع بود. (مصباح‌الهدایه، ص ۹۸)

هجویری گوید: تفرقه در حکم افعال خداوند است که جمله مردم در کم متفرقند؛ یکی را حکم وجود است و یکی را حکم عدم که ممکن‌الوجود باشد و یکی حکم بقاست و یکی را حکم فنا گویند. «جمع» علم توحید است و تفرقه علم احکام و گاه مراد از تفرقه مکاسب است و از «جمع» مواهب یعنی مجاهدت و مشاهدت، پس آنچه بنده از راه مجاهدت بدان راه یابد جمله تفرقه باشد و آنچه صرف عنایت و هدایت حق باشد؛ جمع بود. (لمع، ص ۳۲۹؛ کشف‌المحجوب، ص ۳۲۵؛ لوایح، ص ۵۷)

جامی گوید: تفرقه عبارت از آن است که دل را به واسطۀ تعلق به امور متعدد پراکنده سازی و جمعیت؛ آن که از همه به مشاهدۀ واحد پردازی و این سخن جامی حاصل رباعی جناب "خالص" است.

۱ـ مەبەستی ئەم چوارینەیە کە دەڵێ: ئەی ئەو کە سەی وا ڕوو لە هەر جیاوازییەک دەکەیت... لەسەر وشەی تەفرەقە واتە جیاوازی و بـڵاوەکردنە. وشەی تەفرەقە ئاماژەیە بە بوونی بـڵاوە و جیاوازی و ئیسباتی بەندەگی و خوداوەندی و جیاوازیی ئەفرێندراو و ئەفرێنەر بەبێ زانینی تەفرەقە کوفر و زەندەقەیە، تەفرەقە بەبێ جەمع واتە کۆکردنەوە بۆ داخستنی حەقیقەت دێتە ئاراوە. ئەگەر سالیک لە تاعەتدا چاوی لە دەسکەوتی خۆی بێ لە پلەی تەفرەقە = جیاوازی دایە و ئەگەر بنوارێتە فەزل و زانستی خوداوەند لە پلەی جەمع = کۆکردن‌دایە و هەرسالیکێ لە خۆی و کردەوەی خۆی بە گشتی فانی بێ لە پلەی جەمعولجەمعدایە. (مصباح‌الهدایه،

ص ۹۸)
هوجویری دەڵێ: تەفرەقە واتە جیاوازی و بـڵاوە لە حوکمی کردەوەی خوداوەندایە کە هەموو خەڵک لە حوکمی بـڵاوە و جیاوازیدان، یەکێ لە بوون‌دایە یەکێ لە نەبووندا ـ یەکێ دەمرێ، یەکێ دەژی ـ یەکێ حوکمی بەقای هەیە و یەکێ حوکمی فەنا، دەڵێن «جەمع» عیلمی تەوحیدە و تەفرەقە عیلمی ئەحکامە و برێ کات مراز و مەبەست لە تەفرەقە عیلمی مەکاسیبە و مراز لە «جەمع» مەواهیبە، یانی تێکوشانی باتنی بۆ دیتنی جەمالی حەق. کەوابێ ئەوەی وا عەبد تێدەکۆشێ کە پێی بگا هەمووی تەفرەقە و بـڵاوەیە و ئەوەی سەرفی عینایەت و هیدایەتی حەق بێ، جەمعە. (لمع، ص ۳۲۹؛ کشف‌المحجوب، ص ۳۲۵؛ لوایح، ص ۵۷)
جامی دەڵێ؛ تەفرەقە ئەوەیە، کە دڵ بە هۆی پێوەندی بە شتی زۆرەوە بـڵاوەی پێ بکرێ و جەمعییەت ئەوەیە کە دڵ لە هەموو ببڕێ و خۆی بۆ بینینی یەکدانە تەرخان بکا، ئەم وتەیە بەرهەمی چوارینەکەی حەزرەتی "خالص"ە.

۲ـ موضوع این رباعی جناب خالص، گاه = زمان است. زمان اصطلاح فلسفی است. یکی از مسائل مهم فلسفی که مورد توجه و اختلاف فلاسفه است، مسألۀ زمان است و از این قرار است: بعضی از فلاسفه گویند، زمان امر موهوم است. بعضی گویند؛ موجود به وجود وهمی است. بعضی گویند اصولاً زمان عبارت از فلک‌الافلاک است و بعضی گویند مطلق حرکت است و بعضی گویند حرکتِ فلک‌الافلاک است. محققان فلاسفه می‌گویند زمان مقدار حرکت است و متقوم بر حرکت و حرکت حامل آن است. بعضی گویند زمان عبارت از آنات متتالیه و یا متلاقیه است. بعضی گویند؛ زمان مقدار وجود است. بعضی گویند ذات واجب‌الوجود است. بعضی گویند نسبت متغیر به متغیر زمان است. (رسائل فلسفیۀ زکریای رازی، ص ۲۷٦؛ تهافت‌التهافت، ص ۸٦؛ رک، کشاف، ص ٦۲۱؛ زادالمسافرین، ص ۱۰؛ شرح حکمت‌الاشراق سهروردی، ص ٤۱۰)
و در اصطلاح اهل تصوف به دو معنی "فرصت" و دیگر آنچه بر سالک حکم می‌راند. چون در این رباعی خطاب به خود جناب خالص دارد، هر دو معنی از آن برداشت می‌شود. وقت =زمان = گاه در معنی اول؛ به معنی کسی است که

فرصت‌ها را از دست نمی‌دهد و فریضه‌ها را به وقت خود انجام می‌دهد و عمر را به بطالت نمی‌گذراند و به قول مولانای رومی "ابن‌الوقت" است یعنی زمان بر او حکم می‌راند و در روی دیگر صافی است یعنی در مرتبه‌ای والاتر است و محکوم و مغلوب تصرّفات "حال" و "وقت" نیست و در واقع اَبوالوَقت است نه ابن‌الوقت، جناب خالص در اینجا، صفت باطنی خود را که "صافی" است مربی جسم ظاهری که صوفی است قرار داده و جسم را هشدار می‌دهد. (شرح مثنوی، کریم زمانی، ج ۳، ص ۳٦۳)

۲ـ مەبەستی ئەم چوارینەیەی حەزرەتی خالص، "گاهـ" واتە زەمانە، زەمان ئیستیلاحی فەلسەفیە. یەکێ لە مەبەستە گرنگەکانی فەلسەفی کە جێی سەرنج و جیاوازیی بیروڕا و ناکۆکیی فەلاسیفەیە، بابەتی زەمانە. هەندێ لە فەلاسیفە دەڵێن زەمان ئەمری مەوهوومە و بڕێ دەڵێن مەوجوود بە وجوودی وەهمییە. بڕێ دەڵێن زەمان عیبارتە لە فەلەکولئەفلاک، هەندێ دەڵێن موتلەق حەرەکەتە و بڕێ دەڵێن حەرەکەتی فەلەکولئەفلاکە. لێکۆڵەرانی فەلسەفە دەڵێن زەمان چەندایەتیی حەرەکەتە و راستبوونەوە لە حەرەکەت و حەرەکەت، جێبەجێ‌کەری زەمانە. بڕێ دەڵێن زەمان عیبارەتە لەو ئانانەی یەک لە شوێنی یەک و یەک جۆرە، یان لەسەر یەک کە ئەو ئانانە واتە چرکەکان، ڕووبەڕوو دەبنەوە. بڕێ دەڵێن زەمان چۆنیەتی وجوودە. بڕێ دەڵێن زاتی واجیبولوجوودە، بڕێ دەڵێن نیسبەتی گۆڕاو بە گۆڕاوی زەمانە. (رسائل فلسفیۀ زکریای رازی، ص ۲۷٦؛ تهافت‌التهافت، ص ۸٦؛ رک، کشاف، ص ٦۲۱؛ زادالمسافرین، ص ۱۰؛ شرح حکمت‌الاشراق سهروردی، ص٤۱۰)

لە ئیستیلاحی ئەهلی تەسەوفدا زەمان بە دوو مانای «فرسەت» و ئەوەی وا بەسەر سالیکدا حوکم دەکا، چونکە ئەم چوارینەیە ڕووی لە حەزرەتی خالص خۆیەتی، هەر دوو مانای لێ وەردەگیرێ، کات = زەمان = گاهـ لە مانای یەکەم، بە مانای ئەوە وا فرسەت لە دەس نادا و واجباتی سولووکی هەرکام بە کاتی خۆی بە جێ دێنێ، تەمەن بە بەتاڵی ڕانابوێرێ، بە وتەی مەولانای ڕۆمی "ئیبنولوەقتە"، یانی زەمان حوکمی بە سەردا دەکا و لە لایێ ترەوە پاڵاوە، یانی لە پلەیەکی بەرزترەوەیە و مەحکووم و داگیراوی تەسەڕۆفات وەک "حاڵ" و "کات" نییە و لە

راستیدا "ئەبولوەقتە" نە "ئیبنولوەقت". حەزرەتی خالص لێرەدا، سیفەتی باتینی خۆی، کە سافی و پاڵاوتەیە، ئەکا بە رێنومای جیسمی زاهیر کە هەمان سۆفیە و ئاگادار و خەبەری دەکاتەوە.

۳ـ موضوع این رباعی محدود و نامحدود = منتهی و بی‌نهایت = قطره و دریاست و این که محدود توان وصف نامحدود ندارد و گفتیم که قطره و دریا و... از اصطلاحات عارفان و شاعر پیرو وحدت وجود است. برای شرح قطره و دریا رک شرح‌های پیشین.

۳ـ مەبەستی ئەم چوارینەیە بە سراوەیی و کراوەییە = سنووردار و بێسنوورە = دڵۆپ و دەریایە و باسی ئەوەیە کە؛ بەسراو هێزی وەسفی کراوەی نییە و گوتوومانە دڵوپ و دەریا و... لە ئیستیلاحاتی عارفان و شاعیرانی شوێنکەوتووی وەحدەتی وجوودە، بۆ شەرحی قەترە واتە دڵۆپ بڕوانە شەرحەکانی پێشوو.

٤ ـ موضوع این رباعی بخشش ازلی خداوند و گناه ازلی آدم منظور است و باز بخشش خداوند نامحدود و گناه آدمی محدود است و اشاره به آیهٔ قرآن مجید که فرمود؛ (قُلْ یا عِبادِیِ الّذین اَسرَفُوا عَلی اَنْفُسِهِمْ لاتَقنُطُوا مِنْ رَحْمَتِ الله اِنَّ اللهَ یغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمیعاً اِنَّهُ هُوَ الغَفُورُ الرَّحیمُ) ؛ بگو ای بندگان من که اسراف کردید بر جان خویش نومید نباشید از رحمت خدا همانا خدا بیامرزد گناهان را همگی، همانا اوست آمرزگار مهربان. (۳۹/۵۳)

٤ ـ مەبەستی ئەم چوارینەیە بەخششی ئەزەڵیە لە لایەن خوداوەندەوە بۆ گوناهی ئادەم، هەروەها بەخشەندەیی خوداوەند، کە کراوەیە و گوناهی ئادەم کە بەسراوەیە و ئاماژەیە بۆ ئایەتی قورئانی پیرۆز کە دەفەرمووێ؛ بڵێ ئەی بەندەکانی من کە ئیسرافتان کرد بە گیانی خۆتان نائومێد مەبن لە رەحمەتی خودا، چونکە خودا بەخشەندەیە و گوناهەکانی هەمووان دەبەخشێ و میهرەبان و بەخشندەیە.

# وەرگێڕاوی كوردی و شەرحی
# فارسی و كوردیی شیعرە توركییەكان

**غەزەلەكان، ٦ پارچە**

**پێنجخشتەكییەكان، ٤ پارچە**

(۱)

نـگارا! ملک جسـمم کنز عشـقک چون خـراب[۱] ایتدم
انـی جانـی یرینـه، قلبـده نایـب منـاب ایتـدم
درون سـینه‌می پـاک ایلدیـم اغیـار نقشـندن
گوگلی کاشانه‌سـن عشـقرخک چون مسـتطاب ایتدم
بیابـان طلبـده، پرتـو حسـنک شـعاعندن،
تنـم باشـدان باشـه جوالـه مـوج سـراب ایتـدم
شـراب نـاب گـر میـل ایلسـم، معـذور دوت زاهـد!
کـه بـن، میخانـه‌ده، پیـر مغانـه انتسـاب ایتـدم
جهانـک گلشـنینه گلممـش[۲] حسـنک گبی بیـر گول
آنکچـون عالـم ایچره عشـق حسـنک انتخـاب ایتدم
حسـاب سـقف گـردون اولاسـه، همتـم نولـه[۳]
کـه عمـــرم صـرف راه بیـر شـه عالیجنـاب ایتـدم
مدارس ایچره خالص گویرمدیم بن عشـق[۴] سوداسـک
انکچـــون عـلممـی میخانه‌ده رهـن شـراب ایتـــدم

---

۱ . خرابات
۲ . کلممش
۳ . شیعرن وزنی ناتمام دور
٤ . عاشق

**(١)**

هۆ دڵبەرەکەم! من ملّکی لەشی خۆم لە عیشقی تۆدا وەک خەرابات[١] لێکرد
ئـەوم لـە جـیـاتی گـیـان، لـە دڵـمـدا کـردە خـاوەن دەسـەڵات
نـاو سـینـگـی خـۆم لـە نـەخـشـی بـێـگـانـە پـاک کـردەوە
ماڵی دڵـم لـە عیشقی ڕووی تـۆدا وەک شتێکی پاقژ لێکرد
لـە سـەحـرای داخـوازیـدا، لـەبـەر تـیـشـکـی جـوانـیـی تۆ
سـەرتـاپـای لـەشـی خـۆم حـەواڵـەی شـەپـۆلی تـراویـلـکـە کـرد
ئەی زاهید! ئەگەر مەیلی شەرابی بێ خـەوش بکەم، لێم ببوورە
مـن لـە مـەیخـانـە پـێـوەنـدیم بـە پـیری مـوغـانـەوە کـرد
لە گوڵستانی جیهاندا هیچ گوڵێک وەک گوڵی جوانیی تۆ نەهاتووە
لـەنـاو عـالـەمـدا بـۆیـە عیشقی ڕازاوەیـی تـۆم هـەڵـبـژارد
چ دەبـێـت ئـەگـەر هیممەتی مـن ببێتە چـرای میچی گـەردوون
کـاتێ مـن تەمەنی خـۆم بەختی شاهێکی دەرگـانـە بـەرز کرد
لەنـاو قوتابخانەکاندا ئەی "خالص"! کەسێکم نەدی کە عاشقی سەودای تۆ بێت
لەبەر ئـەوەیە زانسـتی خـۆم لە مـەیخانە کـردمە بـارمتەی شـەراب

١ . دەبێ نیاز لە «وێرانە» بێت نەک خەراباتی مەیخانە

## شرح فارسی و کردی غزل ۱
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۱

عشق؛ رک شرح‌های پیشین
عیشق؛ بڕوانە شەرحەکانی پێشوو

خرابات؛ خرابات به معنی شراب‌خانه و در اصطلاح عبارت است از خراب شدن صفات بشری و فانی شدن وجود جسمانی و خراباتی مرد کامل است که از او معارف الهی به اختیار صادر می‌شود. (اصطلاحات فخرالدین عراقی)
خەرابات؛ بەمانای شەراب‌خانە و لە ئیستیلاحدا عیبارەتە لە ڕووخانی سیفاتی بەشەری و فانی بوون و لە ناو چوونی وجوودی جیسمانی و خەراباتی؛ ئینسانی کامیلە کە مەعارفی ئیلاهی بێ ئێختیار لەوەوە سەر دەدا. (ئیستیلاحاتی فەخرەدینی عەراقی)

درون سینه‌می پاک ایلدم اغیار نقشندن؛ درون سینه‌ام را از نقش اغیار پاک کردم

گوگلی کاشانه سن عشقرخک چونمستطاب ایتدم؛ خانۀ دلم را با عشق روی تو پاکیزه کردم

دەروونی سنگی خۆم لە وێنەی بیانی پاک کردووەتەوە ، خانووی دڵی خۆم بە عیشقی ڕووی تۆ پاک و خاوێن کردووەتەوە ـ مەبەست لە م شیعرە تێپەڕاندنی قۆناغی تەخلییە و تەجلییەیە، سولووکی عارفان لە بازنەی ناوەندی سێ قۆناغە، یەکەم تەخلییە، واتە خاڵی بوون لە عەلایق و پێوەندی و غەرایزی بەشەری و جیسمانی، دووەم تەجلییە، واتە خۆڕازاندنەوە بە سیفاتی ڕۆحانی و ئیلاهی، لە دوای ئەم دوو قۆناغە سالیک ئامادەی تەجلییەیە کە بتوانێ وەک ئاوێنە لە تیشکی نووری خودایی بەهرەمەند ببێ.

سراب ایتدم؛ سراب کردم. سراب را به مقتضای قافیه آورده و مقصود دریاست.

سەرابم کرد، یا کردم بە سەراب وشەی سەراب لێرەدا بە هۆی قافیەی شیعرەکەوە هاتووە و مەبەست «دەریایە»

شراب: رک شرح‌های پیشین

شەراب: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو

میخانۀ: رک شرح‌های پیشین

مەیخانە: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو

پیر مغان: رک شرح‌های پیشین

پیری موغان: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو

مداریس ایچره «خالص» گویرمدیم بن عاشق سوداسک؛

«خالص» گوید در مدرسه‌ها کسی که عاشق سودای تو باشد، ندیدم.

«خالص» دەڵێ؛ لە مەدرەسە و قوتابخانەدا کەسێکم نەدیوە کە عاشقی سەودای تۆ بێ،.

هەموو سالیکانی عارف کۆکن لەسەر ئەوە، کە خوداوەند لە کتێب و مەدرەسەدا نادۆزرێتەوە، خودا بە سولووک و لە دڵدا ئاشکرا دەبێ، ئەو خودایە کە بە کتێب پەیدا بێ خۆت بۆ خۆت دروستت کردووە و بە کتێبیش دەڕووخێ ، چونکە زانست زەمینییە و ئاڵوگۆڕ بەسەر بیروڕای بەشەردا دێ، بەڵام دڵ بەردەوامە.

(۲)

عشـــق اولــوب روز ازلدن ســاقی پیمانه‌مز[1]
عالمــی غوغایه ســالمیش[2] نعره مســتانه‌مز
عالمی جاندن شراب وصلدن مست اولمشز
ســـر[3] وحدتــدر همیشــه بــاده میخانه‌مــز
مظهــر نــور جمالــک قبلــه در عاشــقلره
اول جمالــک پرتونــدن کعبــه‌در میخانه‌مز
مطلعی هر ذره‌دن تابــان اولوب اهل آفتاب
عشق چشــمیله تماشــا ایلروز چمخانه[4] مز
رند و رســوای قلندر مشرب اولدق عشقدن
عالمی باشــدن باشه دوتمش بزیم افسانه‌مز
شمع و کله[5] چونکه مظهرلر دور اول جانانیه
کوکلمیز بلبل اولــوب جانلر اولوب پروانه‌مز
دام زلفــک دانــه خالــک اولــوب زنجیرمز
یوقــه، یوقدر عالمــی دنیــاده آب و دانه‌مز
پنجه یســللر درگه «خالص» هجریله[6] ظلمتده در
شــمدی فیض وصلدن روشــن اولوب کـــاشانه‌مز

۱ . میخانه‌مز
۲ . صالمش
۳ . شد (راء) ایله
٤ . جم‌خانه
٥ . شد (لام) ایله
٦ . همجریله

**(٢)**

عیشق هەر لە ڕۆژی سەرەتاوە بووەتە ساقیی پەیمانەی ئێمە
نەعرەتەی سەرخۆشانەی ئێمە عالەمی خستۆتە گێژاوەوە
لە عالەمی گیاندا، سەرخۆشی شەرابی وەسڵ بووین
بادەی ناو پەیمانەی ئێمە هەمیشە نهێنیی وەحدەتە
سەمبولی نووری ڕوخسارت ڕووگەی عاشقانە
لەبەر شەوقی ئەو ڕوخسارە، مەیخانە بووەتە کەعبەی ئێمە
هەتاوێ لە شوێنی سەرهەڵدانی هەموو زەڕڕەیەک، درەوشاوەتەوە
ئێمە بە چاوی عیشقەوە سەیری جەمخانەی[1] خۆمان دەکەین
بەهۆی عیشقی تۆوە بووین بە ریندو ناوزڕاوی قەلەندەر خوو
ئەفسانەی ئێمە ئەم سەر تا ئەو سەری عالەمی پڕ کردووە
لەبەر ئەوەی شەم و گوڵ نمانای ئەو گیانانەن،
دڵمان بووەتە بولبول و گیانمان بووەتە پەپوولە
داوی زوڵفت لێمان بووەتە زنجیری سەر دانەی خاڵت
دەنا[2]، لە هەموو عالەمی دنیادا ئاو و دانێکمان نییە
پەنجا ساڵە[3] کە «خالص» لە دووریی[4] تۆ کەوتۆتە تاریکییەوە[5]
بەڵام ئێستا لە فەیزی وەسڵی تۆوە ماڵمان ڕووناک بۆتەوە

١ . لە دەقی چاپیدا «اجم خانە» هاتووە

٢ . لە دەقەکەدا «یوقە» نووسراوە بەڵام بە بۆچوونی من، دەبێ «یوقسە» بێت، بە واتای «دەنا»ی کوردی

٣ . «پنجە یسللر» نووسراوە

٤ . لە دەقەکەدا «همجریلر» نووسراوە کە دەبێ هەڵە بێت. من بە «هجریلە»م خوێندۆتەوە

٥ . «پنجەیسللر درگە خالص همجریلە ظلمتدەدر» بەڵام من بەم شێوەیەی دەخوێنمەوە: «پنجە یللردور کە خالص هجریلە ظلمتدە دور»

## شرح فارسی و کردی غزل ۲
شەرحی فارسی و کوردی غەزەلی ۲

عشق اولوب روز ازلدن ساقی پیمانەمز...

عشق از روز ازل ساقی پیمانهٔ ما شد؛... اشاره به آیهٔ قرآن مجید است که فرمود؛ الست بربکم قالوا بلی، آیا من خدای شما نیستم، گفتند بله، به نظر و اندیشهٔ عارفان از همان روز خداوند برای عشق خود جهان را آفرید و با عشق آفرینش را آغاز کرد و به آدم "اسماء" را تعلیم داد. در آنجا سخن از دانش و کتاب نشد. دانش و کتاب ساخته و پرداختهٔ ذهن بشر است.

عیشق لە رۆژی ئەزەلەوە بوو بە ساقیی پەیمانەی ئێمە...

ئاماژە بە ئایەتی قورئانی پیرۆز دەکا، کە دەفەرمووێ، «**ألست بربکم قالوا بلي**». ئایا مِن پەروەردگاری ئێوە نیم؟ وتیان بەڵێ. بە بیرورای عارفان ئەو رۆژە خوداوەند جیهان و ئادەمی بۆ عیشقی خۆی خولقاند و بە عیشق ، ئافراندنی دەست پێ‌کرد و ئەسمای فێری ئادەم کرد، لەوێدا باسی عیلم و کتێب نەکرا، عیلم، کتیب بیروڕای مرۆڤ پێکی هێنا.

عالمی جان؛ جهان باقی / شراب وصل؛ آنچه سالک را به حق می‌رساند.
سرّ وحدت؛ راز یگانه بودن حقّ که سرچشمه و منشأ کثرت است.
بادهٔ میخانه؛ رک به شرح‌های پیشین
عالەمی جان؛ جیهانی نەمری / شەرابی وەسڵ؛ ئەوەی کە سالیک بە حەق رێنموونی دەکا
سرری وەحدەت" نهێنییەکانی یەکدانەیی ؛ ئەو نهێنییەی حەق، کە سەرچاوەی لایەنە بەرفراوان و جیاوازییەکانە.
بادەی مەیخانە: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو.
مظهر: محل ظهور ذره‌ی الهی، نورجمال؛ درخشش از زیبایی
عاشق: سالک در مرحلهٔ سلوک
مەزهەر: جێگەی ئاشکرا بوونی زەڕەی ئیلاهی، نووری جەمال؛ درەوشانەوەی جوانیی

پرتو جمال: سایه‌ای از زیبایی، کعبه؛ نشانی از حق
میخانه: جایگاه گفتگو با حقّ، رک شرح‌های پیشین
پەرتەوی جەمال: سێبەرێ لە جوانیی خوداوەند، کەعبە؛ نیشانەیێک لە حەق
مەیخانە: جێگەی وتووێژ لەگەڵ خوداوەند، بۆ ئاگاداریی زۆرتر، بڕوانە شەرحەکانی پێشوو

مطلعی هر ذرەدن تابان اولوب اهل آفتاب؛ اهل آفتاب از مطلع هر ذره‌ای درخشیده است.
عشق چشمیله تماشا ایلروز جم‌خانه‌مز: ما با چشمِ عشق به جمخانهٔ خود نگاه می‌کنیم.

تمام ذرات جهان در نظر عارف سالک جایگاه طلوع ذره‌ای از نور خداوند است و هر ذره مأموریتی دارد. هیچ ذره‌ای خالی از نور حق نیست. با حرکت هر ذره تمام ذرات جهان جابه‌جا می‌شود با تمام کثرت و تفاوت‌ها. در نهایت همهٔ اعضای جهان زمین و آسمان و کهکشان با هم هماهنگ هستند و جناب خالص در اینجا به "جمخانه" عبادتگاه علویان اشاره فرموده و شاید نخستین شاعر عارف باشد که از این عنوان استفاده کرده است. جم در لغت به معنی "درخشان" که در کتاب "ودا" به آن اشاره شده است، زیرا با چشم علم "شرع" نمی‌شود به "جم" نگریست.

ئەهلی خۆر! لە هەر جێگەی سەرهەڵدانی هەموو زەڕەیەک، درەوشاوەتەوە ـ ئێمە بە چاوی عیشقەوە سەیری جەمخانەی خۆمان دەکەین.

تەواوی زەڕاتی جیهان لە بیروڕای عارفی سالیکدا، شوێنی سەرهەڵدانی زەڕەی نووری خوداوەندە و هەر زەڕەیەک بە شوێنی ئیش و کارێکدا دەڕوا، هیچ زەڕەیەک لە نووری خوداوەند خاڵی نییە. بە جێگۆڕینی هەر زەڕەیەک هەموو زەڕاتی عالەم جێ دەگۆڕێ، لەگەڵ هەموو ئەو جیاوازی و کەسرەت و بـڵاویە کە لە جیهاندا هەیە لە نیهایەتدا هەموو ئەندامی عالەم؛ زەمین و ئاسمان و ئەستێرەکان و... لەگەڵ یەکدا یەک دەنگ و هاوڕێ و هاوئاهەنگن. حەزرەتی «خالص» لەم شیعرەدا ئاماژەی بە

"جم‌خانه" عیبادەتگای عەلەویەکان کردووە و دەبێ یەکەمین شاعیری عارف بێ کە لە کوردستاندا ئەم عینوانەی بەکارهێناوە، «جەم» بە مانای «درەوشاوە» کە لە کتیبێ «ودا» ئاماژەی پێ کراوە، چونکە بە چاوی عیشقەوە دەنوارێ بو «جەم‌خانە» کە بە چاوی عیلمەوە واتە "شەرع" ناکرێ بۆ «جەم» بنواڕی...

رند: رک شرح‌های پیشین / قلندر: رک شرح‌های پیشین
رند؛ بڕوانە شەرحەکانی پێشوو. قەلەندەر: بڕوانە بشەرحەکانی پێشوو
شمع و کله چون که مظهرلر در اولجانانیه؛ برای آن که شمع و گل نمایانگر جانان هستند.
کوکلمز بلبل اولوبجانلر اولوب پروانه‌مز؛ دل ما بلبل و جان ما پروانه شد.
این بیت به عرفان اهل حقیقت "یارسان" یا "علویان" برمی‌گردد و از اصطلاحات ویژهٔ آنهاست، چون در بیت پیش نیز به جم‌خانه اشاره کردند، در این بیت به زیبایی واژگان را برگزیده است.
لەبەر ئەوەی شەم و گوڵ نمانای ئەو گیانانەن
دڵمـــان بۆتە بولبول و گیـــانمان بۆتە پەپوولە
ئەم شیعرە ئاماژە بە عیرفانی ئەهلی حەقیقەت، "یارسان" یا "عەلەوییەکان" دەکات و ئیستیلاحی تایبەتی ئەو مەکتەبەیە. بە گوێرەی ئەوە، کە لە دێڕەکانی پێشوودا، ئاماژەی بە «جەم‌خانە» کردووە، لەم دێڕە بە جوانی وشەکانی هەڵبژاردوە.

زلف: رک شرح‌های پیشین. خال: رک شرح‌های پیشین
زولف: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو. خال: بڕوانە بۆ شەرحەکانی پێشوو

یوقسه یوقدر عالمی دنیاده آب و دانه‌مز: وگرنه در همهٔ دنیا آب و دانه‌ای نداریم.
مرغ جان از آب و دانهٔ جهان سیر است. او غذای روح می‌خورد و از دانه و آب جمال تغذیه می‌کند که چینه از خاک در مقام او نیست.
دەنا، لە هەموو عالەمی دنیادا ئاو و دانێکمان نییە...
مەلی گیان لە ئاو و دانەی جیهان تێر بووە و لە خۆراکی ڕۆح دەخوا و لە ئاوو

دانەی جوانی و جەمالی حەق هێز و توانا وەردەگرێ لەبەر ئەوەی کە خواردنێ، کە لە خۆڵ و خاک بێ دووره لە پلە و پایەی ئەو.

پنجه یللردور که خالص هجریله ظلمتده دور: پنجاه سال است که «خالص» از دوری تو در ظلمت و تاریکی است.
شمدی فیض وصلدن روشن اولوب کاشانه‌مز: اما اکنون از فیض وصل تو کاشانهٔ ما روشن شده است.
روشنی = نور و ظلمت نیز به اندیشهٔ عرفانی بیت‌های پیش برمی‌گردد. پنجاه سالگی در نظر اهل عرفان و حکمت پایان راه و مرحلهٔ سرنوشت‌ساز است.
شیخ اجل سعدی می‌فرماید: ای که پنجاه رفت و در خوابی...
که جناب خالص تثبیت آن را اعلام کرده و خود را در کاشانهٔ روشن می‌بیند.
پەنجا ساڵە کە «خالص» لە دووریی تۆ کەوتۆتە تاریکییەوە
بەڵام ئێستا لە فەیزی وەسڵی تۆوە ماڵمان ڕووناک بۆتەوە
ڕووناکی؛ نوور و زوڵمەتیش دەگەڕێتەوە بۆ بیروڕای عیرفانی لە دێڕەکانی پێشوودا ، تەمەنی پەنجاساڵی بە بیروڕای ئەهلی عیرفان و حیکمەت کۆتایی ڕێگا و قۆناغی چارەنووسسازە.
شێخی گەورە سەعدی شیرازی دەڵێ:
ئەی ئەو کەسە کە تەمەنی پەنجاساڵیت تێپەڕاندوەو هەر نوستووی...
حەزرەتی «خالص» تێپەڕاندنی ئەو تەمەنە لە خۆیدا بە ڕووناکیی دڵ و گیان دادەنێ.

**(۳)**

**بو کیمدر شـــوکتیله رخش ناز اوزره ســـوار اولمش**
**سانورســـن[۱] جلوه‌سندن کیم قیامت آشکار اولمش**
**کلاهن کـــج قویوب پرچملرک رخســـاره داغتمش**
**کل اوزره سنبلســـتاندن عجب بـــر نوبهار اولمش!**
**قدی بر ســـرو در گیم گلشن حســـنه صفا ویرمش**
**اکا اربـــاب عشـــقک گوزیاشـــند[۲] جویبـــار اولمش**
**آلـــوب میدان حســـنن[۳] طـــوق ســـنجاق ملاحقله[٤]**
**ســـپـــــاه[٥] خوبلـــر اوزره امیـــر نـــــامـــدار اولمـــش**
**ســـنی[٦] «خالص» نه تنها سور عشـــقک قلبی داغ ایتمش**
**بـــــو آتش ایچـــــره چـــون ارباب همت داغــــــدار اولمش**

---

۱ . صانورسن
۲ یاشدن
۳ . حسن
٤ . مسلاحقله
٥ . سیاه
٦ . سنی، شد(نون)ایله

**(٣)**

ئــەوە کێیە بــە شــەوکەتەوە ســواری ڕەخشــی[1] نــاز بووە؟
دەڵێــی بەهــۆی جیلــوەی ئــەوەوە قیامــەت دەرکەوتــووە
کـڵاوی خوار داناوە و پەرچەمی بەسەر ڕوخساریدا بـڵاو کردۆتەوە
سونبولســـتان لەســـەر گوڵ، بووەتە بەهارێکی سەیر و سەمەرە
بــاڵای ســەروێکە ســەفای بەخشــیوەتە گوڵشــەنی جــوانی
لــە فرمێســکی چــاوی عاشــقانەت بووەتــە جۆگەلــە ئــاو
گۆڕەپانی جوانیت تەوق[2]ی سنجاقی بە پەیوەستەکانییەوە گرتووە
لەسەر سوپـــای خـــاسان، بـــووەتە ئـــەمیری نـــاودار
ئەی «خالص»! عیشــق تەنیــا هەر دڵی تــۆی داغ نەکردووە،
گەلێــک[3] خـــاوەن هیممەتان لە م ئاگــــرەدا داغدار بوون

١ . «ڕەخش» ئەسپی ئەفسانەیی ڕۆستەم پاڵەوانی شاهنامە بووە.
٢ . تەوق: نیشانە و عەلامەتێکە لەسەر داری سنجاق دەدرێ.
٣ . لە دەقەکەدا «چون» هاتووە بەڵام من وەک «چۆخ»م خوێندۆتەوە بە واتای «زۆر»

## شرح فارسی و کردی غزل ۳
شەرحی فارسی و کوردیی غەزەلی ۳

بوکیمدرشو کتیله رخش نازاوزره سوار اولمش؟
سانورسن جلوه سندن کیم قیامت آشکار اولمش
کیست که با شوکت بر رخش ناز سوار شده است؟ گویی به هوای جلوهٔ او قیامت آشکار شده است.
رخش: از نمادهای عرفانی و اسطوره‌ای در شاهنامهٔ فردوسی و سوارهٔ او نماد انسان کامل است.
ناز: ناز قوت دادن معشوق است عاشق خود را در عشق و بعضی گفته‌اند فریب دادن معشوق است عاشق خود را. (کشاف، ص ۱۵٦۳)
شوکت: آرایش فریبندهٔ این جهانی. حافظ گوید؛
در کوی عشق شوکت شاهی نمی‌خرند..
جلوه: رک شرح‌های پیشین، قیامت: روزی که تمام مقامات آشکار شود.
ئەوە کێیە بە شەوکەتەوە سواری ڕەخشی ناز بووە؟
دەڵێی بەهۆی جیلوەی ئەوەوە قیامەت دەرکەوتوە.
رەخش: لە سەمبولەکانی عێرفانی و ئەفسانەکان لە شانامەی فیردوسیدایە و ئەوە کە سواری رەخش دەبێ نومادی ئینسانی کامیلە.
ناز: ناز هێز و تەوانا دان بە مەعشووقە لە لایەن عاشقەوە و برێ کەس وتوویانە فریودانی مەعشووقە لە لایەن عاشقەوە. (کشاف، ص ۱۵٦۳)
شەوکەت: رازاندنەوەی فریودەری ئەم جیهانییە، حافز دەڵێ؛
لە کۆڵانی عیشقدا شەوکەتی شایی ناکرن...
جیلوە: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو، قیامەت: ئەو رۆژە کە هەمووی پلە و پایەکان دەردەکەوێ

کلاهن کج قیوب پرچملرک رخساره داغتمش؛ کلاه کج نهاده و پرچم زلف را بر رخساره پخش و پریشان کرده است.

در این بیت به یاد غزل حافظ می‌افتیم که؛

... نه هر که طرف کُله کج نهاد و تند نشست      کلاه‌داری و آیین سروری داند

زلف: کفر ، رخساره: ایمان.

پنهان داشتن ایمان شیوهٔ مکر است.

کـڵاوی خوار داناوه و پەرچەمی بەسەر ڕوخساریدا بـڵا کردۆتەوە...

ئەم شیعرە دەمانخاتە بیری ئەو غەزەلەی حافز کە دەڵێ؛ ، جاخۆ هەرکەسێ کـڵاوی خوار دانا و بە قینەوە دانیشت پاشایەتی و ئادابی گەورەیی نازانێ.

زولف: کوفر، ڕوخسار: ئیمان.

شاردنەوەی ئیمان شێوەی مەکرە؛ لەم غەزەلەدا «خالص» تەعریزیکی بۆ سەر عارفێ هەیە کە تازە بە پلە گەییشتوە.

آلوب میدان حُسن...

میدان زیبایی و حسن تو طوق فرمانروایی را با بایسته‌هایش گرفته است. بر لشکر خوبان، امیری و فرماندهی نامدار شده است.

این بیت شاهد بر آن‌است که، شاعر اشاره به سالکی دارد که تازه به مرحلهٔ کمال رسیده است و در پی مبارزه و مقابله با مردان راه می‌باشد. در دایرهٔ سلوک و عرفان نیز چون اصل بر تقرب‌جویی است بر پایهٔ قرآن مکر و رقابت و نه حسادت بلکه غبطه وجود دارد و در عالم باطنی، مردان با هم نبردها دارند.

ئەم دێڕە شاهیدە کە، شاعیر ئاماژەی بۆ سالیکێکە کە تازە بە پلە گەیشتووە و بە دوای کێبەرکێ و بەربەرەکانی لەگەڵ هاوڕێیان، لە بازنەی سولووک و عیرفاندایە لەبەرئەوەی بنەما لەسەر نزیک بوونەوە لە خوداوەندە بە ڕێبازی قورئان مەکر و رقابەت و نەک حەسادەت بەڵکو غیبتە هەیە و لە عالەمی باتنی‌دا پیاوانی کامیل شەڕ و کێبەرکێ دەکەن.

ارباب همت: انسان‌های دستگیروکامل.

ئەربابی هیمەت: ئینسانە کامیل و دەسگیرەکان.

(٤)

صفـای قلبـه حسـن عالـم آرادان جلا گوسـتر[1]
جفـای درده هجـر نـور وصلکـدن دوا گوسـتر
جمالـک صیقلنـدن سـیل غبـار دیـده قلبـک
وصالـک گورمکـه، آئینـه گیتـی نمـا گوسـتر
وفـاده، بـن ازلـدن ایتمشـم پیوندنـی میثـاق
کرم قیل من عنایت گوشه‌سـندن بیر وفا گوسـتر
کمـال سـر[2] حسـنک دور ایـدر ذرات عالمـده
بزه، اول سـری[3] گورمک چو، لقادن بیر ضیا گوسـتر
خرابـات اهلنـک بزمنـده، جـام وصلـدن جانـا!
بـو غملـو مفلسـه بـر جرعه‌دن نـور لقا گوسـتر
وجـودم لجـه[4] اسـرار عشـقندن فنـا گورمـش
لقـانـک پرتونـدن اول فنـادن بیـر بقا گوسـتر
آرتمش بـوته عشـقنده «خالص» قـلنک مسن
خبر ویرمک ایچون اکسـیر نظردن کیمیا گوسـتر

---

١ . کوستر
٢ . شد /راء/ ایله
٣ . شد /راء/ ایله
٤ . شد /جیم/ ایله

**(٤)**

لــەو جوانییــەی وا عالەمــی ڕازاندۆتــەوە، گرشــەیەک بــۆ ســەفای دڵ بنوێنە
لــە نــووری وەســڵی خۆتــەوە دەرمــان بــۆ جەفــای دەردی دووری بنوێنــە
بــە بریقــەی جەمالــت تــۆزی ســەر چــاوی دڵ بســڕەوە
بــۆ دیتــنی ویســاڵت ئاوێنــەی جیهــان نومــا بنوێنــە
مــن لــە ئەزەلــەوە پەیمــانی وەفــاداریم بەســتوە
کــــەرەم بکـــە و لــە قوژبــنی عینایەتــەوە[1] وەفــــایــەک بنوێنــە
کەمــالی نهێنییــەکانی جوانیــی تــۆ بــە دەوری زەڕڕاتی عالەمــدا دەگەڕێــت
لە لیقای خۆتــەوە نوورێکمان بۆ بنوێنە بۆئەوەی بتوانین ئەو نهێنییە ببینین
گیــــانەکــــەم! لەنــــاو بەزمــی ئەهلــی خــەراباتــدا، لە جــامی وەســڵ
بــۆ ئــەم موفلیســە خــــەمبــارە چـــــۆڕێــک نـــــووری دیــدارت بنوێنە
وجــوودی من لە قووڵایی دەریای نهێنییەکانی عیشــقدا تووشــی فەنا بووە
بــــەهــۆی تیشــکی ڕوخســارتــەوە، لــەو فــەنایــەوە بەقایــەک بنوێنــە
«خـــــــالـص» لــە بۆتــەی عیشــقــدا نەمــاوە.
بــە خێــری خــۆت لــە ئیکســیری نیــگات کیمیــای بــۆ بنوێنــە

---

١ . «من عنایت گوشەسندن». ئەو «من» هم بە «من» ی عەرەبی خوێندۆتەوە بە واتەی «لە»

## شرح فارسی و کردی غزل ٤
شەرحی فارسی و کوردی غەزەلی ٤

**صفـــــای قلبه حســن عالــم آرادان جلاگوســتر**
**جفـــــای درده هجــر نــور وصلکدن دواگوســتر**
**درخششـــی بــرای جــلاو صفــای دل بنمــا**
از نور وصل خودت درمانی برای جفای درد دوری بنما.
این غزل از عارف منتهی و منتظر به رسیدن اوج کمال صادر می‌شود که تمام مراحل سیر و سلوک را طی کرده و خواستار دریافت ذرهٔ نور الهی است.
لەو جوانییەی وا عالەمی ڕازاندۆتەوە، گرشەیەک بۆ سەفای دڵ بنێرە
لە نووری وەسڵی خۆتەوە دەرمان بۆ جەفای دەردی دووری بنێرە
ئەم غەزەلە لە عارفێ، کە بە کۆتایی سولووک گەییشتوە و چاوەڕێیە، سەرهەڵدەدا، کە هەموو قۆناغەکانی سەیر و سولووکی تێپەڕاندوە و خوازیاری وەرگرتنی زەڕەی نووری ئیلاهیە.

**جمـــالک صیقـــلندن سیل غبـــار دیدهٔ قلبــک**
**وصـــالک کور مــکه آینـــهٔ گیتی نما گـــوســتر**
**با درخشــش جمالت غبار دل را بــردار و پاک کن**
**بـــرای دیــدن وصـــالت آینهٔ جهان‌نما بفرســت**
مصرع اول نشان قبض است و خواستار بسط است که زنگار از دل بردارد. این اشاره به آن معنی نیست که دل پاک نشده است، بلکه هر چه دل پاک باشد و بیرنگ تا ذرهٔ نور الهی در آن ندرخشد، جلوه‌ای نمی‌یابد.
دێڕی یەکەمی نیشانەی قەبزە و خوازیاری کرانەوەیە تا ژەنگی دڵ بە نووری جەمالی حەق بسڕێتەوە. ئەمە ئاماژە بەو مانایە ناکا کە دڵپاک نەبووەتەوە، بەڵکو هەرچەندیش دڵپاک و خاوێن بێ تا زەڕەی نووری ئیلاهی لەودا نەدرەوشێتەوە جیلوەی نابێ.

**وفــــاده بن ازلدن ایتمشــم پــیوندنی میثـــاق**
**کــرم قیل من عنایت گوشه‌ســندن بر وفاگوســتر**
**مـــــن از ازل پیـــــمـان وفـاداری بســتـــه‌ام**
**کـــــرم کــن و از گوشــهٔ عنایــت وفــایــی بنمـا**

اشاره به این که روح انسان کامل در روز ازل زمان بی‌آغاز بنیاد جهان بر پایه عشق، حضور داشته و خواستار به پنهان دریافتن عنایت آن وعدهٔ ازلی است.

من له ئه‌زه‌له‌وه په‌یمانی وه‌فاداریم به‌ستوه

که‌ره‌م بکه و له قوژبنی عینایه‌ته‌وه وه‌فایه‌ک بنوێنه...

ئاماژه به‌وه‌یه‌که رۆحی ئینسانی کامیل له رۆژی ئه‌زه‌ل، یان زه‌مانی بێ‌سه‌ره‌تا، که بناغه‌ی جیهان له‌سه‌ر کۆڵه‌که‌ی عیشق دانروه حوزووری هه‌بووه و خوازیاره به شێوه‌ی شاراوه وه‌فایه‌کی بۆ بنوێنی. وه‌فا: به‌ڵگه‌ی دڵنیایی.

**کمـــال ســرّ حســنک دور ایــدر ذرّات عالمــده**
**بــزه اولســری گومکچــون لقــادا ن بیــر ضیــا گوســتر**
**ســرّ کمال زیبایی تو به دور ذرات عالم در گردش اســت**
**از لقای خودت برای ما نوری بنما که بتوانیم آن سرّ را ببینیم**

سرّ ذات الهی را عارف در زیبایی جهان جستجو می‌کند و برای دریافت دیدن آن راز، نیازمند نور حقّ است. راز حق را با نور حقّ می‌توان دید.

که‌مالی نهێنییه‌کانی جوانیی تۆ به ده‌وری زه‌ڕاتی عاله‌مدا ده‌گه‌ڕێت

له لیقای خۆته‌وه نوورێکمان بۆ بنوێنه بۆ ئه‌وه‌ی بتوانین ئه‌و نهێنییه ببینین

عارف له جوانیی جیهاندا بۆ نهێنیی زاتی ئیلاهی ده‌گه‌ڕێ و بۆ وه‌رگرتن و بینینیی ئه‌و نهێنییه پێویستیی به نووری حه‌قه، چونکه نهێنیی حه‌ق به نووری حه‌ق ده‌بینرێت.

(۵)

خوبلر روبنده[۱] حسنک آشکارا ایلمش
عاشقک چشمندن اوز حسنک تماشا ایلمش
رویک اوزره زلف سکینک ساسل باغلیوب
عالمی دیوانه زنجیر سودا ایلمش
موکب حسنک صغنمز عالم آفاقده
بن عجب قالدم کوکلنده نیجه ماوا ایلمش
ماهوشلر صورتندن گوستررر رخسارنی،
هر بقن عاشقلری مجنون و رسوا ایلمش
عشق سوداسنده خالص علم و عقلندن کیچوب
آفرین اولسون بو قانونه که انشا ایلمش

۱ . روینده

**(٥)**

جوانیی تۆ، خۆی لە ڕوخساری خاساندا ئاشکرا کردووە
لە چـاوی عاشقانەوە سەیری جوانیی خـۆی کـردووە
بادراویی زوڵفت لەسەر ڕووت بە زنجیر بەستراونەتەوە و
عـالـەمـیـان کـردۆتـە شـێـتی زنجـیری سـەودا
ریزی سوارەی جوانیی تۆ لە عالەمی ئافاقدا جێی نابێتەوە
پـێـم سـەیـرە لـە دڵـدا چـۆن نیشتەجێ بـووە!
ئەوانەی ڕوویان وەک مانگە لە ڕوخساری تۆدا ڕوو دەنوێنن
هەموو عاشقێکی بینەری ئەوی شێت و نـاوزڕاو کردووە
«خالص» لە سەودای عیشقدا دەستی لە زانست و ئاوەز هەڵگرتوە
هـەی ئـافـەرم بـۆ ئـەو قـانـوونـەی وا داتـنـاوە!

**شرح فارسی و کردی غزل ٥**

شەرحی فارسی و کوردی غەزەلی ٥

**خـــــوبلـر روینده حســنک آشــکــــارا ایلمش**
**عاشــقک چشــمندن اوز حسنک تماشــا ایلمش**
**زیبایی تو، خود را در رُخسار خوبان آشکار کرده است**
**از چشــــم عـــاشقان به زیبایی خود نگاه کرده است**

این غزل نیز همان حکایت عشق مجازی و دیدن هنر الهی در چهرهٔ زیبارویان است که عارفان نگاه به رخسارهٔ زیبا را به قصد دریافت هنر خداوندی حلال می‌دانسته‌اند و گفته‌اند؛

**نظر بر منظر خوبان حلال است نظر بر صنع ذات ذوالجلال است**

جوانیی تۆ، خۆی لە ڕوخساری خاساندا ئاشکرا کردووە
لە چـاوی عاشقانەوە سەیری جوانیی خۆی کردووە

ئەم غەزەلە هەمان حیکایەتی عیشقی مەجازییە کە دیتنی هونەری ئیلاهی لە پرووەمەتی جواندایە، عارفان دیتنی ڕوخساری جوان بە مەبەستی زانین و وەرگرتنی هونەری خوداوەندییان بە حەلاڵ زانیوە و وتوویانە؛

نەزەر بۆ ڕوخساری جوانان حەلاڵە، چونکە دیتنی سونعی زاتی زولجەلالە

**مـــوکــب حســنک صغنمــز عـــالــم آفـــاقــده**
**بـن عجـب قالـدم کوکلـده نیجـه مـاوا ایلمش**
**صف ســوارهٔ زیبایی تو در آفاق عالم جا نمی‌گیرد**
**در شــگفتـــم چــگونه در دل جــــا گرفته است**

در اینجا صنعت ادبی به کار برده است و خطاب سخن را به سوی خداوند برگردانده است و اشاره دارد به حدیث لَمْ یسَعْنِی اَرْضِی وَ لا سمائِی وَ وَسِعَنی قَلْبُ عَبْدی الْمُؤْمِنِ اللَّینُ اَلْوَادِعُ. (احیاء العلوم، ج ٣، ص ١٢)

آسمان و زمین وسعت گنجایش مرا نداشتند، اما در قلب مؤمن جای گرفتم.

مولانای رومی می‌فرماید:

**گفت پیغمبر که حق فرموده است من نــگنجم هیچ در بـــالا و پست**
**در زمیــن و آسمان و عـــرش نیز من نگنجم این یقین دان ای عزیز**
**در دل مــؤمن بگنجــم ای عجــب گر مـــرا جویی در آن دل‌هــا طلب**

(مثنوی، ص ۷۰، س ٢٤) ← (احادیث مثنوی، بدیع‌الزمان فروزانفر، ص ٢٥)

ریزی سواره‌ی جوانیی تۆ له عاله‌می ئافاقدا جێی نابێته‌وه
پێــم سه‌یــره لـــه دڵـــدا چـــۆن نیشته‌جێ بـــووه

لێره‌دا هونه‌ری ئه‌دبی به‌کاربردوه و خیتابی گوازتۆته‌وه بۆ خوداوه‌ند و ئاماژه‌یه به‌و حه‌دیسه [قودسییه] که فه‌رموویه‌تی، من له ئاسمان و زه‌میندا جێم نه‌بۆته‌وه، به‌ڵام له دڵی ئیماندارادا جێم بۆته‌وه و مه‌ولانای رۆمی کردوویه به شیعر،که له به‌شه فارسیه‌که‌دا له‌سه‌ره‌وه ئاماژه‌م پێکردووه.

(٦)

شــاه اقلیــم ولایتــدر گــروه قــادری
راه عشــقده ذوالکرامتــدر گــروه قــادری
جملــه اربــاب طریقــت، بلبل شــوریده در
انلــره، بــاغ لطافتــدر گــروه قــادری
دامنک توتمش بولار ســلطان عبدالقادرک
مظهــر لطــف هدایتــدر گــروه قــادری
غوث محــی الدین احیــا ایلمــش دین نبی
رونــق دیــن رســالتدر گــروه قــادری
«کنت کنزا» قاپوسینی من عرف مفتاح ایله
فتــــح ایدن، شــاه ولایتدر گــروه قــادری
داخل اول وار اول کــرد همه بی‌تأمل خالصا
صــــاحب امــــن و امــانتدر گــروه قــادری

**(٦)**

دەسـتـەی قـادری شـاهـی نـاوچـەی ویلایەتن
دەستەی قادری لە ڕێگای عیشقدا خاوەن کەرامەتن
هـەمـوو خـاوەن تەریقەتان بولبولی پەشێون
دەستەی قـادری بۆ ئـەوان باخی نـەرم و نیانین
ئەوانە دەست لە داوێنی سوڵتان عەبدولقادر هەڵناگرن
دەستەی قـادری نومانای نەرم ونیانیی هیدایەتن
غەوسی محێدین، ئایینی پێغەمبەری زیندوو کردۆتەوە
دەستەی قـادری بـرەوی دینـی پـێغـەمبەرین
ئـەوەی وا دەرگـانـەی "مـن گـەنجـینـەم" بە
کلیلی «هـەرکـەس دەزانـێ»[1] دەکـاتـەوە
[تـەنیا] دەستەی قـادری، واتـە شاهی ویـلایـەتن
«ئەی «خالص»! بەبێ بیرلێکردنەوە بچۆ ناو دەستەیانەوە
دەستەی قـادری خـاوەن ئاسایش و ئـەمانـەتن»

---

١ . من عرف

## شرح فارسی و کردی غزل ٦
شەرحی فارسی و کوردی غەزەلی ٦

**شـــاه اقلیـــم ولایتـــدر گـــروه قـــادری**
**راه عشقده ذوالکرامتدر گروه قادری**

این غزل نمایانگر اعتقاد جناب خالص به حضرت عبدالقادر گیلانی و طریقت قادری است که ویژگی‌های خاص در بین طریقت‌های تصوف اسلامی دارد. یکم آن که خورشید ولایت حضرت عبدالقادر گیلانی به فرمودهٔ خودش هیچ گاه غروب نخواهد کرد. کما این که هنوز بالغ بر یکهزار و اندی سال است که همچنان در کشورهای اسلامی بیرق و طبل و ارشاد تکیهٔ قادری برقرار است و در طی این هزار سال طریقت‌های مهمی از میان رفته و اثری از آنها نمانده است. دوم در طریقت قادری به فرمودهٔ حضرت عبدالقادر گیلانی؛ شریعت شمع راه طریقت است و کاهی از شریعت کم شود، کوهی از طریقت گُم شود؛ که جناب خالص به لطافت تمام به آن اشاره فرموده و سوم، بشارت حضرت عبدالقادر است که مرید قادری اگر بارها از راه راست خارج شود، به همت باطنی خود، او را به راه می‌آورد و هیچ رهبر طریقه‌ای توان گفتن این سخن را نداشته و حاصل غزل نیز همین است. پیروان این طریقت در امن و آسایشند. ان‌شاءالله.

دەســـتەی قـــادری شـــاهی نـــاوچـــەی ویـــلایەتن
دەســـتەی قادری لە ڕێگای عیشـــقدا خاوەن کەرامەتن

ئەم غەزەلە نیشاندەری پێوەندی پتەوی حەزرەتی "خالص" بە حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی و تەریقەی قادرییەوەیە. ئەم تەریقەتە تایبەتمەندیی خۆی هەیە لە نێو تەریقەتەکانی تەسەووفی ئیسلامیدا. یەکەم ئەوەیە، کە خۆری ویلایەتی حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی بە فەرموودەی خۆی هیچ کاتێ ئاوا نابێ و تا ڕۆژی قیامەت بەردەوامە و بۆیە تا ئێستا هەزار و ئەوەندە ساڵە کە هەروەها لە هەموو مەمالیکی ئیسلامیدا بەیرەق و تەپڵ و ئیرشادی تەکیەکانی قادری بەردەوامە و لە

درێژایی ئەم هەزار ساڵەدا زۆر تەریقەتی بەهێز رووخاون. دووەم لە تەریقەتی قادریدا بە فەرموودەی حەزرەتی عەبدلقادری گەیلانی شەریعەت چرای ڕێگەی تەریقەتە و پووشێک لە شەریعەت کەم بێتەوە کێوێک لە ڕێگەی تەریقەتدا ون دەبێ ـ کە حەزرەتی خالص بە ناسکیی تەواوەوە ئاماژەی بەو خاڵە فەرمووە. سێیەم بەشارەتی حەزرەتی عەبدولقادرە، کە ئەگەر موریدی من بە چەن جاریش لە ڕێگە لابدا بە هیمەتی باتنی دەیخەمەوە سەر ڕێگەی تەریقەت، هیچکام لە ڕێبەرانی تەریقەت توانای دەربڕینی ئەم جۆرە وتەیان نەبووە، غەزەلەکەی حەزرەتی «خالص» ئەم خاڵە لە خۆ دەگرێ، کە شوێنکەوتووانی تەریقەتەکە لە ئەمن و ئاسایشدان، انشاءالله.

**(۱)**

**عجبـــا! دهره سالان، شور قیامت بومیدر؟**
**عـــالمه شـعله ورن عارض و قامت بومیدر؟**
**مســت ایدوب حاذب ارباب کرامت بومیدر؟**
**«عجبـا کـوکلمی صیدایلین ئافه‌ت بومیدر؟**
**بنی مجروح و پریشان ایدن آفت بومیدر؟»**
**پـردهٔ رویـن آچوب، جلوه ویرر عاشـقنه**
**گـز لو سویلشـمکله سـر[۱] دیور عـاشـقنه**
**ایتـدوب غمـزه شهلاســی اورور عاشـقنه**
**«کولـوب آلداتمغیله کور نه فیلور عاشـقنه**
**آه، خـــلاق ازل ویردیکی عـادت بومیدر»**

۱ . شد /راء/ ایله

**(١)**

سەیرە، ئەوەی وا ئاشۆبی قیامەتی خستۆتە جیهانەوە، ئەوەیە؟
ئەو دەموچاو و بالآیەی وا تیشک بە عالەم دەبەخشێت، ئەوەیە؟
هەر ئەوەیە، کە سەرخۆش دەکات و خاوەن کەرامەتان بەرەوخۆی دەکێشێت؟
«سەیرە، ئەوەی وا دڵمی ڕاو کردووە و ئافەتە، ئەوەیە؟
ئەوەی وا منی بریندار و سەرلێشێواو کرد ئەوەیە؟»
پەردەی ڕووت لاداوە، گرشە دەداتە عاشقەکەت
بە چاوی نهێنی، نهێنییەکان بە عاشقەکەت دەڵێت
خەمزەی چاوی کاڵت بە عاشقەکەت.
«سەیرکە فێڵی بزەت چۆن فیلو[١] عاشقەکەت
ئۆف، ئەوعادەتەی وا خولڵقێنەری ئەزەلی پێی بەخشیوە، ئەوەیە؟»

---

١ . مانای فیلورمان نەدۆزییەوە لەوانەیە مەبەست بێ: کە بزەت چ لە عاشقەکان دەکا.

## شرح فارسی و کردی مخمس ترکی ۱

شەرحی فارسی و کوردی پێنجخشتەکیی تورکی ۱

عجبا دهره سالان، شور قیامت بومیدر...

شگفت؛ آن که آشوب رستاخیز در جهان افکنده اوست؟

همه چیز به خدا برمی‌گردد و هر چه هست از اوست و عارف جز زیبایی از همه رنج و زشتی جهان ناسوتی چیزی نمی‌بیند. زیرا خداوند منشأ همهٔ زیبایی‌هاست. حال خوش، وصال، هجر و رنج، دافعه و جاذبه از اوست و به شیوهٔ اهل حکمت او را مخاطب قرار می‌دهد. این غزل زیربنای "جبری" دارد.

هەموو شتێ دەگەڕێتەوە بۆ خودا و هەرچی هەیە لە خوداوەندە، عارفیش جگە لە جوانی لە هەموو ڕەنج و ناحەزیی جیهانی ماددی چی‌تر نابینێت، چونکە ئەو سەرچاوەی هەموو جوانی و خۆشی و ویسال و دووری و ڕەنج و گرتنەخۆ و لە خۆجیاکردنەوەیە. بۆیە بە شێوەی ئەهلی حیکمەت ئەو بە موخاتەب قەرار دەدا، ئەم شیعرە ژێرخانی جەبریی هەیە.

پردهٔ روین آچوب جلوه ویرر عاشقنه...

پرده از رخسار برانداخته و درخشش به عاشقت داده‌ای

این بیت نشانه از سخن حافظ دارد که گفت؛

ناگهان پرده برانداخته‌ای یعنی چه؟   مست از خانه برون تاخته‌ای یعنی چه؟

تا زمانی که نور او به عاشق نرسد، عاشق جلوه نخواهد داشت. پس جلوهٔ عاشق از پرده برانداختن معشوق است و از خود نور و جلوه‌ای ندارد.

ئەم دێڕە ئاماژەیە بەو وتەیەی حافز کە دەڵێ؛

بەناگا پەردەت لا بردوە، ئەمە یانی چی؟

مەست لە ماڵەوە دەرپەڕیوی، ئەمە یانی چی؟

تا کاتێ کە نووری خوداوەند بە عاشق نەگا، عاشق جیلوەیێکی نابێ، کەوابێ جیلوەی عاشق پەردەلادانی مەعشووقە و خۆی نوور و جیلوەیێکێ نییە.

(۲)

## مخمس ترکی بر غزل فضولی سرودهٔ حضرت خالص

آتش عشــقک فروزان اولســه عـــاشق نار اولــور
حسنــکی آئینه[۱] دلده گـــورن هشیـــار اولـــور
هر زمان گوردوقجه[۲] عاشــق گوزلــرک خمار اولور
«حسنک اولدوجه‌فزون عشق اهلی آرتق زار اولور
حســن نه مقدار اولورســه عشــق او مقدار اولور»
جلــوه حســنن گــورر عاشــق در و دیــواردن
کعبـــه و بتخانــه فــرق ایلمــز اطـــواردن
زاهـــدا! منــع ایلمــه شــیدالری دیـــداردن
«جنــت ایچــون منع ایدن عاشــقلری دیــداردن،
بیلممــش کـــم جنتی عاشــقلرک دیــدار اولور»
بیلممــش واعظ نه مظهردن اولور عشــق اهلنک[۳]
یوقســه هر لحظه ســالردی[٤] اهل عشقه مسلنک
دوشمسه ســودایـــه، بیلمـــز قدر ذوق وصلنک
«زاهـــد خـــودبینانه[٥] ذوقـــنی عشق اهـــلنک[٦]
برعجب می در محبت، کیم ایچن، هشــیار اولور»
عشــق علمنـــدن، اولور اســراردن عاشــق فهیم
آتش عشــق ایچــره طراق اولمســه اولمز ســلیم
ایلمـــه عـــاشــقلک در دینه درمــان ای حکیم!
«عشــق دردندن اولور عاشــق، مزاجی مســتقیم
عاشــقن در دینــه درمان ایته‌لــر، درمــان اولور»

---

۱ . آینه

۲ . کوردقجه

۳ . آهلنک

٤ . صالردی

٥ . زاهدی خودبیلانه

٦ . آهلنک

عــاشــق رســوا چکر[1] ســودای عشــقک جورینی
لـــــذت[2] دیــدار بیلمــز چــکمســینلر هجــرینی
لجــه عشــقنده «خالــص» ضایــع ایتــدی علمنی
«عشق سودا سندهء صرف ایدی «فضولی» عمرینی
بیلمزم بــو خواب غفلتــدن هیجان بیــدار اولور»

۱ . جکر
۲ . لذتی

**(٢)**

پێنجخشتەکیی تورکی غەزەلی فزوولی هەڵبەستی حەزرەتی خالص

ئەگەر ئاگری عیشــقت گڕ ببەســتێت، عاشــق دەبێتــە ئــاگر
هەرکەس جوانیی تۆ لە ئاوێنەی دڵدا ببینێت، وشــیار دەبێتەوە
عاشــق هـــــەر کـاتێ چاوەکانــت ببینێت، ســەرخۆش دەبێت
«هەرچەندە جوانیی تۆ لە زیادی بدات، ئەهلی عیشــق زێتر زویر دەبن
جـــــوانی چـــەندە بێت، عیشــقیش هـــــەر ئەوەنـــــدە دەبێت!»
عاشــق دەرکەوتــنی جوانیی تۆ لە دەرک و دیــوارەوە دەبینێت
لــە کــار و کرداردا کــەعبــە و بتخانــە جیـــاوازییــان نییــە
ئــەی زاهید! خەڵکانی شــەیدای خۆت لە دیــدار بێبەش مەکە
«ئەوانــەی وا بــۆ خاتــری بەهەشــت دیدار لە عاشــقان دەســتێنن،
نـــــازانــن کــە بــەهەشــتی عاشــقان، هەمــان دیدار [ی یــار] ە»
واعیــز نەیدەزانی کە ئەهلی عیشــق لە کام نماناوە ســەر هــەڵدەدەن
دەنا هەموو دەمێک ڕێبازی خۆی دەخستە [سەر ڕێبازی] ئەهلی عیشق
هەرکـــەس نەکەوتبێتە ســەوداوە، قەدری زەوقی عیشقی تۆ نـازانێت
«زەوقـــــی ئەهلی عیشــق چـــــی بــەســەر زاهیـــــدی خـــــۆخواز داوە؟
خۆشەویستی شەرابێکی ســەمەرەیە، هەرکەس بیخواتەوە وشیار دەبێتەوە»
عاشــق بەهۆی زانســتی عیشــقەوە، لە نهێنییــەکان تێدەگات
لــە ئــاگــری عیشــقدا طـــــراق[؟] نەبێــت، ســالــم نابێــت
ئــەی حــەکیــم! دەردی عاشــقان دەرمــان مەکــە
«مــیــزاجــی عــاشــق بـــە دەردی عیشق ڕاســـت دەبــێــت
دەرمـــــــانی دەردی عــاشــق بــکــەن، دەرمــــان دەبــێــت»
عاشــقی نـــاوزڕاو جـــــەوری ســەودای عیشــق دەکێشــێت
کەسێک کە [دەردی] دووریی نەچەشتبێت، چێژ لە لەززەتی دیدار نابینێت
«خالــص» لــە دەریــای قووڵــی عیشــقدا زانســتی خــۆی فەوتانــد
فــزوولی" لە ســەودای عیشــقی تــۆدا تەمــەنی خۆی بەخــت کرد
نـــــازانم چـــــۆن لــە و خـــــەوی غــەفڵەتــە هــەڵــدەســتێت»

## شرح مختصر زندگانی شاعر غزل

کورته‌ی ژیانی شاعیری غه‌زه‌له‌که

### فضولی بغدادی:

محمد بن سلیمان بغدادی متخلص به فضولی از شاعران پارسی‌سرا و ترکی‌گوی سدهٔ دهم هجری است؛ شادروان دکتر محمدامین ریاحی، محقق و استاد برجستهٔ دانشگاه که هیچ سخن بدون سندی از وی دیده نشده است، می‌نویسد؛ فضولی اصلاً کُرد بوده است. (رک زبان و ادب فارسی در قلمرو عثمانی، د. محمدامین ریاحی، ص ١٨٦) چون در عراق عرب متولد و در بغداد متوطن بوده، به بغدادی مشهور شده است. در حله تحصیل کرده و بر کیش شیعی دوازده امامی بوده است.

پادشاهان و صدر اعظم ایران و عثمانی را در اشعار خود مدح گفته است، سالانه از جانب باب عالی مستمری معین داشت، سرانجام به سال **۹٦۳** به بیماری طاعون درگذشت.

وی مانند «خطایی؛ شاه اسماعیل صفوی» از بنیان‌گذاران ادب منظوم ترکی آذری است و مانند او کار اساسی‌اش آن است که وزن‌ها، قالب‌ها، ترکیب‌ها، مضمون‌ها و معنی‌های شعر فارسی را از راه ترجمه یا به عین عبارت در ترکی به کار برده و با این استفاده از ادب فارسی شعر نوزاد ترکی را حیات بخشیده است.

### آثار فضولی

دیوان اشعار به فارسی شامل قصیده، غزل، قطعه، رباعی و یک ساقی‌نامه به نام هفت جام، دیوان اشعار ترکی، شامل قصیده و غزل و مثنوی لیلی و مجنون، شاه و گدا، بنگ و باده (به‌نام شاه اسمعیل در **۳۵۰** بیت) و... کتاب روضـۀالشهدای ملاحسین کاشفی را به زبان ترکی ترجمه کرد و حدیقه‌السعداء نامید. رساله ای به نام لطائف‌المعارف یا سفرنامهٔ روح دارد که مناظره‌ای است میان روح و عشق، رساله‌ای به نظم و نثر به اسم «رند و زاهد» پرداخته که به سال **۱۲۷۵** هجری قمری در تهران چاپ شد. فضولی به عربی هم شعر می‌گفت و دیوانی بدان زبان دارد.

جلد اول دیوان ترکی محمد فضولی به اهتمام میرصالح حسینی در تهران

انتشار یافته است.

غزلی که جناب خالص تخمیس نموده در دیوان فضولی صفحهٔ (۱۵۸) این گونه آمده است؛

**حسنون اولدوقجا فزون عشق اهلی آرتیق زار اولور**
**حســن نه‌مقدار اولــورسا، عشــق اُول مقدار اولور**
**جنّت ایچـــون منع ائدن عـــاشق‌لری دیــداردن**
**بیلمه‌میش کیم جنتی عاشــق لزاجی، دیدار اولور**
**عشق دردیـــن‌دن اولـــور عاشق مزاجی مستقیم**
**عـــاشقین دردینه درمــان ائتســه‌لر، بیمار اولور**
**زاهـــد بیخود نه بیلسین ذوقــونو عشق اهلی‌نین**
**بیــر عجب می‌دیر محبت‌کیم، ایچن هشــیار اولور**
**عشق سوداسینه صرف ایلَر «فضـــولی» عمرونو،**
**بیلمه‌زَم بو خــوابِ غفــلت دن، قاچان[1] بیدار اولور**

(دیوان ترکی فضولی، تهیه و تدوین میرصالح حسینی، ج اول، ص ۱۵۸)

فزوولی بەغدادی:

محەمەد کوڕی سولێمانی بەغدادی، نازناوی فزوولی بووە. لە شاعیرانی فارسیبێژ و تورکیبێژی سەدەی دەیەمی کۆچییە. خوالێخۆشبوو دکتۆر محەمەد ئەمینی ریاحی، لێکۆڵەر و مامۆستای ناوداری زانستگە، کە هیچ وتەیێکی بێ بەڵگەی باوەڕپێکراوی لێنەبیستراوە، دەنووسێ؛ فزوولی لە بنەڕەتەوە کورد بووە (بڕوانە، زبان و ادب فارسی در قلمرو عثمانی، د. محمدامین ریاحی، ص ۱۸٦)، چونکە لە عێراقی عەرەب لە دایک بووە و لە بەغداد ژیاوە بە بەغدادی ناوبانگی دەرکردووە، لە شاری "حله" خوێندوویەتی، مەزهەبی شێعەی دەوازدە ئیمامی بووە.

لە شیعرەکانیدا وەسف و مەدحی پادشاکان و سەدری ئەعزەمی ئێران و عوسمانی کردووە و ساڵانە لە لایەن بابی عالییەوە جیرە و مووچەی دابینکراوی هەبووە، تا لە

---

۱ . هاچاق

ساڵی **٩٦٣** کۆچیدا بە نەخۆشینی تاعوون ماڵئاویی لە دونیا کردووە.

فزوولی لە ئەدەبی تورکیدا هەروەک شا ئیسماعیلی سەفەوی لە بناغەدانەرانی ئەدەبی مەنزوومی تورکیی ئازەریە و هەر وەک ئەو، کارە بنەماییەکەی ئەوەیە کە کێش و قاڵب و تەرکیب و مەزموونەکان و ماناکانی شیعری فارسی لە ڕێگەی تەرجەمە و وەرگێڕان، یان بە عەینی عیبارەت لە زمانی تورکیدا بە کار دەبا و بەم شێوە سوودبردنە لە ئەدەبی فارسی، شیعری کۆرپە و ساوای تورکی پەروەردە دەکات.

نووسراوەکانی فزوولی

دیوانی شیعرەکانی بە فارسی قەسیدە، غەزەل، قیتعە، چوارینە و ساقینامەیێک بە ناوی **"هەفت جام"** لە خۆ دەگرێ، دیوانی شیعرە تورکیەکانیشی بریتییە لە قەسیدە و غەزەل و مەسنەویی لەیلی و مەجنوون، شاهـ و گەدا، بەنگ و بادە. ئەم مەسنەوییە، کە لە کۆتاییدا هاتووە بە ناوی شا ئیسماعیلە وە وتوویە و سێسەد و پەنجا دێڕە ـ و... هەروەها کتێبی (ڕەوزەتولشوهەدای مەلا حوسێنیی کاشفی) کە فزوولی کردوویە بە تورکی و ناوی (حەدیقەتولسوعەدای) لەسەر داناوە، هەروەها ریسالەی (لە تائیفولم عارف) یان سەفەری ڕۆح کە مونازەرە و موقابەلەی نێوان ڕۆح و عیشقە، ریسالەیەک بە شیعر و پەخشان بە نێوی "ڕەند و زاهید" کە ساڵی **١٢٧٥** کۆچی لە تاران چاپ بووە.

بەرگی یەکەمی دیوانی تورکیی شیعرەکانی بەتێکۆشانی میرساڵحی حوسێنیی لە تاران چاپ کراوە.

فزوولی کتێبی شیعری عەرەبیشی هەیە. ئەو غەزەلە کە حەزرەتی «خالص» کردوویە بە پێنجخشتەکی لە دیوانی فزوولی لاپەڕەی (١٥٨) دا هاتووە.

کە دەقی ئەو شیعرانەم لە بەشە فارسیەکەدا هێناوە.

## شرح فارسی و کردی تخمیس غزل فضولی
## به ترکی سرودهٔ حضرت خالص ۱

شەرحی فارسی و کوردیی پێنجخشتەکیی غەزەلی فزوولی
به تورکی هەڵبەستی حەزرەتی خالص ۱

آتش عشقک فروزان اولسه عشاق نار اولور...
اگر آتش عشق تو شعله ور شود، عاشق [تبدیل به] آتش می‌شود
گر به خود آیی به خدایی رسی. در این مخمس سخن از چون خدا شدن است. اگر خداوند بخواهد. «اگر» واژهٔ قابل تأمل است. در مصرع دوم شهود موجب بیداری است. چشم که در شرح‌های پیشین گفتیم، نسبت صفت بینایی حق است که با شهود به انسان منتقل می‌شود و بینایی، بینایی باطنی است و...

دەڵێن ئەگەر بە خۆتدا بچیتەوە، بە خودا دەگەی. لەم پێنجخشتەکییەدا مەبەست لە چۆنیەتیی وەک خودابوونی بەشەرە، بە تەئکید لەسەر وشەی "ئەگەر" کە ئەگەر خوداوەند بیەوێ. لە دێڕی دووەمدا شوهوود دەبێ بەهۆی خەبەربوونەوە، چاو کە لە شەرحەکانی پێشوودا ئاماژەمان پێ کرد و گوتمان نیسبەتی بینایی هی حەقە، کە بە ئەزموونی شوهوود دەدرێتە مرۆڤ و بینایی، بینایی باتنییە و...

جلوهٔ حسنن کورر عاشق در و دیواردن...
جلوهٔ حسن تو را عاشق از در و دیوار می‌بیند...
در چند جای دیگر از شرح اشعار این مفهوم را توضیح دادیم که تحت تأثیر هاتف اصفهانی جناب خالص فرموده است و بیت مشهور هاتف که از شاعران وحدت وجودی است، این است؛

**جلوهٔ یار از در و دیوار      در تجلی است یا اولی‌الابصار**

لە چەندین جێگەی ئەم شەرحەدا ناوەرۆکی ئەم مەزموونەم ڕوون کردووەتەوە، کە حەزرەتی خالص ئەم وتەیە لە ژێر کاریگەریی هاتفی ئیسفەهانی شاعیری وەحدەتی وجوودیدا هۆنیوەتەوە، کە دەڵێ:

جیلوەی یار لە دەر و دیوارەوە، تەجەلای هەیە، ئەی ئەوانەی چاوتان هەیە و

دەبینن
که ئەم بەشە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئاگاداری لەم بارەیەوە واتە وەحدەتی وجوود...

بیلممش واعظ نه مظهردن اولور عشق آهلنک...
واعظ نمی‌دانست که اهل عشق از کدام مظهر طلوع می‌کنند و برمی‌آیند...
عشق: رک شرح‌های پیشین، مظهر: رک شرح‌های پیشین، ذوق: رک شرح‌های پیشین
در این بند از عام "مردم" که در بند دوم بود به "خاص" واعظ برمی‌گردد که او را مایهٔ گمراهی عام می‌داند و فرق ادیان را بیهوده می‌داند و واعظ را که به جای خدا، خود را می‌بیند، هشدار می‌دهد و به هشیاری می‌خواند. شراب: رک شرح‌های پیشین
عیشق: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو، مەزهەر: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو، زەوق: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو
لەم بەشەدا لە عامەوە واتە خەڵک دەگەڕێتەوە بۆ خاس، واتە واعیز کە بووە بە هۆی گومڕایی خەڵک. عارف جیاوازیی دینەکان بەبێ بنەما دادەنێ و دەڵێ واعیز خۆی دەبینێ و خودا نابینێ (بۆ بەرژەوندیی خۆی تێدەکۆشێ) و شاعیر ئاگاداری دەدا بە خەڵک کە هوشیار ببنەوە. شەراب: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو

عشق علمندن اولور اسراردن عاشق فهیم...
عاشق به واسطهٔ دانش عشق، به اسرار پی می‌برد...
دانش عشق، درد عشق، درمان عشق، امری ویژه و غیرظاهری است و دانایی خاص خود را می‌خواهد. آموزش ندارد، شهودی است نه کسبی، درسی نیست، در سینه است.
زانستی عیشق ، دەردی عیشق ، دەرمانی عیشق ، ئەمرێکی تایبەتە، کە ئاشکرا و زاهیری نییە و زانستی خۆی دەبێ، فێرکردنی نییە، شوهوودیە و کەسبی نییە، دەرسی نییە، لە سنگدایە.

عاشق رسوا چکر سودای عشقک جورینی...
عاشق رسوا جور سودای عشق را می‌کشد...

عشق و رسوایی دو واژۀ آمیخته‌اند، زیرا عامۀ مردم که اکثریت هستند و تحت تأثیر سخن زاهد و واعظ هستند، هر چه خلاف سخن آنان باشد و به آن عمل شود موجب رسوایی می‌دانند. عارفان عالم و شاعران عارف چون شمس، مولانا، حافظ، ابن عربی، ابن فارض و... همواره علم را قربانی عشق کرده‌اند و رسوایی برای خدا را به جان خریدند که جناب خالص نیز در تکمیل سخن فضولی به همین راه رفته‌اند.

عیشق و ریسوایی دووو وشەی تێکەڵاون، چونکە خەڵک کە زۆرترینی کۆمەڵگا دەگرنەوە، لە ژێر کاریگەریی وتەی زاهید و واعیزدان و هەرچی بە پێچەوانەی وتەی ئەوان بێ و عەمەڵی پێ بکرێ، بە هۆی ریسوایی دەزانن. عارفانی عالم و شاعیرانی عارف وەک؛ شەمس، مەولانا، حافز، ئیبنی عەرەبی، ئیبنی فارز و... بەردەوام عیلمی خۆیان بە قوربانی عیشق کردووە و ریسوایی بۆ گەیشتن بە خودایان بە گیان کڕیوە، کە حەزرەتی خالص لە تەواوکردنی وتەی فزوولیدا بەم ڕێگایەدا چووە.

(۳)

بـــویلــه مخمــورم، کــه بیلمم بــاده حمـــرا ندر
جــــان نــدر، کنـــدیم نه یــم، ابداع ماانشــا ندر
تاکــه مدهــوش اولمشــم بــن بیلمزم اخــری[۱] ندر
«بــویله سرمســتم که ادراک ایتمزم دنیـــا نــدر
بــن کیمم، ســاقی اولان کیمدر، مــی صهبا ندر؟»

مـــرغ روحـــــه، زلف لیـــلادن سینه، دام ایسترم
چشم مستکــدن صفای قلب ایجون، جام[۲] ایسترم
بیلمیزم مـــــن گـــاممی، گــر طبعمی رام ایسترم
«گرچــه جانانــدن دل شــیدا ایچون کام ایســترم
صورت جــــان بیلمــزم کـــام دل شــیدا ندر؟»

عشــقـــدن مســتظهر ایلر عاشــقه، فکر وصــال
فــرق قلمــز صدمــت و عــز[۳] و جمال ایلــه، جلال
عـــاشــق شـیـــدایه[٤] بکدر لذت هجــر وصــال
«وصلدن، چون عاشــقی[٥] مســتغنی ایلر بر خیال،
عـــاشقه، معشــوقدن، هر دم بو اســتغنــا ندر؟»

وحدت ایچره، کسرت و دارلیک ورن، عارف دکل[٦]
لـــذت جناب[۷] ایچون طاعت قلن عـــارف دکــل[۸]
علــم حـــکمتله ریــاضتلی اولان عـــارف دکــل[۹]
«حکمــت دنیــا و مافیهــا بلــن عــارف دکل[۱۰]
عـــــارف اولــدر بلمیــه دنیــا و مافیهــا نــدر»

---

۱ . (یاء) ممدوده: اخرا
۲ . جان
۳ . شد (زاء) ایله
٤ . شیدای
٥ . عاشقه
٦ . وکل
۷ . جنان
۸ . وکل
۹ . وکل
۱۰ وکل

خالصا! صیت فغانک حلولدربدر عالمی
ناله دلسوز زارم و تروبدر عالمی
آتش آهم سراسر یاندربدر عالمی
«آه و افغانک «فضولی»! اینجدربدر عالمی
گر بلای عشقده خوشنود ایسک، غوغا ندر؟»

## (٣)

## تەخمیسی غەزەلی «فزوولی»

وەهــا سەرخۆشم کە نــازانم مــەیی سوور چییە
گیان چییە، خۆم چیم، نوێکـاری لە نووسیندا[١] چییە
لـەوەتی لەسەر خۆم چـووم، نـازانم قیامەت چییە
«وەهــا سەرخــۆشــم کــە تێناگــەم دنیـا چییـە
مــن کێم، ئـەوی بۆتە سـاقی کێیە، شـەرابی سـوور چییە»
لـە زوڵـفـی لـەیـلا، داوێـکـم بـۆ بـاڵـنـدەی ڕۆحـم دەوێـت
لـە چـاوی مەستیشت، بـۆ سـەفـای دڵ، گـیـانم دەوێـت
من نازانم، تێناگەم [ئەوانە چین] ئەگەر تەبعی خۆم بە دەستەمۆیی دەوێت
«گـەرچی بۆ دڵی شـەیدام کـامـەرانی لە گیانان دەخـوازم،
بەڵام نازانم ڕوخسـاری گیان چییە و کامی دڵی شەیدا چییە»
بیری پێکگـەیشتن عاشق بـە عیشق پشتگەرم دەکـات
جیاوازی لە نێوان زیان[٢] و گەورەیی و جەمال و جەلال دانانێت
عاشقی شەیـدا خـۆشیی دووری [و] وەسڵ هـەر یـەکن
«لەبەر ئەوەی تـاقە خـەیالێکیش عاشق لە وەسڵ بێنیـاز دەکات
هـەردەم ئەم بێ نیـازییەی گـراویی بۆ عاشق ئیتر چییە؟»
ئەوەی وا لە یەکتاییدا کیسرەت و تەنگی دەبەخشێت، عارف نییە
ئەوەی وا بۆ چێـژی بـەهەشت تـاعەت دەکـات، عـارف نییە
ئەوەی وا بە زانستی فـەلسەفەوە ڕیازەت دەکێشێت، عـارف نییە
«ئەوەی وا حیکمەتی دنیا و شـتی دنیایی دەزانێت، عارف نییە
عـارف ئەوەیـە وا نـەزانێـت دنیا و شـتی دنیایی چین»

---

١ . «ابداع ماانشا»

٢ . لە دەقەکەدا صد مست نووسراوە، من پێم هەڵەیە لە بەر کێشی شیعرەکە و واتای ڕستەکەش. جا بە : صدمت واتە سەدەمە و زیانم خوێندەوە.

ئەی «خالص»! بانگەوازی هاوارت عالەمی حلول وبدر[؟]
نـــاڵەی دڵسووتێنەری لاوازم عالەمی وتـــرو بدر[؟]
ئاگری ئاهی مـــن سەرانسەر عالەمی ئاگر تێبەرداوە
«ئـــەی فـــزوولی»! ئـاخ و داخــــــی تـۆ عالەمی ئـــازار داوە
ئەگەر بە بەڵای عیشق شادمان بی، ئەو داد و هاوارەت لە چییە؟»

## شرح فارسی و کردی تخمیس غزل فضولی
## به ترکی سرودهٔ حضرت خالص ۲

شەرحی فارسی و کوردیی پێنجخشتەکیی غەزەلی فزوولی
به تورکی هەڵبەستی حەزرەتی خالص ۲

غزل فضولی که حضرت خالص آن را تخمیس کرده است، در صفحهٔ ۱٦٥ دیوان فضولی این گونه آمده است:

غەزەلەکەی فزوولی کە حەزرەتی خالص کردوویە بە پێنجخشتەکی لە لاپەڕەی ۱٦٥ دیوانەکەی فزوولیدا بەم شێوەیە هاتووە:

**ئویله[1] سرمستم کی ادراک ائتمەزم دنیـا نەدیر**
**من کیمَم، ساقی اولان کیم دیر، می و صهبا نەدیر**
**گرچه جانان دان دلِ شیدا ایچون کام ایستەرَم**
**سورسا جـانان بیلمەزَم کــامِ دل شیـدا نەدیر**
**وصلدن چون عاشقی مستغنی ایلر بیر وصـال**
**عــاشقه معشوقدن هر دم بو استغنـا نـەدیر؟**
**حکمــتِ دنیــا و مــافیها بیلَن عارف دئیل،**
**عــارف اُول دور بیلمەیه دنیــا و مافیهــا نەدیر**
**آه و فریادین فضولی، اینجیدیب دیر عـالَمی،**
**کــربلای عشق ایله خشنودایسن، غوغـا نەدیر؟**

بویله مخمورم که بیلمم باده حمراندر
آنچنان مست و مخمورم که نمی‌دانم بادهٔ حمرا چیست!

در مرحلهٔ بقاء تمام مراحل و اسباب قرب و زمان و مکان همگی نامفهوم می‌شود و آنچه می‌ماند لذت بقا و جاودانگی است و به دایرهٔ ذات پیوستن است، زیرا آنچه در این بند شاعر از او یاد می‌کند، برای او جز سایه‌ای نیست و سایه در کنار وجود، عکسی بیش نیست.

---

۱ . اوقَدَر

له قۆناغی "بەقا" دا هەموو قۆناغەکان و ئەو سەبەبانە کە دەبن بە هۆی نزیکی لە خودا و تەنانەت زەمان و مەکان مانای نامێنیٚ و ئەوەی دەمێنێتەوە چێژی نەمری و بەقایە و پێوەندیی بە بازنەی زاتەوە هەیە، چونکە هەرچی لەم (بەشە)دا شاعیر هێناویە و ناوی بردوە، سێبەری فرەتر نییە و سێبەر لە پاڵ وجووددا، وێنەیەکی بیٚبایەخە.

مرغ روحه زلف لیلادن سینەدام ایسترم

از زلف لیلا دامی برای پرندۀ روحم می‌خواهم

زمانی که عارف به وصال می‌رسد درصدد است هر چه زودتر قفس جسم را بشکند و پردۀ خود را از میان بردارد تا به خدا برسد. سخن این بند نیز همین است.

ئەو کات کە عارف بە ویسال دەگا بۆ ئەوە دەگەڕیٚ کە بە زووترین کات قەفەس و زیندانی جەستە بشکێنیٚ، پەردەی لەش لادا و بە خودا بگا، وتەی ئەم بەشە ئەم ئاوات و راستیە دەردەخا.

عشقدن مستظهر ایلر عاشقه فکر وصال...

فکر وصال عاشق را به عشق مستظهر و امیدوار می‌کند

امید سالک تا وصال نهایی، عشق به خداوند و جاذبۀ عشق است، زیرا تمام پله ها را پشت سر گذاشته و دیگر از خط صفات هم عبور کرده است و در آنجا ضدّ را نمی‌بیند، هر چه هست یکرنگی و یگانگی است، اما نیاز همچنان باقی است.

هیوای سالیک تا گەیشتن بە ویسالی کۆتایی، عیشق بە خوداوەندە و بەرەوخۆکێشانی عیشق، لەبەر ئەوەی هەموو قۆناغەکانی تیٚپەڕاندوە تەنانەت لە خەتی سیفاتیش تێپەڕیوە لەو پلەیەدا هیچ دژ و ناتەبایەک نابینیٚ، هەرچی هەیە یەکڕەنگی و یەکدەنگییە، بەڵام نیازی سالیک هەرماوەتەوە.

وحدت ایچره کسرت و دارلیکورن عارف دکل...

آنکه در وحدت، کثرت و دنیایی می‌بخشد، عارف نیست...

اشاره به سخن "رابعۀ عدویه" که گفت؛ آن که خدا را برای بهشت عبادت

می‌کند، مزدور است، آن که از ترس جهنم عبادت می‌کند، ترسو است. عارف آن است که خدا را برای خدا عبادت می‌کند. سخن این بند همین است.

ئاماژەیە بە وتەی رابیعەی عەدەویە، کە گوتوویەتی "ئەوەی خوداوەندی بەهەشت دەپەرستی، بە کرێگیراوە، ئەوەی وا لە ترسی جەهەننەم عیبادەت دەکا، ترسنۆکە. عارف ئەوەیە کە خودا بۆ خاتری عیشقی خودا عیبادەت بکا و پەیامی ئەم بەشە ئەمەیە.

خالصا صیت فغانک حلولدر بدر عالمی...

ای خالص آوازهٔ فغان تو عالمی را (؟)...

همان طور که در شرح حال فضولی گفتیم، او سخن عارفان و مضمون شعرای فارسی‌زبان را به ترکی برمی‌گردانده است و این بند به تأثیر سخن مولانا رومی است که می‌فرماید:

**اگــــر تو یار نداری چرا طلب نکنی   اگر به یار رسیدی چرا طرب نکنی...**

**شب وجود ترا در کمین چنان ماهیست   چرا دعا و مناجات نیمه شب نکنی...**

(دیوان شمس، ج ٦، ص ٢٧٠)

سروده شده است و جناب خالص ان را تکمیل کرده است.

هەروەها کە لە شەرحی ژیانی فزوولیدا گوتومانە، فزوولی وتەی عارفان و مەزموونی شیعری شاعیرە فارسەکانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تورکی و ئەم بەشە لە کۆتایی پێنجخشتەکییەکە لە ژێر کاریگەریی مەولانای رۆمی دایە، کە مەولانا دەڵێ:

ئەگەر تۆ یارت نییە، بۆچی ناڕۆی بە شوێنیدا

ئەگەر بە یار گەیشتووی، بۆچی سەرخۆشی و مەستی ناکەی

تاریکیی شەو وەک مانگ لە مەکۆگایە بۆ تەمەنی تۆ

لە شەوی وجوددا مانگێکی وەها بۆ تۆ لە بۆسەدایە

بۆچی دوعاو موناجاتی نیوەشەوانە ناکەی...

(دیوان شمس،ج ٦،ص ٢٧٠)

و حەزرەتی خالص ئەوەی تەکمیل و تەواو کردووە.

(٤)

خیلی مدتدر غم آه ندامت بکله روز
خاندان عشقده کنج سلامت بکله روز
شام فرقتده‌در[1] شو، صبح[2] قیامت بکله روز
«نیجه یللردر سر کوی ملامت بکله روز
لشکر سلطان عرفان کز ولایت بکله روز»
بحر عشقنده کوکل امواجدن ایتمه حذر
عشقده، هر کیمسه باشدن کچمسه، بولمز ظفر
باغلرز میخانه‌ده سودای حسنکده مگر[3]
«ساکن خاک در میخانه‌کز شام و سحر
ارتفاع قدر ایچون باب سعادت بکله روز»

توضیح:[4]
راحت اولمز گیجه‌لر غمدن دل مکلوبمز
قان دوکوب صحرای غمده دیده مسکوبمز
ذوق عشق یازدن غیری دکل[5] محبوبمز
«جیفه دنیا دکل[6] کرکس گبی مطلوبمز
بر بیوک عنقالروز، قاف قناعت بکله روز»
شکر لله محرم اولدق مخزن اسراردن
روشن اولدی دیده گریانمز دیداردن
یوقو گرمز چشممز سودای عشق یاردن،
«خواب گورمز چشممز اندیشه اغیاردن
پاسبان گنج اسرارز، ولایت بکله روز»

---

١ . فرقنده

٢ . به صبح قیامت

٣ . مکر

٤ . متن چاپیدا گلان ٦ مخمسلر اوسته مخمسلردن آیریلیبو عنوان «مخمس ایضا» نان چاپ اولوبدور. اما بونلار بیر پارچه شیعردیلار.

٥ . وکل

٦ . وکل

قیس ایدوب، صحرایه سالدی[1] غیرت عشقک بزی
مست شیــــدا ایلـــمشدر شدت شوقــــک بـــزی
در ایـــدوب ذوق جهـــاندن لـــذت ذوقـــک بزی
«صــورت دیــوار ایدبــدر حیــرت عشــقک بــزی
غیر ســیر بــاغ ایــدر بز کنــج محنت بکلــه روز»
عــاشــقز انــوار حســنک مظهــر دلــده کــوروب
مســکن مــألوفمــزدن حســنکه ســیره کلــوب
طالبــان گنــج عشــقز جوهــر جانــدن کیچــوب
«کاروان راه تجریــدز، خطــر خوفــک چکــوب
گاه مجنــون، گاه بــزدور یلــه نوبــت بکلــه روز»
صــائمــه زاهــد بی‌اثــر دور دیــده گریانمــز
عشــقــدن خالــی دکلــدر[2] ســینه بریانمــز
آتــش عشــق ایلــه یانمــش خاطــر نالانمــز
«صـــانمیکــز کیــم کیجه‌لــر بیهوده‌لــر افغــانمز
ملــک عشــق ایچره حصار اســتقامت بکلــه روز»
بــرق حســنکدن نگــارا! شــعله دنیایه دوشــوب[3]
شــهرت آواز عشــقک کــوه و صحرایه دوشــوب[4]
«خالص» شــیدا طـــریق عشــقده قانلــر ایچوب
«یاندیلر فرهاد و مجنون، مست جام عشق اولوب
ای «فضولی»! بـــز اولار یاتدقجه، نوبت بکله روز»

---

۱ . صالدی
۲ . وکلدر
۳ . دوثوب
٤ . دوثوب

**(٤)**

## تەخمیسی غەزەلی «فزوولی»[1]

مــاوەیەکــی زۆرە چاوەڕێــی خــەمــی ئاهــی پەشــیمــانیین
لــە خـــانــەدانی عیشــقدا چــاوەڕێــی گۆشــەی ســەلامەتین
لــە شــەوی دووریــدا درشــو؟؟ چــاوەڕوانی بەیانیــی قیامەتــین
«ســالانــێـکــی زۆرە لــەســەر کـــــۆلانی لــۆمــە چـــاوەڕوانـــین
لــە لەشکری سوڵتانی عیرفاندایـن و چــــاوەڕوانی ویلایەتین»
لــە دەریـــــای عیشــقدا خــۆ لــە شــەپۆلی کــوکل مــەپارێــزە
لە عیشــقدا، هەرکەس لەسەری خۆی نەگوزەرێت، سەرکەوتنی نابێت
مەگــەر لــە مەیخانــەدا ســەیری ســەودای جوانیــی تــۆ بکەیــن
«ئێمە شەو و ڕۆژ نیشتەجــێی بـــەر دەرگـــــای مــەیخـــانەین
بۆ بەرزبوونەوەی قەدری خۆمان چــاوەڕوانی دەرگـای بەختەوەریین»
دڵــی زەبرلێدراومان شــەوانە لە تـــــاوی خەفەت ئاســوودە نــابێت
چــاوی ئەســرینلێڕژاومان خوێــنی لێڕژاوەتــە ســەحرای خەمەوە
دڵـــــدارمــان لــە زەوقـــــی عیشــقی یـــار جیـــاواز نییــە
«وەک چـــەقـــەڵ خـــــوازیاری کـــەلاکی دنـیا نین
ئێمە عەنقایەکی گــەورەیــن و سەیری قـافی قەناعەت دەکەین»
ســوپاس بۆ خودا کــە بووین بــە مەحرەمی خەزێنــەی نهێنییەکان
چـــــاوی گریــانمــان بــە دیـدار ڕوونــاک بــــووەوە
لەبــەر ســەودای عیشــقی یــار خــەو ناچێتــە چاومانــەوە
«خـــەو[2]، لەبەر ئەندێشەی بێگـــانە نـــاچێتە چـــاومانەوە
ســەیــری پـاســەوانی گــەنجــی نهێنییەکانی ویــلایــەت دەکــەیــن»
غەیــرەتی عیشــقت ئێمەی کــردە «قەیس» و خســتینیە ســەحرا

---

١ . ئەم پێنجخشتەکییە لە هەشت بەش پێک هاتوە؛ بەڵام دەقی چاپی، دوو بەشیانی بە جوێ و بەشەکەی دیکەشی بە جوێ چاپ کردوە. لە تەرجەمەی عەرەبی دوکتور موکەڕەم تاڵەبانیدا هەر هەشتیان بەدوای یەکدا چاپ کراون کە شێوازێکی ڕاستە و منیش هەر وام کردوە.

٢ . لێرەدا کەڵک لە وشەی «خواب»ی فارسی وەرگیراوە

تـــــەوژمـــی شـــەوقت ســـەرخـــــۆش و شـــەیـدای کـــــردیـــن
چێـــــژی زەوقــت ئێمـــەی لـــە زەوقی جیهـــــان دوور خســـتـــەوە
«سەرلێشێواویی عیشقت ئێمـــەی کـــردۆتە وێنـــەی سەر دیــــوار
خەڵکی غەیرە، سەیری باغ دەکەن، ئێمە سەیری قوژبنی ئازار دەکەین»
ئێمـــــەی عاشـــق نـــــووری جـــوانیی تۆمان خســـتۆتە تـــوێی دڵەوە
لە شـــوێنی خـــووپێگرتووی خـۆمانەوە هاتووینەتە ســـەیری جوانیت
ئەوانەی خوازیاری گەنجی عیشقی تۆن، لە گەوهەری گیان گوزەراون
«ئێمە کـــاروانی ڕێگەی تـــەجـــریدین و تـــرسی مـــــەترسیمـــان کێشاوە
هەندێک جار مەجنوون و هەندێک جاریش منم کە کێشک دەکێشین»
ئـــەی زاهیـــد! وامەزانـــە چـــاوی بەگریـــانی ئێمـــە بێئەســـەر بێــت
ســـنگـــی بـــریـــــانی ئێمـــــە لـــە عیشـــق خـــــاڵـــی نییـــە
خــــاتـــری بـــە ناڵـــە و هـــاواری ئێمـــە بە ئاگری عیشـــق ســـووتاوە
«وامــــەزانـــە کـــــە هـــــاواری شەوانەمـــــان بـــێ ســــوودە
لە مڵکی عیشقەوە سەیری حەوش و حەساری خۆڕاگری دەکەین»
ئـــەی دڵـــــــدار! پڕشـــنـــگی جـــــوانیـــی تـــۆ دنیـــای پڕ کـــردووە
نـــاوبانگـــی ئـــاوازی جـــــوانیـــت کـــەوتۆتـــە کێـــو و ســـەحـــراوە
«خالـــص» ی شـــەیدا لە ڕێگـــەی عیشـــقدا خوێنی زۆری خـــواردوە
«فــــەرهاد و مــــەجنوون سووتـــان و سەرخـــۆشی جـــامی عیشق بوون
ئەی «فزوولی»! کاتێ ئەوان سووتان، ئیتر چاوەڕوانی نۆبەی خۆمان دەبین»

## شرح فارسی و کردی تخمیس غزل فضولی
## سرودۀ حضرت خالص ۳

شەرحی فارسی و کوردیی پێنجخشتەکیی غەزەلی فزوولی
هەڵبەستی حەزرەتی خالص ۳

این غزل فضولی که حضرت خالص تخمیس فرموده‌اند، در دیوان فضولی صفحۀ ۱۷۵ به شرح زیر آمده است:

ئەم غەزەلەی فزوولی کە حەزرەتی خالص کردوویە بە پێنجخشتەکی لە دیوانی فزوولی بەم شێوەیە هاتووە:

**نئچه ییل لردیر[۱] سر کوی ملامت بکلریز[۲]**
**لشکرِ سلطان عرفا نیز[۳] ولایت بکریز**
**ساکنِ خاکِ درِ میخانه‌ییز[٤] شام و سحر**
**ارتفاعِ قدْرایچون بابِ سعادت بکلریز**
**جیفۀ دنیا دئیل کرکس کیمی مطلوبیمیز**
**بیر بؤلوک عنقالریز، قاف قناعتْ بکلریز**
**خواب گؤرمز چشمیمیز اندیشۀ اغیاردن،**
**پاسبانِ گنجِ اسراریز،[٥] محبتْ بکلریز**
**صورتِ دیوارائدیب دیر حیرتِ عشقین بیزی،**
**غیر سیرِ باغ ائدیب، بیز کُنجِ محنتْ بکریز**
**کاروان راه تجریدیز،[٦] خطرْ خوفین چکیب،**
**گاه مجنون گا منْ دور ایچره نوبت بکریز**

۱ . ایل لردیر
۲ . گؤرله یەریک
۳ . عرفانیک
٤ . میخانه‌ییک
٥ . اسراریک
٦ . تجریدیک

**سانمـــانیز کیـــم گئجـــه‌لر بیهوده دیر فریادیمیز**
**ملکِ عشــق ایچـره حصـــارِ اسـتقامت بکلریز**
**یاتدی‌لار فرهاد و مجنون مستِ جامِ عشق اولوب،**
**ای «فضولــی» بیــز اولارَ یاتدیقجـا صحبــتْ بکریــز**

خیلی مدتدر غم آه ندامت بکله روز...
مدت زمانی است چشم به راه غم آه پشیمانی هستیم...
انسان عارف مدام به دنبال جواب این سؤال است که چرا به دنیا آمده است. در جرگۀ آدم وارد شدن، یعنی قبول گناه کردن و این سرنوشت انسان است که عارف همیشه پشیمان از آن است و تبرئۀ خود را در عشق جستجو می‌کند و عواقب آن را هم می‌پذیرد.

عارف بەردەوام بە شوێن وەڵامی ئەم پرسیارەوەیە، کە بۆچی هاتووەتە دنیاوە، چونکە چوونە ناو ریزی بەنی ئادەم یانی قەبووڵی گوناهـ و ئینسانی عارف بەردەوام بۆ چارەنووسی خۆی پەشیمانە و بۆ خەلاسی و خاوێنیی خۆی بە هۆی عیشقەوە دەگەڕێ و چەرمەسەریشی قەبووڵ دەکات.

بحر عشقنده کوکل امواجدان ایتمه حذر...
در دریای عشق از امواج [ویرانگر]حذر مکن
جز عشق، راه دیگری برای نجات نیست. جهان ظاهر و باطن با عشق به بهره می‌رسد.
به قول حافظ؛
**گـــــر مریـد راه عشــقی فکـر بــــدنامی مکن**
**شــیخ صنعــان خرقــه رهــن خانۀ خمــار داشــت...**
جگە لە عیشق، ڕێگەیێکی‌تر بۆ رزگاربوونی مرۆڤ نییە، جیهانی زاهیر و باتن بە هۆی عیشقەوە بە ئاکام دەگا.
بە وتەی حافزیش؛
ئەگەر موریدی ڕێگەی عیشقی ، بیر لە بەدناوی و ریسوایی مەکەوە

شێخی سەنعان خەرقەی تەریقەتی لە بارمتەی شەرابدا لەماڵی مەیفرۆش دانا.

راحت اولمز گیجه‌لر غمدن دل مکلویمز...
دل"ویران" شبانه از غم آسوده نمی‌شود...
این بند بر پایۀ قناعت می‌گردد. شاه نعمت‌الله می‌گوید: اصل چهارم قناعت است و قانع آن است که از شهوات نفسانیه و تمتعات حیوانیه پیراسته و وارسته باشد.
ئەم بەشە لەسەر "قەناعەت" ـەە، شانیعمەتوڵـڵا دەڵێ: بنەمای چوارەم قەناعەتە و قانیع ئەوەیە، کە بەردەوام لە شەهەواتی نەفسانی و چێژەکانی حەیوانی دوور بێ.

شکر لله محرم اولدق مخزن اسرار دن...
سپاس خداوند را که محرم مخزن اسرار شدیم...
گردش این بند بر عالم شهود و بقاست که عارف از خودرسته سلوک به دیدار حق و درک جمال او می‌گذراند.
ئەم بەشە بە دەوری عالەمی بەقا و شوهووددا دەخولێتەوە، کە عارفی لە خۆ رزگار رۆزگاری خۆی بە شوهوود و دیداری حەق ڕادەبوێرێ.
قیس ایدوب صحرایه صالدی غیرت عشقک بزی...
غیرت عشق تو ما را (قیس) کرد و به صحرا افکند...
غیرت: رک شرح‌های پیشین
بیت پایانی را فضولی از سعدی گرفته است که می‌فرماید؛

**تنگ چشـمان نظر به میوه کنند   مـا تماشـاکنان بسـتانیم**
**تـو به سـیمای شـخص می‌نگری   مـا در آثارِ صُنـع حیرانیم**

غەیرەت: بڕوانە شەرحەکانی پێشوو
ئەم دێڕە شیعرەی کۆتاییە، فزوولی لە سەعدیی وەری گرتوە؛ کە دەڵێ:
بەرچاوتەنگان ، بۆ میوەی باخ دەڕوانن واتە ئافرەت
وەک باخ دەزانی، بەڵام عارف سەیری سروشتی جوان دەکات کە هونەری

خوداوەندە، کە مەبەستی ڕوخساری جوانە.

تۆ دەڕوانیە سەر و سیما و ئێمە لە بەرهەمی هونەری خوداوەند سەرسوڕماوین.

عاشقز انوار حسنک مظهر دلده کوروب...

ما عشق نور زیبایی و حسن تو را به درون دل جا داده‌ایم...

عارف در نهایت هم خود را به عشق مجازی که وسیلۀ گام گذاشتن در راه رسیدن به مقصد است وام‌دار می‌داند، عشق ناکام مجازی موجب تجرید مقدماتی است. مجرد شدن، برهنه شدن از اغراض دنیوی و چیزی در ملک او نباشد و باطن او برهنه باشد از اعراض یعنی ترک دنیا و جز خدا چیزی طلب نکند و از دنیا چیزی نگیرد و برای ترک عوض نخواهد، نه در دنیا نه در عقبی، ترک دنیا برای ناچیزی دنیا و این که اطاعت خدا فوت نشود که حطام دنیا وبال اهل دنیاست. (شرح تعرف، ج ٤، ص ١٧) و حاصل این بند در این شرح است.

عارف هەموو کاتێ تەنانەت لە نیهایەتی پلەی عێرفاندا خۆی بە قەرزداری عیشقی مەجازی دەزانێ، کە بووە بە هۆی پێ لە ڕێگە دانانێ عارف و بنەمای بەئاوات گەیشتنیەتی، عیشقی ناکامی مەجازی دەبێ بە هۆی تەجریدی سەرەتایی، موجەڕەدبوون، ڕووتبوونەوە لە غەرەزەکانی دنیایی کە ساحیبی هیچ نەبێ و باتنی ڕووت بێ لە پێویستی، یانی تەرکی دونیا کردن و ئەوەی جگە لە خودا خوازیاری چی‌تر نەبێ و هیچ لە دونیا وەرنەگرێ و بۆ تەرکی دونیا تەمادار و چاوەڕوانی هیچ خەڵاتێ نەکا چ لە دونیا و چ لە عوقبا. تەرکی دونیا بکا لەبەر ئەوەی دونیا هیچ نییە و دەبێ بە هۆی لە ناوچوونی کات بۆ عیبادەتی خوداوەند، شتی دونیا وەک بار بە کۆڵی ئەهلی دونیاوەیە (شرح تعرف، ج ٤، ص ١٧) بەرهەمی ئەم بەشە شیعرە لە شەرحەکەدا هەیە.

صائمه زاهد بی‌اثردر دیدۀ گریانمز...

ای زاهد، مپندار که چشم گریان ما بی‌اثر باشد...

عبادت زاهد ظاهر و عبادت عاشق پنهان است. عاشق به رقت می‌رسد و زاهد به صعوبت و سخت‌دلی، تفاوت عمل به ظاهر تا سلوک به باطن بسیار است و عارف همواره به اهل ظاهر یادآور این سخن می‌باشد.

عیبادەتی زاهید ئاشکرایە و عیبادەتی عاشق نهێنییە، عاشق بە دڵنەرمی و مەحەببەت دەگا و زاهید بە سەختی و دڵڕەقی، جیاوازیی کردەوەی زاهیر تا سولووکی باتن زۆرە و عارف بەردەوام ئەهلی زاهیر بەم رستەیە ئاگادار دەکاتەوە.

برق حسنکدن نگارا شعلۀ دنیایە دوشوب...
نگارا درخشش شعلۀ زیبایی و حسن تو بر دنیا تابیده است...
فنا در عشق مجازی پاک همچون فناء در سلوک الی‌الله است و عارفان همواره فرهاد و مجنون را پیشرو راه رسیدن به جانان می‌دانند.
نظامی گوید:

**زهر جایی که بوی عشق برخاست　　یقین دان تربت مجنون در آنجاست**

[تربت لیلی درست‌است. نظامی داستان را اینگونه تعریف می‌کند که:
"شنیدستم که مجنون دل‌افگار چو شد از مردن لیلی خبردار
گریبان چاک زد بر آه و افغان به سوی تربت لیلی شتابان"
سپس تعریف می‌کند که سراغ قبر لیلی را ازکودکی گرفته و کودک در جواب گفته است:
"که ای مجنون ترا گر عشق بودی ز من کی این تمنارا نمودی
میان قبرها رو جستجو کن ز هر خاکی کفی بردارو بو کن
زهر خاکی که بوی عشق برخاست یقین دان تربت لیلی همان جاست" ع.ح]
و زیبایی حق است که در طبیعت و صورت و صحرا و... جلوه می‌کند و عارف خالص برای رسیدن به وصال خون می‌خورد. فرهاد و مجنون فنا می‌شوند و فضولی پیرو آنها می‌شود.
فەنا لە عیشقی مەجازیدا وەک فەنا لە سولووکی ئیلەڵـڵادایە و عارفان بەردەوام فەرهاد و مەجنوون بە پێشەنگی خۆیان بۆ گەیشتن بە دڵدار دەزانن.
نیزامی دەڵێ؛
لــــە هـــــەر شــوێنێک بــــۆنی عیشــق هـــەڵسـا

بــه یەقــین بزانــە کــە گــۆڕی مەجنــوون[1] لــە وێیە

جوانیی خوداوەندە لە سروشت و سوورەت و سەحرا و...دا دەدرەوشێتەوە و عارفی خالص بۆ گەیشتن بە ویساڵ خوێن دەخواتەوە، فەرهاد و مەجنوون بە ڕێگای عیشقدا لە ناو دەچن و "فەنا" دەبن و فزوولی بە شوێنی ئەواندا دەڕوا.

---

١. لەیلا.

وەسیەتنامەی شێخی خالص بۆ شێخ عەلی کوڕی گەورەی

پارچە شیعرەکەی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، کە باسی بابوباپیرانی خۆی دەکات
ئەم پارچە شیعرە لە شوێنێکی بەرچاوی ناو تەکیەی تاڵەبانی نووسراوە

مەرقەدی شێخ عەبدوڕەحمانی خالص لە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک

## پێرست

**پێنجخشتەکییەکان**

# The
# Ecstasy of Love

**By**
**Sheikh Abdurrahman Talabani**
**(Khâlîs)**
**The Kurdish scholar, sufi and poet**

**Forward**
**Dr Nouri Talabani**
**President of the Kurdish Academy**